# فەرهەنگی زمانەوانی
# ناوخۆش

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي

یەکەم فەرهەنگی زمانەوانی ئینگلیزی کوردیە

سەلام ناوخۆش






چاپی یەکەم

باشووری کوردستان- 2014

زنجیرەی کتێب ٥٠

فەرهەنگی زمانەوانی

# ناوخۆش

یەکەم فەرهەنگی زمانەوانی ئینگلیزی کوردیە

چاپی یەکەم

**سەلام ناوخۆش**

یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە زانکۆی سەلاحەدین

باشووری کوردستان-٢٠١٤

- ناوی کتێب : ***فەرهەنگی زمانەوانی ناوخۆش***
- ناوی نووسەر : ***سەلام ناوخۆش***
- پیت لێدان : ***نووسەر***
- دەرهێنانی هونەری ناوەوە: **جمعه صدیق کاکه**
- شوێنی چاپکردن : **چاپخانەی هێڤی**
- تیراژ:١٠٠٠ ***دانه***
- ژورەی چاپ: **یەکەم ٢٠١٤**
- نرخ : ***(٥٠٠٠) دینار***
- **لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٥١٤) ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێ دراوە.**

## تەنیا بە ناوی خوای گەورە

## پێشەکی

فەرهەنگی زمانەوانی ئینگلیزی- کوردی زۆر گرینگە ، چونکە ڕۆنکردنەوەیەك یان شرۆڤەیەك دەربارەی وشە زمانەوانیەکان دەخاتەڕوو .هەرچەندە ئەو ڕۆنکردنەوەیە تینوێیەتی وەرگر ناشکێنێت ، بەلاّم خوێنەر لە چوارچێوەی نەزانینی ڕەها دەربارەی ئەو وشەیە دەردەهێنێت و زاراوە یان وشەکەی پێدەناسێنێت .هەر ئەو بیرکردنەوەیش بوو ، بووە فاکتەرێك لە ئامادەکردنی فەرهەنگێکی زمانەوانی لە زمانی بنچینەیی ( تەنیا ئینگلیزی ) . بۆ زمانی کوردی.

**پێویستبوونی کورد لەو ڕەوشە نوێیەی کوردستان بە فەرهەنگێکی زمانەوانی بەشداریەکی بچووکی نوسەرە لە بزاڤی دەولّەتداری کورددا، چونکە کورد تاکو دەولّەتی سەربەخۆیی نەبێت لە بەهای فەرهەنگی زمانەوانی ناگات . مەبەست لەو قسانە ئەوە نییە لە حالی حازر توێژەری کورد پێویستی بە فەرهەنگی لەو جۆرە نییە ، بەلّکو فەرهەنگی لەو جۆرە هەولّدەدات دەولّەت لە مێشکی مرۆی کورد** دروستبکات.

ئینگلیزی و کوردی زانینی من پەیوەندی بە پێکهاتەی فەرهەنگەکەوە هەیە ، بە واتای ئەو تێکۆشانە مەعریفییەی من تەنها تەرخانکراوە بۆ

منتدى اقرأ الثقافي

لێکسۆلۆژیەت و گلۆسەری – مانای وشەی ئینگلیزی بە کوردی –بەڵکو ئەزموونی ٢٢ ساڵیم لە مامۆستایەتیم لە ئامادەیی و زانکۆ لەو بوارەوە هانی دام لە بەرامبەر هەندێ دیاردەی زمانەوانیەوە چەند لاپەڕەیەك بە پاڵپشتی هەندێ سەرچاوەی ڕەسەنی ئینگلیزیەوە بنووسم.

**کەواتە تایبەتی سەرەکی فەرهەنگی بەردەستان تەنها وشەی ئینگلیزی بەرانبەر وشەی کوردی نییە ،بەڵکو قسەکردنە لە سەر ئەو دیاردە زمانەوانیانە لە زمانی ئینگلیزی و زمانی کوردی بۆ ئەوەی خوێنەری وێنەیەکی روون و ئاشکرا و پوختی دەربارەی زاراوەکە یان قوتابخانەکە هەبێت.**

هیوادارم لەم کۆششە زمانەوانیە تاکە کەسیە سەرکەوتوو بم هەروەها ئەو هەولەشم وەك هەولی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد و فەرهەنگی ئۆکسفۆردی یاسایی بۆ قوتابی کورد بە هەرمێن بێت. سەبارەت بە فەرهەنگەکەوە، ئەو فەرهەنگە لە سەر سیستەمی بەکارهێنانی ئەبجەدی زمانی ئینگلیزی دامەزراوە هەروەها ئەو کارە مەعریفیە کاری دەستەجەمعیە ، نەك تاکە کەسی بەلام کەمی کەسی شارەزا لە هەردوو زمان و تیۆر و قوتابخانە زمانەوانیە ئەورووپیەکان ، ناچاری کردم بە تەنیا شان بدەمە ئەو کارە سەختەوە بێگومان کاری وا سەخت بێ کەموکوڕی نییە ، بەلام هەرچۆنێك بێ شکاندنی ترسی کوردە دەربارەی قوتابخانە زمانەوانیەکانی ئەورووپا و ئەمریکا .ئەفسووس لەو چاپەدا نەمتوانی ئاماژە بە هەولی زمانەوانی موسلمان و رۆژهەلاتیەکان بکەم ، کە یەقینم هەیە پێشی رۆژئاوا لە زۆر دیاردەی زمانەوانی لە سەر ئاستی تاکە کەسی و قوتابخانەی زمانەوانی وەك قوتابخانەی بەسرا و کوفە...دواون. هەروەها لە زۆر بواردا وەك وتارێکی جیاواز

لە سەر دیاردەکە دواوم و لە هەندێکی تر بە کورتی دواوم.هیوادارم توانیبێتم تا ڕادەیەك وێنەیەکی ڕوونم دەربارەی زاراوەکە پیشاندابێت.

سەبارەت بە ناوی فەرهەنگەکە" فەرهەنگی زمانـەوانی نـاوخۆش " دەمـەوێ بڵـێم عەولەمە و کاریگەر و سایدئـیفکتی عەولەمـە وا خەریکـە وا پـەروەردەمان دەکـات شکۆی باوك لە کۆمەڵگا ون بکەین ، جا بۆ ئەوەی شکۆ و پایەی باوکی نەخوێنـەوار " ناوخۆش بەکر ناوخۆش " لە ئاشووبی عەولەمـە ون نەکـەم، هـەردەم بەرانبـەر ڕەنـج و تێکۆشانی ئەو باوکە وەفادارم ، ناوی فەرهەنگەکەم بە ناوی باوکی کۆچکردوو دەبێت و ناوی خۆم دوور دەگرم لەو پرۆسەی ناولێنانە ، چونکە ئەوەی بـۆ نەتەوەکـەم دەکـەم بـە ئەرکی خۆم دەزانم.

سەلام ناوخۆش

٢٠١٣-٥-١

# Abstract

## ئەبستراکت-کورتە-پوختە

وشەی کورتە بە زۆر واتا بەکاردێت:

١. لە کۆتایی یان سەرەتای توێژینەوەیەك بەکاردێت . ئەگەر توێژینەوەکە بە ئینگلیزی بێت ، کورتەکەی بە کوردی یان عەرەبی یان بە هەردوو زمانەکە دەبێت . پێویستە کورتە لە دەروازە جیابکرێتەوە ، کەواتە نابێت لە کورتەدا ئاماژە بە بەشەکانی توێژینەوەکە بکرێت .
کورتە تەنیا قسەکردن لە سەر ناونیشان و هۆ و گریمان و بەرجەستەکردنی گریمانەکان لە چەند خاڵێك ئاماژەی پێدەکرێت .

٢. کورتەی ڕۆمانەکە کە ڕەگەزێکی بەئارەزووی ڕۆمانەکەیە.

٣. مەعنەوی وەك پێچەوانەی کۆنکریت: ناوی مەعنەوی وەك برایەتی ، ئازادی...

٤. تەجریدی : لە هونەری تەشکیلیدا ئاماژە بە ڕێبازی تەجریدی دەکرێت.

# Academic information vs Media information

## زانیاری میدیایی و زانیاری ئەکادیمی

هەردوو زانیاری-میدیایی و ئەکادیمی- ڕەها نین لە ڕاستی و چەوتێتیدا ، بەڵکو دەکەونە قاوغی تیۆری ڕێژەییەوە .نابێ ئەوە لە بیر بکەین ،بەڵام هەر یەکە بە تەنیا شوناسی خۆی هەڵدەگرێ ، بە واتای هەروەك چۆن (تیۆر )و (زانست )لە یەك جیاوازن ، هەردووك جۆری زانیاری لە یەك جیاوازن .

## زانیاری میدیایی

وەك لە بەرایی وتمان زانیاری میدیایی لە ڕاستێتی و چەوتی ڕەها نییە ، بەڵکو ڕێژەییە .ئەو ئەدگار و سیمایە زەنێکی لای وەرگر دروستکردووە ، کە ئەو جۆرە زانیارییە یەکسەر وەرنەگرێ .دەوڵەتی دەرەوەی مەدەنیەت ، هەر مژۆڵ بووە بە کەمکردنەوەی بەهای .کەسێکی وەك موبارەك لە سەردەمی حوکمڕانیدا دەیوت :" دە کلام جرائد- ئەوەی دەگوترێ قسەی ڕۆژنامەکانە و جێگای متمانە نییە". زانیاری میدیایی زیاتر لە هەڵمەتی پڕۆپاگندە دەچێت ، نەك زانیاری دروست . جارێك ڕۆژنامەیەك بۆ ئەوەی زیاتر دانەی لێبفرۆشرێت ، تایتلی سەروتارەکەی کردە " انقلاب عسکری "، لە ڕواڵەتدا ناونیشانی وتارەکە واتای " کودەتای سەربازی " دەبەخشێت ،کەچی ناوەڕۆکی وتارەکە هیچ پەیوەندی بە کودەتاوە نییە،بەڵکو تەنیا باس لە وەرگەڕانی سەرباز دەکات لە سەر ولاغەکەی!!

ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت ، کە زانیاری میدیایی زانیاری دروستی تێدا نییە ، بەڵکو ئەو جۆرە زانیاریە تەڵخە ، تەواو جێگای متمانە نییە ، ئەوە ناهێنێ پشتی پێببەستێ و قسە هەڵنەگر بێ!

## زانیاری ئەکادیمیی

زانیاری دینی ، بە تایبەتی زانیاری قورئانی بە موتڵەقی دروستە و هەروەها بەشێکە لە زانیاری ئەکادیمیی ، چونکە کەلامی یەزدانییە و هیچ هەڵەیەك هەڵناگرێ . ئەو زانیارییە تەواو جودایە لە زانیاری ڕۆژنامەیی و بە نیازی پڕۆپاگندە نووسرابێت .نووسینی تایبەت بە یاسا ، بایۆلۆژی –کیمیایی و فیزیایی...سەلمێنراو بەشێکن لە زانیاری ئەکادیمیی .

## کورتە

زانیاری میدیایی و زانیاری ئەکادیمی تەواو لە یەکجیاوازن ! مرۆڤی ئەمڕۆ زیاتر گوێ لە بواری کۆمەڵایەتی ، ئابووری ، سیاسی ، کەلتوری لە زانیاری میدیایی دەگرن ، کەچی چاك دەزانن کە زانیاری ئەکادیمی تەواو دروستە، چونکە زانیاری ئەکادیمی لە سەر باوەڕ و لۆژیك ، زانست و توێژینەوە دامەزراوە،کەچی زانیاری میدیایی لەوانەیە دروست بێت لەوانەیە بێبنەچە بێت.

## Accent

### شێوەئاخاوتنی دەڤەریی یان عەشیەتی

ئاکسێنت و دایەلێکت دوو دیاردەی زمانەوانی سروشتین.هەرچی زمانی نەتەوەییە هەم لە شار دروستدەبێت وە هەم دیاردەیەکی دەستکردە .

ئاکسێنت بریتیە لە ئەدگار و سیمای شێوەی گۆکردن ، کە بەو شێوە گۆکردنە دەتوانین ئاماژە بە دەڤەری یان چینی کۆمەڵایەتی ئاخێو بکەین. ئاکسێنت بەشێکە لە دایەلێکتێکی دیارکراو هەروەها لە ڕووی ژمارەوە چەند ئاکسێنتێك لە نێو دایەلێکتێکدا هەن .لە نێو قسەکەرانی کرمانجی ناوەڕاست بە شێوە زاریان

دەزانین کێ سورچیە ، خۆشناوە ، دزەییە...هەروەها دەتوانین بزانین قسەکەر ڕەشۆکییە یان ڕۆشنبیرە.

هەرچی دایەلێکتە لە سنووری دەنگ و شێوەی قسەکردن دەردەچێت پەیوەندی بە ڕێزمان و دانەوشەوەیە. ئاکسێنت جیاوازەکانی ناو یەك دایەلێکت زۆر باش لە یەك دەگەن هەروەها ئاخێوەرانی نێوان دوو دایەلێکتی یەك زمان تێکدەگەن ، چونکە ئەو دیاردەی هەبوونی ئاکسێنت و دایەلێکتی لە نێو یەك زماندا سروشتییە.نوسەرانی بیانی باوەڕیان وایە کە دابەشکردنی زمان بۆ زمان و دایەلێکت پۆلێنێکی سیاسیە ! لەوانەیە ئەو ڕایە دروست بێت دیاردەی زمانی ستاندەر دیاردەیەکی پەروەردە ئامێزە و دەسکردی هزری مرۆڤە.

چونکە هەردوو دیاردەی ئاکسێنت و دایەلێکت پەیوەندی بە دەنگ و شێوە ئاخاوتنی ئاخێوەری سروشت ئامێزە دژوارە بە ئاکسێنت و دایەلێکتی تر بگۆڕدرێن.هەرچی زمانە لە شار بە زۆری لە دایك دەبێت و لە ئەنجامی هەبوونی زمانی تر لە کۆمەڵگا گۆڕانی بە سەردا دێت.

## Acoustic nerve
## دەماری بیستن

دەماری هەشتەمی بیستن کە لە مێشکەوە سەرچاوە دەگرێت هەروەها ئەو دەمارە پەیوەندی بە ناوچەی وێرنیکاوە وەیە.ئەو دەمارە هەڵدەستێت بە گوێزانەوەی دەنگ و ئاخاوتنی ئاخێوەرەوە هەروەها گومان دەبرێت ئەو دەمارە بارگاوی کرابێت بە پرانسیپەکانی زمانێکی تایبەتەوە.هەر بەو دەمارەش زمانی تایبەت دەگوازرێتەوە بۆ کەسی بەرانبەر یان گوێگر.

## Acquired language disorder
## تێکچوونی زمانیی

مەبەست لە تێکچوونی زمان یان شپرزەبوونی زمان دیاردەیەکی سروشتی نییە.ئەو لە ڕێدەرچوونە زمانیە لە ئەنجامی بریندار بوونی هەردوو دەڤەری برۆکا و وێرنیکای مێشکە، کە ئەوەی یەکەم کاریگەری لە سەر ئاخاوتنی ئاخێوەر هەیە ، ئەوەی دووەمیش کاریگەری لە سەر بیستنی ئاخێوەر هەیە یان خودی لە ڕێدەرچوونە پەیوەندی بە جۆری نەخۆشیەکەوە هەیە .ئەو دیاردە پەیوەست نییە بە درەنگ بە قسەکردنەوە یان پەیوەندی بە هەر حاڵەتێکی ناسروشتی نییە.

ئەو دیاردەیە جودایە لە ڕەوتی پەرەسەندنی زمانی ئاخێو ، چونکە ئەوە پەیوەندی بە بنیاتی ئەندامی ئاخێوەر وەیە ، کە لە منداڵیەوە تووشی بووە هەرچی تێکچوونی زمانە پەیوەندی بە ڕوداوەوە هەیە وەك دیاردەی ئەفاسیا.

## Acquisition of language
## زمانگرتن

زمانگرتن –زمان وەرگرتن لە دەوروبەر- دیاردەیەکی سروشتییە .زمان وەرگرتن لە دایك زمانی دایك لە کۆمەڵگا دروستدەکات .هەبوونی ئامێری وەرگرتنی زمان لە منداڵدا توانایەکی سەیری بە منداڵ بەخشیوە .دیراسە زمانەوانیەکان ئەوە دەردەخەن کە هەموو منداڵێکی ساغ لە تەمەنی ٦ساڵی زمانی پاراو دەبێت.زمان وەرگرتن هیچ پەیوەندی بە پرۆسەی فێرکردنی قوتابخانەییەوە.هەروەها بە ئاستی سروشتی و ڕۆشنبیری دایکەوە وەنییە ، منداڵ زمانی دایك لە دەوروبەر فێردەبێت .ئەو زمانەی منداڵ فێری دەبێت یان لە

کۆمەڵگا وەریدەگرێت لە چوارچێوەی دایەلێکت و ئاکسێنت دایە ، زمانی دەسکردی مامۆستا نییە.لە عەقڵی منداڵدا هەموو شتەکانی دەربارەی زمان ڕێساییە ، بۆیە منداڵ لە بنەڕەتدا وا حاڵی بووە کە بە زیادکردنی ئێس بۆ هەموو ناوێك دەبنە کۆ هەروەها بە ئی دی هەموو کردارێك دەبتە ڕابردوو! مامۆستا لە قوتابخانە ئەو زمان وەرگرتنە بۆ منداڵ دژوار دەکات ، ئەگەرنا خودی زمانی سروشتی لە مێشکی منداڵدا ئەوها ئاڵۆز نییە.

## Acronym

### پیتی سەرەتای دوو وشە یان زیاتر

ئەکرۆنیم ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی وشە ڕۆنان لە زمانی ئینگلیزیدا .ئەو دیاردەیە لە زمانی ئینگلیزی جۆرێکە لە کورتبڕی هەروەها ناوەندێکە بۆ دروستکردنی وشەی نوێ لە زماندا .

خودی پرۆسەکە بریتییە لە بڕینی پیتی سەرەتای وشەکان و گۆکردنی پیتەکان ، وەك

United nations , united states of America , central intelligence Agency…. دەبنە un , USA,CIA. ئەو وشە نوێیانە لە وشە ڕەسەنەکان لە لای تاکەکان باو ترن.

## Active

### بکەر دیار

جگە لە نەرێی و پرسیاری و سەرسوڕمانی ڕستە ، ڕستە لە حاڵەتی بکەر دیار و بکەر نادیار دەبێت . ئەگەر ڕستەیەك ئاکتیف ڤۆیس بێ ، بە واتای ئەوە بکەر

دیارە و ئەوە بکەرەکەیە کردارەکە ڕادەپەڕێنێت ، وەك : ئازاد پەنجەرەکەی شکاند .لەم جۆرە ڕستەیە ، جگە لە هەبوونی بکەر ، بەرکاریش بوونی هەیە هەروەها تێنس و ئاسپێکتی کردارەکە ئامادەگیان هەیە : ئازاد پەنجەرەکە دەشکێنێت . ئازاد وا پەنجەرەکە دەشکێنێت . ئازاد بەیانی پەنجەرەکە دەشکێنێت .

## Address

### ناونیشان

ناونیشان —ناونیشانی ئاخاوتن یان دەق

## Addressor

### ئاخاوتنبێژ

قسەکەر ، ئاخاوتن ئاراستەکەر.

## Addressee

### گوێگر-ئاراستەکراو

قسە لە سەر بوونی کەسێك دەکات کە ئاخاوتنی ئاراستە دەکرێت .

## Ad hoc

### بۆ ئەمە

لە وشەی لاتینی وەرگیراوە بە واتای بۆ ئەمە دێت. ئەو دەستەواژە لە شەستەکانی سەدەی بیست لە نێو نووسین هەیە بە تایبەتی نووسینی ئەکادێمی .

یاسایەکی پێشنیازکراو دەتوانرێت وەك ئەد هۆك تەماشا بکرێت ئەگەر هەندێ داتا داپۆشێت بۆیە ڕەخنەگر ئەوەندە دایە بە پەیوەست دەبینێت.

## Adjective
## ئاوەڵناو

ئاوەڵناو بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن.ئاوەڵناو لە پێکهاتەی ڕستەی ئینگلیزیدا وەسفی ناو ، ئاوەڵناوی تر دەکات .زۆربەی ئاوەڵناوەکانی ئینگلیزی دەکەونە پێش ناو و هەندێکی کەم دەکەونە پاش ناو هەرچی زمانی کوردیە بە پێچەوانەیە ، زۆری ئاوەڵناو دەکەونە پاش ناو و کەمێکی کەمیش دەکەونە پێش ناو . ئاوەلناو جۆری هەیە : ئاوەڵناوی ڕەنگ ، ئاوەڵناوی تەمەن ، ئاوەڵناوی نەتەوە ، ئاوەڵناوی بەها....لە دوایەکهاتنی ئاوەڵناوەکان پەیوەستە بە مانای ئاوەڵناوەکان.

جگە لە هەبوونی حاڵەتی ئەرێی یان بەراوردی سفر ئامێز ، ئاوەڵناو حاڵەتی بەراورد و باشترین هەیە وەك جوان جوانتر جوانترین .

## Adjective phrase
## گرێی ئاوەڵناوی

هەبوونی گرێ بە واتای هەبوونی زیاتر لە وشەیەك . گرێی ئاوەڵناوی بریتیە لەوەی کە سەرەی گرێیەکە ئاوەڵناو بێت . پێکهاتەکەشی بریتیە لە ڕادە + ئاوەڵناو ، وەك زۆر زیرەك .

# Adverb
## ئاوەڵکردار

ئاوەڵکردار بەشێکی ئاخاوتنە.لە جۆرە باوەکانی بریتیە لە ئاوەڵکرداری شوێن ، ئاوەڵکرداری کاتی ، ئاوەڵکرداری چۆنیەتی....ئاوەڵکردار وەسفی کردار دەکات لە سەرەتا و ناوەراست و کۆتایی ڕستە دێت.

# Adverb phrase
## گرێی ئاوەڵکرداری

گرێی ئاوەڵکرداری بریتیە لەوەی کە سەرەی گرێیەکە ئاوەڵکردارە . لە ڕووی پێکهاتەوەش بریتیە لە ڕادە +ئاوەڵکردار ، وەك زۆر بە جوانی ، زۆر دلێرانە......

# Affirmative
## ئەرێی

ڕستەی ئەرێی بەواتای ڕستەکە نەرێ و پرسیار و داخوازی نییە.ئەرکی سەرەکی ڕستەی ئەرێیی بریتیە لەوەی حاڵەتی ئەرێیی ڕەوشەکە پیشان دەدات.

# Affix
## گرە

گرە ئەو وشانەن مانای دروستیان نییە . ئەو وشانە لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی وشەتر دێن.ئەو گرێیانەی لە پێش ڕەگی وشە دێن پێیان دەوترێ پێشگر ،

ئەو گرەیانەی لە نێو ڕەگی وشە دێن ، پێیاندەوترێت ناوگر ، ئەوانەی لە پاش ڕەگ دێن ، پاشگر .

ئەو پێشگر و پاشگرانەی لە پێش و پاش ڕەگی وشە دێن واتای وشەکە دەگۆڕن .

## Agent and patient

### کارا و وەرگر

ئەو ڕەگەزەی ڕستەیە کە گوزارشت لە کەسێکی زیندوو ( مرۆ و گیانەوەر ) دەکات کە بەرپرسە لە کارێکی تایبەت ، وەك پشیلەکە بەدوای مشکەکە کەوت.

هەردوو فۆڕمی ئێیجینت و پەیشینت لە شرۆڤەکردنی ڕەگەزەکانی ڕستە بەکاردێن .کردار یان کار یان حاڵەتی مەسەلەکان دەخاتەڕوو .بەشداربوونی ڕستە کردار و بکەر و بەرکارن .کردار دووەکەی تر دیاردەکات : کرداری دەنوێت ، تەنیا بکەری دەوێت و بەرکاری ناوێت، چونکە کرداری دەنوێت تێنەپەڕە.بەلاّم ئەگەر لە ڕستە باسی ڕۆڵی سیمانتیکی یان سیماتیکی بکەین ناوی تر بۆ بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەکاردەهێنین، وەك

کاوە دیوارەکەی ڕوخاند .

ئازاد نامەکەی دەداتە من . ئازاد نامەکەی بۆ من دەنێرێت.

ڕۆڵی سیمانتیکی یان سیماتیکی لە سەر ئەرکی ڕێزمانی دروستدەبێت .کەواتە لە ڕستەی یەکەمدا کارا و کردار و بەرکار(وەرگر )هەیە ، بەلاّم لە ڕستەی دووەمدا کارا و وەرگر و گۆڵ(بەرکاری ناڕاستەوخۆ یان بەرکاری بە یاریدە ) و کردار هەیە.بەلاّم لە ڕستەی خوارەوە

-تۆپەکە لە سەر گردەکە غلۆربۆوە.

تۆپەکە بکەرە ، بەلاّم کارا نییە ، چونکە ناتوانێت رۆڵی سیماتیکی ببینێت.

## Agrammatism
## ئەگراماتیزم-

ئەگراماتیزم پەیوەندی بە تێکچوونی مێشکەوە هەیە .ئەو رووداوەی بە سەر مێشکەوە هاتوو ، پەیوەندی بە زمانەوە هەیە .کەواتە ئەگراماتیزم تێکچوونێکی زمانییە لە ئاکامی سڕینەوەی ئەو رەگەزانە دەبێت کە گوزارشت لە پەیوەندی رێزمانی دەکەن ، وەك پاشگرە ئینفلێکشنەکان ، ئامرازەکان ، پرپیۆزشنەکان.هەروەها پێی دەگوترێ ئاخاوتنی ئەگراماتی ، ئەو جۆرە ئاخاوتنانەش لەو کەسانە بەدەردەکەوێ کە ئازاری مێشکیان کێشتووە و تووشی ئەفاسیا بوونە .

## Agreement
## رێککەوتن- ئەگریمەنت

رێکەوتن بریتیە لەگەڵ یەك سازانی بکەر و کار ، ئاوەڵناو و ناو ، حاڵەتی کۆ لەگەڵ کۆ ، تاك لەگەڵ تاك ، زایەند لەگەڵ زایەندی وەك خۆی.لە زمانی فەرەنسیدا پێویستە هەموو بەشەکانی ئاخاوتن لەگەڵ یەك بسازێن. لە زمانی کوردیش رێکەوتن هەیە ، وەك کورەکان هاتن . پشیلە گۆشتەکەی خوارد.

## Airstream
### جۆگەی هەوا –ئێرستریم

جۆگەی هەوا یان بۆڕی هەوا سەرچاوەیەکی هێز و توانایە بۆ بەرهەم هێنانی دەنگی ئاخاوتن هەروەها پێی دەگوترێت میکانیزمی بۆڕی هەوا.زۆربەی ئاخاوتن بەوە دروست دەبێت بەوەی هەوا لە سیەکانەوە بەکاردەهێنێت.

## Allomorph
### ئەلۆمۆرف

بێ باسکردنی مۆرفیم لە ئەلۆمۆرف ناگەین ، بۆیە کە باسی مۆرفیمان کرد ، ئاماژە بە ئەلۆمۆرف دەکەین.

## Allophone
### ئەلۆفۆن

ئەلۆفۆن لە فۆنیم جیاوازە .گۆڕینی فۆنیم بە فۆنیمێکی تر ، واتا و فۆرمی وشەکە دەگۆڕێت . هەردوو دەنگی ر و ڕ فۆنیمن چونکە لە هەردوو وشەی کەر و کەڕ واتا و فۆرمی جیاواز دەدەن ، بەڵام ئەو دوو دەنگە لە زمانی ئینگلیزی ئەلۆفۆنن ، چونکە واتای وشەکان ناگۆڕن .

کەواتە ئەلۆفۆن لە نێوان دوو وشەی ئینگلیزی وەك لامی سووك و لامی قەڵەو تەنیا لە چوارچێوەی دەنگ دەرناچێت و واتای وشە ناگۆڕێت ، بەڵام ئەو دوو لامە لە زمانی کوردیدا فۆنیمن ، نەك ئەلۆفۆن.

## ئەلفبێ

ئەلفبا لە زماندا زۆر گرینگە.سێ ئەلفبا زۆر گەنگەشەی لە سەر دەکرێ :

١.ئەلفبای سریانی —عەرەبی ،

٢.ئەلفبای لاتینی،

٣.ئەلفبای سلاڤی .

هەرسێ ئەلفبا هەڵگری حاڵەتی سیاسین:

یەکەم ، ئەلفبای عەرەبی

نەتەوەی عەرەب و غەیرە عەرەبی موسلمان بە هۆی ئەو ئەلفبایەوە زمانی عەرەبی دەپارێزن ، بە بەهانەی ئەو زمانە زمانی قورئانە .ئەو ڕایە هەر بۆ فریودانی غەیرە عەرەبە : خودا لە قورئان بەڵێنی داوە ئەو قورئانە بپارێزێت .عەلمانیەتی عەرەبی دژ بە هەموو بەهایەکی ئیسلام دەوەستێتەوە لە مەسەلەی سوریا و میسرِ خۆیا بوو.

دووەم ، ئەلفبای لاتینی

تورکی عەلمانی وەك بنەمایەك بۆ کۆکردنەوەی تاکی ئیشی لە سەر دەکرد .شەش کۆمارە تورکیەکەی سۆڤیەت لە ١٩٩٠ ، تورکیا تەبەنیکردنی ئەلفبای لاتینی کردە مەرج لە پێشیان.

بۆ کورد تەبەنیکردن و داکۆکیکردن لە ئەو ئەلفبایە بەشداریکردنە لە داگیرکردنی باکووری کوردستان.ئەفسووس بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی لە باکوور هەتا ئێستا عەلمانی بووە ، بۆیە مەسەلەی ئەو ئەلفبایەی بە گرینگ وەرنەگرتووە.

سێیەم ، ئەلفبای سلاڤی

ئەو ئەلفبایە لە ناسنامەیەکی ئەرسەدۆکسی ببوە ئەلفبایە ئایدیۆلۆژی کۆمۆنیستی .ئەو ئەلفبایەش بۆ کۆکردنەوەی کۆمۆنیستەکانی کۆمارەکانی سۆڤیەت بوو.

## Ambiguity
## لێڵی

لێڵی لە تێگەیشتنی واتای دوو ڕستە دروست دەبێت ، بەڵام ئەو واتایانە بە هەبوونی دەوروبەری زمانەوانی یان نا زمانەوانی نامێنن . سێ جۆری سەرەکی لە لێڵی هەیە:

١. لێڵی لێکسیکی : کە وشەیەك ، لێکسیمێك زیاتر لە واتایەکی دەبێت ، وەك

-I saw you at bank.

لە قەراخ ڕووبارەکە دەتبینم.

لە بانق دەتبینم.

هەردوو جۆری کۆنتێکست ، یارمەتیدەر دەبن ، کە ئاخێو مەبەستی کام واتایە : قەراخ رووبار یان بانق؟

٢. لێڵی پێکهاتەیی یان سینتاکسی

پێکهاتەی ڕستەکان نەك واتای جیاوازی وشەکان ، ئەم جۆرە لێڵیە دروستدەکەن.

٣. لێڵی سکۆپی

لێڵی سکۆپی لە ئاکامی هەبوونی ڕاناو لە ڕستەکەدا دروست دەبێت ، نازانرێ ئەو ڕاناوە بکەرەکەیە یان کەسێکی دی ، وەك :

تۆم نازانیّ ئەو یاریەکە دەباتەوە.
ئەو " ئەو"ە بۆ تۆم دەگەڕێتەوە یان کەسێکی دی.
ئەگەر لێڵیەکە لە نێوان دوو ڕستە زیاتر بوو ، ئەوا لە ئینگلیزی پێی دەگوترێت vague

## Am bilingualism
## دوو زمانزانی

ئەم پرۆسەیە پەیوەستە بە قابلیەتی زمانی ناخێو ، کە دەتوانێت دوو زمان بە هەڵگرتنی کەلتورەوە دەزانێت . تەواو شارەزایە لە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی، ئینگلیزی و هیندی ، فەرەنسی و ئیسپانی.

## American Sign language
## زمانی هێمایی ئەمریکی

هەموو زمانێك بە پیت و هێڵ دەرنابڕێت.لە کۆمەڵگای بەرایی و نەخوێنەوا زمانی هێما تاکە نێوەندی لە یەکتێگەیشتنی تاکەکانی کۆمەڵگا بووە . بەلاّم زمانی هێما لە کۆمەڵگای مۆدرێندا پەیوەست نییە بە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا ، بەڵکو تەنیا پێوەستە بە کەسانی خاوەن پێویستی تایبەت .
.زمانی هێمایی ئەمریکی وەك یەکەم زمان بەکاردێت بۆ کەڕەکانی کۆمەڵگای ئەمریکی.

## Amer-ind
## ئەمریند-ئەمەریکی هیندی

جۆرێکە لە زمانی هێمایی لە لای کەسانی خاوەن پێداویستی زمانین و لە لای ماجە سکیلی نەخۆشەوانی ئاخاوتنی ئەمریکی داهێنراوە.ئەو جۆرە زمانە هێماییە لە لای خێڵی ئەمریکی و هیندی لە گۆرانی چرین پەیڕەو دەکرێت .

## American Structuralism
## قوتابخانەی بنیاتگەری ئەمەریکی

هەرچەندە هەندێ سەرچاوە سەبارەت بە هەبوونی ئەو قوتابخانە زمانەوانی و دەروونیە ، ئاماژە بە کاتی پێش بلۆمفیلد دەکەن، کەچی ئەو قوتابخانەیە لەگەڵ سەرهەڵدانی کتێبی بلۆمفیلد بە ناوی زمان لە ئەمریکا سەریهەڵدا. ئەو تێڕوانینە بۆ زمان ، چۆمسکی ناچار کرد کە دژی ئەو بزاڤە زمانەوانیە بە جواب بێت و یەکەم کتێبی زمانەوانی خۆی لە ١٩٥٧ چاپبکات .

## Analytic language
## زمانی شیکاریی

زمانەکان لە یەك جودا نەبن بە پێی پێکهاتە و مۆرفیم و سینتاکس نابنە زمانی جودا.سەرەکیترین ڕێگا بۆ پۆلێنکردنی زمانەکان بۆ گروپی جودا ، دەکرێ ئاماژە بە چەند ڕێگایەك بکەین:

١. پەیوەندی مێژوویی یان پەیوەندی جینیتیکی

ئینگلیزی و لاتینی و ڕوسی....هەموو لە یەك باوکە گەورە وەپاش کەوتوون ، یانی سەرەتا یەك زمان بوونە.

٢. پێکچوون لە پێکهاتە .ئەو جۆرە پێکچوونە لە نێوان هەندێ زماندا ، بە تایبەتی زمانە ئەسکەندنافیەکان سویدی و نەرویجی و دانیمارکی.ئەم ڕێگایە ناسراوە بە تایپۆلۆجی. باوترین تایپۆلۆجی لە سەر ڕیزبوونی وشەکان دامەزراوە.

٣. پێکهاتەی ناوەوەیی .هەندێ زمان هەن لە سەر پێکهاتەیی ناوەوەیی وشەکان دامەزراوە.زمانی وەك لاتینی و عەرەبی بە شێوەیەکن وشەکان فۆڕمەکانیان دەگۆڕن بۆ ئەوەی ئەدگارەکانی ڕێزمانی دەربخەن.بۆ نموونە ناو کۆتایی خۆیان دەگۆڕن بۆ ئەوەی حالەتی کۆ دەربڕن. ئەم جۆرە زمانە ناسراون بە سینسێتیك یان داڕێژراو.

٤. زمانی شیکاریی

زمانی وەك چینی پێکهاتەی ناوەکی کەمە یان نییە.لەو زمانە وشەکان هەمان فۆڕم و زانیاری ڕێزمانیان هەیە.ئینگلیزی ئەدگاری هەردوو جۆرە زمانی هەیە.

٥. هەندێ زمانەوان جۆرە زمانێکی تر دەناسێنن بە ناوی پۆلیسێسێتیك وەك زمانی ئەسکیمۆ و مۆهاوك.

# Anaphora

## ئەنافۆریی

پەیوەندی نێوان ڕانا و و یەکەیەکی دی لە ڕستەیەکدا پێی دەگوترێ ئەنافۆری .ئەگەر تەم ومژێك لە سەر ناسنامەی ڕاناوی دووەم هەبێت ، ئەوا لێڵی سکۆپی دروستدەبێت.

- ماری خۆی گۆڕی.
- بیل پێی خۆشە بخواتەوە ، بەلآم ئەو هەولێدا نەخواتەوە.

## Animal communication

### ئاخاوتنی ئاژەڵ

مرۆڤ تاکە مەخلوقاتە کە بە دروستی دەدوێت. زبـان و لێـو پێبەخشـین ، کـە دوو ئامێری ئۆرگانی دەربڕی ئاخاوتنن خودا بە مرۆڤی بەخشیوە .

ئاژەڵ زمانی تایبەت بە خۆیان هەیە و بە پێی قورئـان دەتـوانن هـەم لـە یـەك بگەن و هەم لە زمانی مرۆڤیش تێبگەن.بە واتای بە پێی پەیامی قورئـان زمـانی ئاژەڵ دوو سـەرەیە هەم دەتوانن لە زمانی یەکتر بگەن ( وەك هەبوونی دارسـتان ) و لە زمانی مرۆڤیش بگەن .

زمانی ئاژەڵ لە جیهـانی ئێمـەدا وەك زمـانی منـداڵ وایـە زۆربـەی وشـەکانی مەفهوم نییە هەروەها سەبارەت بە لاساییکردنەوەی زمانی مـرۆڤ دەتـوانن تـەنیا هەندێ وشە لاساییبکەنەوە بەواتای زمـانی ئـاژەل بـە زۆری لـە ڕێگـای پرۆسـەی فێربوونەوە دروستدەبێت ، زمانی تایبەت بە خۆیان تەمەن کورتە .هەندێ ئەدگار هـەن وەك قسـەکردن دەربـارەی داهـاتوو ، دەربـڕینی ئـێش و ژان ...لـە زمـانی ئاژەڵەوە دوورن.

## Anthropological linguistics

### زمانەوانی مرۆناسی

ئەو زمانەوانیە زیاتر پەیوەندی بە زمـانی خێڵـە هیندیـەکانی ئـەمریکا وەیـە هەروەها بەشێکە لە پرۆسەی بنیاتگـەری ئـەمریکی هـەروەها بەشـێکە لـە هـەر کارێکی زمانەوانی کە لە ڕوانگەی ئەنسرۆپۆلۆجی تەماشای زمان دەکات .

## Antonym
## ئەنتۆنیم-دژەواتا

بریتیە لە پەیوەندی لێکسیکی لە نێوان ئەو وشانەی پێچەوانەی یەکترن.وشە دژەکانی وەك درێژ و کورت ، بەرز و نوی بەشێکن لە پرۆسەی ئەنتۆنیمی.

## Aphasia
## ئەفاسیا

لە دەستدانی یان بریندار بوونی مێشکی مرۆڤ ، بەشی برۆکا و ویرنیکای مێشکی مرۆڤ کاریگەری لە سەر ئاخاوتن و بیستنی مرۆڤ هەیە.کەواتە بریندراربوونی ئەو شوێنانە لە مێشك ، نەخۆشیەکی مێشك-زمان دروست دەکات کە پێی دەگوترێت ئەفاسیا.

## Argument
## ئارگومێنت

هەبوونی ئارگومێنت و تێگەیشتن لێی نوسینەکەت ئەکادێمی دەکات .هەموو کردارەکان داوای ژمارەیەك ئامادەبوونی ڕەگەزی دی لە ڕستە دەکەن.ئارگومێنتەکانی کردار بە زۆری دەلالەت لە بەشداربوون لە چالاکیەك یان ڕوداوێك دەکەن ، کە لە لایەن کردارەکەوە وەسفکراون.چالاکی نووستن تەنیا یەك بەشداربوو لە خۆدەگرێت : ئەو کەسەی دەنوێت.کەواتە کرداری دەنوێت یەك ئارگومێنتی هەیە.کرداری تر ، وەك دەگەزێت ، دوو ئارگومێنتی هەیە کەواتە کردارەکە دوو ئارگومێنتی هەیەئەو دوو ئارگومێنتە بکەر و بەرکاری ڕستەن،کەچی کرداری دی هەن سێ ئارگومێنتی هەیە ، وەك

-ئازاد سێوەکەی بە شیرین دا.

ئارگومێنت دەکرێ گرێی ناویی یان گرێی ئاوەڵکرداری بن.

## Assimilation

### ئاوێتەبوونی دوو دەنگ بۆ دروستکردنی دەنگی سێیەم

ئەسیمیلەیشن بریتیە لەو پرۆسە دەنگیە کە دەنگێك هەژموونی لە سەر دەنگی هاوسێی هەیە بۆ ئەوەی هەردوو دەنگەکە بەیەك بچن.لە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و کوردی ئەسیمێلەیشن هەیە. لە un لە untruthful و unbelievable و uncomfortable سێ دەنگی جیاوازی هەیە هەروەها لە کوردیدا هەشت +دە =دەبتە هەژدە. لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا ئەو دیاردە دەنگیە هەیە : من بعد دەبێتە میمبەعد.

## Aspect

### ئاسپێکت

زمان و کات پەیوەندیەکی هۆگرانەیان هەیە.لە زمانی ئینگلیزدا تەنیا دوو دەمکات هەیە ، ئەویش ڕابردووی سادە و ڕانەبردووی سادەیە، هەرچی حاڵەتی بەردەوام و تەواو هەیە ، دەمکات نین ، بەڵکو ئاسپێکتن . لە ئەسپێکتدا ڕوداو تەواو نەبووە هێشتا لە حاڵەتی بەردەوامی دەژین و ماوە لە نێوان روداوەکاندا هەیە ، وەك

- ئەو هێشتا لە سلێمانی دەژی.

( ئەو لە ڕابردوو و هەتا حاڵەتی قسە کردن لە سلێمانی دەژین.)

- وا باوکت دەمرێت.

( هێشتا نەمردووە ، دەتوانی بە ساغی بیبینیت.)

لە هەندێ زمانی تر دژوارە خەتێکی لەیەکجیاکەرەوە لە نێوان دەمکات و ئاسپێکت بکەی ، بۆیە زمانەوانان ناچار بوونە بیرۆژکەیەکی تاك بۆ ئەو حاڵەتانە بەکاربێنن ، وەك دەمکات-ئاسپێکت.

## Auxiliary
## ئۆکزیلەری

هەبوونی ئۆکزیلەری لە زماندا بۆ پێویستبوونی دەربڕینی هەندێ حاڵەتی زمانەوانیە.لە زمانی ئینگلیزیدا چوار جۆری ئۆزیلەری هەیە:

١. بەشێکیان پێی دەوترێ مۆدەل ، ئەوانە ناتوانن لە ڕستەدا بە تەنیا بێن.
٢. ئۆگزیلەری سەرەکی .لە هەندێ حاڵەتدا دەبنە کرداری سەرەکی وەك تویی و توهاۋ.
٣. نیمچە ئۆزیلەری
٤. ئزیلەری بۆش وەك تو دو لە پرسیار و نەرێ بوونی هەیە و لە دەرەوەی ڕستە دێت.

## Auxiliary language
## زمانی دەستکرد

زمانی وەك ئیسپرانتۆ کە بۆ ئەوە داهێنراوە کە لە نێو خەڵکدا ببتە نێوەندێك بۆ ئاخاوتن بێگوێدانە زمانی ڕەسەنی خەڵکەکە.

## Avesta language
## زمانی ئاڤێستا

ئاڤێستا تایبەتە بە زەردەشت ، زمانی هەموو نەتەوە ئاری نەژادەکانە .لە دوای شەڕی ئەربێلا ، ئەسکەندەری مەکدونی بە قسەی سۆزانیەك لەگەڵ هەموو کەلتوری ئاریانی سوتاندی .ئەو ئاڤێستایەی بەر دەستە هی سەردەمی ساسانیەکانە.ئاڤێستا بە فۆرم بە ڤیدیا دەچێت.

## Azerbaijani-Azeri
## ئازەربایجان و زمانی ئازەری

ئازەربایجان نزیکە بە دەوڵەتی ئەرمینیا .زمانی ئازەری زۆر پەیوەندی بە زمانی تورکی و بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئازەربایجان و ئازەربایجانی غەربی قسەی پێدەکرێت .لە ئیران بە عەجەم ناسراون .

## پیتی ب

### Babbling ـــــــــــــ گفەگفە

پرۆسەکە بریتیە لە دەنگی ڤۆکەلی ساوا، کە بە شێوەیەکی تایبەتی بریتیە لە دووبارە دووبارەکردنەوەی بڕگەکان ( کە هیچ واتایان نییە )پێش پەرەسەندنی بۆ ئەوەی ببنە ئاخاوتنی واتا ئامێز.

### Back-formation
### ڕۆنانی پشتەوە

جۆرێکە لە ڕۆنانی وشە .ئەم پرۆسەیە بۆ دروستکردنی وشەی نوێیە لە زماندا ڕۆنانی وشەی سادە ناسراوە بە دارێژراو.

### Balkan languages
### زمانەکانی بەلقان

بەلقان ناوچەیەکە لە ئەوروپا کە لە سەردەمی بالآدەستی عوسمانیەکاندا خەڵکەکەی بە ئیسلام ئاشنا بووە.زمانە جیاوازەکانی بەلقان بە تایبەتی زمانی ئەلبانی، بولگاری ،گریکی ، ڕۆمانی ، مەکدۆنی ، صرب-کرواتی ، تورکی . دەتوانین بڵێین بوونی ئەو چەند زمانە لە بەلقان ناوچەی زمانەوانی دروستکردووە.

## Baluchi

**بەلوچی**

زمانی بەلوچی زمانێکی ئاریانیە.خەڵکی بەلوجستان کەسانی سوونە مەزهەبن تەواو جودان لەگەڵ کەلتوری شیعەگەری ئیرانی.زمانی بەلوچ لە بەلوجستان و هەرێمەکانی سیندی پاکستان و لە بەشە هاوسێکانی ئەفغانستان و بەشی باشووری رۆژئاوای ئیران قسەی پێدەکرێت .

## Barbarism

**بەربەریسم**

ئەو وشەیە لە وشەی بەربەری جودایە.بەربەریسم تێرمێکی کۆنە بۆ هەڵەیەك لە سەر ئاستی تاکە وشە . وشەکە بەوە جیادەکرێتەوە لە سۆلسیزم نبەوەی قسە لە سەر تاکە وشە دەکات هەرچی سۆلسیزمە قسە لە سەر گروپەوشە دەکات.

## Bare

**بێ**

وەك چاووگی بێ (تو) لە ئینگلیزیدا:

They made him **<u>confess</u>**.

یان گرێی ناوی بێ ئامراز و دیارخەر :

-**<u>large houses</u>** are expensive.

Base

چاووگ لە ئینگلیزدا ، وشەکە هەڵگری هیچ پاشگر و پێشگرێکی تایبەت بە دەمکات ، ژمارە و کەسەوە نەبیت.

## Base language
## زمانی بنکە زمانی لێوەهاتوو

زمانی بنکە ئەو زمانەیە کە زمانی پچین و کرۆل کۆمەڵە وشەیەکی لێوەرگرتوون .زمانی پچین ئاخێوی ڕەسەنی نییە بۆیە وشەکانی لە زمانی فەرەنسی و هایتی وەرگیراون .وشەی فلان لە زمانی پچیندا فەرەنسی ئامێزە.

## Basque
## باسك

باسك هەرێمێکە لە ئیسپانیا دەیەوێت سەربەخۆ بێت .زمانی باسك زمانی رۆژئاوای پیرینیە لە لایەن فەرەنسی و ئیسپانیەکانی فەرەنسا و ئیسپانیا وەك زمانی دووانە قسەی پێدەکرێت .تاکە زمانە لە رۆژئاوای ئەوروپا کە هیندۆئەوروپی نییە.

## Behaviorism
## بیهاڤیۆریزم –ڕەفتارکاری

**بزاڤێکە لە دەروونناسی هەرڵدەدات هەموو ژێدەرێك بۆ چەمکە کەسیەکان یان ئەزموونیەکان لە نێوبەرێت.بلۆمفیلد زۆر لە ژێر کاریگەری سکینەری دەروونناس بوو، بەڵام لە بەرایی شەستەکاندا زمانەوانەکان بە توندی بەرانبەر سایکۆلۆژی و زمانەوانی ڕەفتاری راوەستان. ئەو دیتنە بۆ زمان و دەروون لە سەر ئەو هاوکێشەیە دروستببوو:**

**وروژاندن کاردانەوە**

**بەڵام چۆمسکی دەربارەی زۆر پرسەکانی ڕەفتارناسی گومانی هەبوو، هەتا**

لە پێکهاتەی سینتاکسی سالّی ١٩٥٧وەلاّمی ڕایەکانی بلۆمفیلدی دایەوە.

## Bengali
## بەنگالی

جیابوونەوەی پاکستان لە هیند پەیوەندی بە جیاکاری دینی (ئیسلامی و هیندۆسی ) هەبوو .ناسیۆنالیستە هیندیەکان ، بە تایبەتی هندۆسەکان بەو جیابوونەوە دلّخۆش نەبوون.ڕەفتاری نا ئیسلامی دەسەلاّتی پاکستانی و ویستی هیندۆسیەکان بوونە هۆکار بۆ دروستکردنی دەولّەتی بەنگەدەلاشیش لە بەرایی حەفتاکاندا.زمانی بەنگالی زمانێکی هیندۆ ئاریە.

هەتا سالّی پەنجاکان دەسەلاّتی پاکستانی دەیانویست زمانی ئوردو بە سەر نەتەوەی بەنگالی بسەپێنن.زمانی بەنگالی وەك ڕەوشی زمانی کوردی وایە .زمانی بەنگالی بە پێی سەرژمێری نۆوەتەکان نۆوەد ملیۆن کەس لە بەنگەلادیش قسەی پێدەکات و زمانی نیشتیمانیە لەوێ.ئەو هەلّوێستەی دەسەلاّتدارانی پاکستانی بەرانبەر بەنگالی ، وایکرد قوتابی و ڕەوشەنبیری بەنگالی لە شوباتی ١٩٥٢ خۆپیشاندانێك سازبکەن ، زۆر قوربانی زمانی بدەن ، هەتا لە یۆنسکۆ لە سالّی ١٩٩٩ ئەو ڕۆژەی شوبات بکرێتە ڕۆژی زمانی دایك.

## Benveniste , Emile 1902-1976
## ئێمیلی بێنڤیستە

یەو زمانەوانە هیندۆ ئەوروپیە بەشداریەکی فرەی هەیە لە بواری زمانەوانی بە تایبەتی زمانە هیندوئەوروپیەکان:

١.تیۆری جوانی دەربارەی پێکهاتەی ڕەگ ١٩٣٥.
٢.دوا لێکدانەوەی فۆڕمی ناوی تەموڵك و کردەیی ١٩٤٨
٣.دوو بەرگی هەڵکەوتو دەربارەی سروشتی کۆمەڵگای هیندۆئەورووپی ١٩٦٩.

## Bidialectism

### جووتستانداریی

جووتستاندەریی بریتیە لە دوو شێوەی ستاندەر لە لایەن تاکەکانی یەك نەتەوە.کەسێکی وەك دەیڤید کریستال باوەڕی وایە لە سەر ئاستی نێودەولەتی گیروگرفت و ململانێ لە نێوان ستاندەر و ناستاندەری زمانێك بەرپایە. دوو ستاندەر لە زمانێکدا بوونی نییە ، ئەوەی هەیە بە مەرامی سیاسی و زۆربوونی دانیشتوانی هەردوو دەڤەرەکە مەیسەر دەبێت. خودی پرۆسەکە زمانەوانی نییە ، بەلکو سیاسیە و بریتیە لە بە سیاسی کردنی مەسەلە زمانەوانیەکان،چونکە دوو زمانی ستاندەر لە یەك زمانی نەتەوەدا کارەسات بە سەر نەتەوە دێنێت ، چونکە زمانی ستاندەر زمانی پەروەردەیە :ئەگەر تاکەکانی یەك نەتەوە بە دوو زمانی یەك نەتەوە لە پەروەردە گۆش بکرێت دەبێتە تاکێکی نەتەوەیی خاوەن دوو زمانی نەتەوە .کەواتە پرۆسەی جووتستاندەری جۆرێکە لە هەڵوەشاندنەوەی گوتاری دروستی یەکنەتەوەیی.

## Bilingualism
### دەسەلاتی دوو زمان

بریتیە لەو کۆمەڵگایەی کە دوو زمان دەسەلاتی موتڵەقیان هەیە. ئــەوەی لە باشووری کوردستان هەبووە بریتیبووە لە دیاردەی دوو زمــانی پلۆگلــۆتیزم .تاکی خوێنەدار و وەزیفەداری کوردی هەتا ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ ناچاربووە لە پاڵ زمانی کوردی ، زمانی عــەرەبیش بزانێــت. ئــەو دیــاردەش دوورە لــەو دیاردەیەی لە سویسرا هەیە. هاوسەنگبوونی دوو زمانەکە لە یەك کۆمــەڵگا گوزارشت لە گیانی بیلیگوالیزم دەکات .

## Binarism
### بیناریزم

تیۆرێکە لە ســەر ئــەوە دامــەزراوە کــە مــەیلێك لــە زۆر قوتابخانــەکانی زمانەوانی بنیاتگەری هەن دەربارەی کەمکردنــەوەی پەیوەنــدی بــۆ جیــاوازی دووانەیی . پەیوەندیەکانی نێوان هەر سێ ئاستی ڤاول داخراو —ناوەند —کراوە بۆ هەردوو ئەدگاری باینەری +داخراو(نزیك) ، -کراوە.

## Biolinguistics
### زمانەوانی بایۆلۆژی

دیراسەکەیە لە بارەی بەری ڕەوشــی بــایۆلۆژی پــەرە و نەشــونمای زمــان و بەکارهێنانی لە ڕەگەزەکانی مرۆڤ و تاکەکان دەدوێت هــەروەها لــە حاڵــەتی گەشەی زمان و نیرۆفسیۆلۆژی دەدوێت.

## Block language

### زمانی بلۆك

لە بەشی کورتنووسین لە زمانی کوردی ئاماژەم بەو جۆرە حاڵەتە داوە . بە کورتی بریتییە لە بەکارهێنانی پێکهاتەکانی کورتکەرەوە لە سیقێکی دیارکراو. بەکارهێنانی تایبەت بۆ وشە یان فرێز لە جیاتی کلۆز و ڕستە ، بۆ نموونە زمانی پۆستەر و ناونیشان پەرەی پێبدرێت.

## Bloomfield

### لیۆنارد بلۆمفیلد

لیۆنارد بلۆمفیلد ١٨٨٧-١٩٤٩ زمانەوانێکی ئەمریکی بوو ، مۆرکی هەبوو لە سەر بیرکردنەوەی قوتابیانی بواری زمانەوانی ، ئەو هەژموونەی بلۆمفیلد لە سەر ڕوەتی پەرەسەندنی زمانەوانی ساڵانی سیەکان و پەنجاکان . ناسینی بلۆمفیلد لە دوای چاپکردنی کتێبی زمان-١٩٣٣ . زمانەوانی بلۆمفیلد ناسراوە بە بنیاتگەری ئەمریکی.

## Boas,franz1858-1942

### فرانز بۆس

مرۆناسێکی ئەمریکیە و مامۆستای ساپیری زمانەوان و چەند زمانەوان و مرۆناسی تر بووە.دامەزرێنەری بواری زمانەوانییە لە ئەمریکا .باشترین بەشداری ئەو لە بواری زمانەوانیدا بریتییە لە دەروازەیەك بۆ یاریدەدەری زمانی ئەمریکی و هیندی ١٩١١.

## Body language

### زمانی ئاماژە

ئاخاوتنی بێ دەنگ ، چونکە لەو ئاخاوتنە زمان بە تەواوی حزوری نییــە . ئاخاوتنێکە بە دەم و چاو و دەست و سەر ...مەیسەر دەبێت .کـاتی خـۆی لـە ئاکامی نەبوونی خوێندەواری دروستبووە ، بەلاّم ئەمڕۆکە تەنیا لە لایەن کەڕ و لالّەکان گرنگی پێدەدرێت .

## Bokmal

### بۆکمال

بۆکمال زمانی یەکەمە لە نەرویژ.لە سەدا هەشتای خەلّکی نەرویژ قسەی پێدەکەن.ناسیۆنالیستی نەرویژی لە بارەی هەژموونی ئـەو زمانــەوە هەرەسـی هێناوە، چونکە لە بنەڕەتدا ئەو زمانــە زمــانی ڕەوشــی داگیرکـردن دروسـتی کردووە ، نەك زمانی ڕەسەنی نەرویژ بێت.بۆیە هەبوونی دوو زمان لە نەرویـژ پەیوەندی بە ڕەوشی زمانەوانی کوردی نییە، چونکە لەوێ ململانێ لـە سـەر دوو زمان هەیـە، نـەك دوو زاری یـەك زمــان .لـە ڕوانگـەی زمانەوانییـەوە ئەزموونی زمانەوانی نەرویژ ، کە بریتییە لـە دیـاردەی جووتسـتاندەری لـە نێوان زمانی غەوارە و داگیرکـەر لەگـەلّ زمــانی نەتــەوە زمــانی فۆلکلـۆری نەرویژی .ئەو بانگەشەیەی لە باشوور و بـاکووری کوردسـتاندا بـۆ دیـاردەی جووتستاندەری زمانی کوردی دەکرێت بەناوی ئەوەی زمانی کـوردی جیـا لـە هەموو زمانەکانی جیهان . زمانێکە بە سروشت جووتستاندەریە ، قسەیەکی سیاسیە ، نەك زمانەوانی.ئەو هەولّەش بۆ سەپاندنی بیرۆکـەی دوو نەتەوەیـە لە یەك نەتەوەدا.ئەو دیاردەش عەرەبی عیراق لـە سـییەکان هـەتا سـەرەتای

نۆوەدەکان ئیشی لە سەر دەکرد ،ئەمرۆ بەشێك لە خوێنەواری کورد بە خۆ ئیشی لە سەر دەکات ، بێئەوەی هەست بکات سایکس-بیکۆی زمان بینا دەکات.

## Borrowing

### وەرگرتن

ئەوانەی باوەڕیان بە پاککردنەوەی زمان هەیە، ناڕاستەوخۆ بزاڤ دەکەن بۆ دوورخستنەوەی زمان لە شارستانیەت .لە سەر ئەو بنیاتە وەرگرتن هیچ عەیب نییە.زمانێکی وەك زمانی ئینگلیزی لە سەدا پەنجای وشەکانی لە زمانی دی وەرگرتووە.وەرگرتنی دانە وشە لە زماندا پێیدەگوترێت وشەی قەرز .

## Boundary Theory

### تیۆری باوەندری

ئەم تیۆرە بەشێکە لە تیۆری دەسەلاّت و بەستنەوەی چۆمسکی لە سەر دیاریکردنەکانی سنوری یەکەکان لە نێو چالاکی سینتاکسیدا.

## Braille language

### زمانی برایل

سیستەمێکی تایبەتە بۆ مرۆڤی کوێر داهێنراوە تا بتوانێت زمان بخوێنێتەوە.ئەو سیستەمە لە سەدەی نۆزدەهەم لە لایەن لویس برایل١٨٠٩-١٨٥٢ داهێنرا.

## Broca's aphasia

### ئەفاسیای برۆکا

تایبەتە بە نەخۆشی قسەکردن . نەخۆشیەکی مێشکی زمانەوانییە لە لای پۆل برۆکا لە سەدەی نۆزدەهەم دۆزرایەوە...

## Brugmann , karl 1849-1919

### کارل بروگمان

زمانەوانێکی هێندوئەورروپیە هەروەها یەکێك لە دامەزرانی بزاڤی ڕێزماننووسی نوێ.مەزنترین کاری ئەو زمانەوانە یاریدەدەری بەراوردی زمانەوانی زمانی هێندۆئەورروپی.

## Bulgaria

### زمانی بولگاری

بولگاریا بەوە ناسراوە کە پێش ساڵی ١٩٩٠ دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی بوو. ئێستا نۆ ملیۆن زیاترن.سەدا ٨٥ خەڵکەکە بە بولگاری دەدوێت .بەشەکەی تر بە زمانی تورکی ، ئەلبانی ئەرمێنی ، و قەورقازی قسە دەکەن.لەو ولاّتە فرەزمانی بوونی هەیە.نەسین لە کتێبکدا ئاماژەی بە زمانی ئەو کەمایەتیە تورکیە لە بولگاریا کردووە ئەوانی چواندووە بە بوونی کورد لە باکووری کوردستانی تورکیا.

## Burkina faso

### زمانی بورکینا فاسۆ

خەڵکی ئەو دەڤەرە لە نۆ ملیۆن زیاتر دەبن.زمانی نیشتیمانی لەو ولاّتە زمانی فەرەنسیە.نزیکەی ٧٠ زمانی لۆکەلی لەو ولاّتە قسەی پێدەکرێت.

# پیتی C

## Cacophony
## گەڕەلاوژێی دەنگیی

لە کۆمەڵگایەکی بچووك یان کۆنتێستێك دەنگە دەنگی ناساز دروستدەبێت ئەو دەنگە زۆرە لەگەڵ یەکتر ناگونجێن و جۆرە گەڕەلاوژێیەکی دەنگی پێکدەهێنن.کریستال باوەڕی وایە ئەو هاشە هاشە و زبر دواندنە تەنیا لە ئاخاوتن بەرپایە. لە نووسینیش ئەگەر کەسێك دەستخەتی زۆر ناخۆش بێت و نەخوێندرێتەوە و نەتوانێ پەیامی خۆی بە وەرگر بگەیەنێت ، ئەوا وشەی بەکاردێت.بێجگە لەو دوو وشەیە وشەی کاکۆلۆجیش هەیەcacography
ئەویش هەر کاردانەوەیە بۆ زمان چونکە ئەویش گوزارشت لە بەکارهێنانی ناماقووڵی زمان دەکات.

## Caesura

### سیژوورە-وەستان لە شیعر

هەبوونی سیژوورە لە نێو ڕەزمی دێری شیعردا دیاردەیەکە لە کۆن و نوێدا بوونی هەبووە، بەلاّم لە ڕەزمی شیعری نوێدا بوونی زۆرترەزارەوەکە لە بنەڕەتدا لاتینیە بە واتای برین یان پچڕان دێت.دەکرێ سیژوورە لە هەر شوێنێکی شیعر بێت ، بۆ ناسینەوەی سیژوورە ئەوە بە خالّبەندی جیادەکرێتەوە.

ئەو دیاردەیە لە شیعردا هەیە ، بە لام لەوەدا پەیوەندی بە زمانەوە هەیە کە بە خالّبەندی لە هەر زمانێك دەناسرێتەوە. ئەم شیعرەی ئەلێکزەندەر پۆپ دیاردەی سیژوورەی تێدایە:

For this plain reason ,man is not a fly

## Cameroon

### کامیڕۆن

خەلّکی کامیڕۆن دوازدە ملیۆن زیاترن.ولاّتێکی فرەزمانە هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی زمانی ڕەسمین.گەلّێك عەشیرەتی لەو ولاّتە هەن و ئەو عەشیرەتانە خاوەن زمانی خۆیانن.

## Cardinal number

### ژمارەی کاردینال

ژمارەی کاردینال وێنەیەکی ستاندەری شوێنی بزوێنە لە زماندا . ئەو تیۆرە لە لایەن دانیال جۆنز دامەزراوە . بە پێی ئەو تیۆرە زبان دابەشکراوە بۆ

: پێشەوە ، ناوەند ، پشتەوە هەروەها چوار ئاست بۆ بەرزی زبان دیاریکراوە : داخراو ، نیمچە داخراو-ناوەندە داخراو - ،ناوەندە کراوە ، کراوە.
بزوێنەکانی هەر زمانێك بە پێی ئەو پۆلێنە دیاریدەکرێن.

## Case
## دۆخ

دۆخ لە ڕستەدا بۆ دیاریکردنی پەیوەندی ڕێزمانی نێوان ناو و ئاوەڵناو و ڕاناوە.لە زمانی هینۆئەوروپیدا گۆڕانی کۆتایی وشە لە خۆ دەگرێت . هەر دۆخێك لە هەر زمانێکدا زنجیرە واتایەك لە خۆدەگرێت ، حاڵەتی گینیڤ ، تەمەلوك دەگوازێتەوە. هەندێك بۆچوون لە زمانەوانیدا ئەو مانایانە بەکاردێنن بۆ شرۆڤەکردنی زمانەکان.

## Case Grammar
## ڕێزمانی دۆخ

نزیکبوونەوەیەکە بۆ شرۆڤەکردنی ڕێزمانی کە هەندێ ئەرکی سینتاکسی دەناسێنێت لە ڕستەدا بەمەش ئەو تەفسیرانەیان پێدەدات بە زاراوەی ڕۆڵی سیمانتیکی ئەو ئەرکانە وەك تەمولوك ، باری پاڵپشت ، ئاوەڵکرداری کاتی .ئەو جۆرە ڕێزمانە لە لایەن زمانەوانی ئەمریکی چارلز فیلمۆرەوە لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەوە داهێنراوە.

## Cavity
### بۆشایی

بۆشایی لە فۆنێتیکدا هەر ژوورێکی پێناسەکراو لە ناوچەی دەنگیە کە یارمەتی دەدات لە کاریگەری خستنە سەر کارەکتەری دەنگ.زۆر بۆشایی لە ناو جەستەی مرۆڤدا بوونی هەیە لە هەموویان ناسراوتر بریتین لە بۆشایی دەم و بۆشایی لووت.

## Central sound
### دەنگی ناوەڕاست

دەنگی ناوەند ئەو دەنگەیە کە لە ناوەڕاستی دەم دروستدەکرێت یان ئەو دەنگەیە بەشی ناوەندی زمان دروستدەکرێت.

## Chest pulse
### ترپەی سینگ

کرژبوونی ماسولکەکانی سینگ بە مەبەستی گوشار خستنە سەر هەوا بۆ ئەوەی دەڤەرەکانی دەنگ بێت.هەروەها بریتیە لە بیرۆکەی ناوەندی لە تیۆرێکدا بۆ بەرهەمهێنانی بڕگە.

## Chinese
### زمانی چینی

مەبەست لێی کۆمەڵە زمانێکی چینیە ، کە لە بنەڕەتدا دایەلێکتی جیاوازی چینین هەموو پێکەوە لکی سینتیکی ماڵباتە زمانی سینۆ-تیبتین.زۆر پێش حوکمی دەسەڵاتی کۆمۆنیستی ماندارین زمانی ڕەسمی

چینین.ئەو زمانە لە لایەن ملیارێك کەس زیاتر لە چین و سەنگاپورە و تیبت و تایلەند و مالیزیا....قسەی پێدەکرێت.لە نووسین زمانی ماندارین لە سەرەوە بۆ خوارەوەیە.

## Chomsky
## نۆوم چۆمسکی ١٩٢٨-؟

زمانەوانێکی جولەکەی ئەمریکیە.داهێنەری تیۆری داهێنانی گوێزانەوەیە لە زماندا.چۆمسکی لە پەنجاکانەوە بە ڕەخنەگرتن لە تیۆری بنیاتگەری بلۆمفیلد و ڕێگەی ڕەفتارناسی سکینەر دەرکەوت. ڕاستە کتێبی پێکهاتەی سینتاکسی -١٩٥٧ وەرچەرخانێکی نوێ بوو لە ڕەوتی زمانناسیدا ، بەلاّم چۆمسکی لە سەر زانیاری نێو پێکهاتەی سینتاکسی ئۆقرەی نەگرت و لە کتێبە یەك لە دوا یەکەکانی خۆی بە بەردەوام دەسکاری لە بیرۆکە زمانەوانیەکانی دەکرد ...لە چاپە جیاوازەکانی تیۆری ستاندەر گۆڕانکاری لە هەندێ بیرۆکەی پێکهاتەی سینتاکسی دەکرد .بە تیۆری ستاندەریش ئۆقرەی نەگرت ، باسی لە دەسەلاّت و بەستنەوە کرد لەوەش نەوەستا دوا بەرهەمی زمانەوانی پڕۆگرامی مینیمالیستە ، ئەوەی دوایی لە باشووری کوردستان لە ساڵی ٢٠١١ دکتۆرای لێهاتووە .بەشەکانی دیش چەندەها ماستەر و دکتۆرای لە کوردستان لێهاتووە.

وێڕای زمانەوانی ، چۆمسکی سیاسەتمەدارێکی گەورەی ئەمریکیە و کتێبێکی لە سەر ڕەوشی کورد هەیە.

## Chronogram
## کرۆنۆگرام

بریتیە لە گرێیەك یان ڕستەیەك کە بە پیتی ڕۆمانین ئەو پیتانە یەك دەگرن بۆ ئەوەی دەلالەت لە مێژوویێك بکەن . کرۆنۆگرام بە زۆری لە سەر گلکۆی گۆڕێك یان بەردی دامەزراندنی دامەزراوەیەك هەن بۆ ئەوەی مێژووی بخەنەڕوو.

دیاردەیەکی تر لە سریانی و هەتا عەرەبی و کوردی کلاسیکی هەیە بەوەی لە دوایەکهاتنی هەندێ پیت مێژوویێك دەردەبڕن.

## زمان و هێمای ماتماتیکی

### دەروازە

زمان زۆر نهێنی هەڵدەگرێ بە جۆرێك لە زۆر ڕووەوە پەیوەندی بە ژمارە و نیشانە و هێمای ماتماتیکی هەیە.کەی ئەو پەیوەندیە سەریهەڵداوە و قسەی لە سەر کراوە ، زۆر کاری ئەم نووسینە نییە. پەیوەندی زمان و ژمارە ئەوەندە کۆنە هەتا لە سەردەمی هیندیە دێرینەکان و یۆنان و ڕۆمانەکان قسەی لە سەر کراوە ، بەڵام هەبوونی ئەو دیاردەیە لە ئەدەبی عەرەبیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی لاوازی شیعری عەرەبی لە پاشان گواستنەوەی بۆ ناو ئەدەبی کلاسیکی کوردی.ئەوەی ئێمە زیاتر ئاماژەی پێبدەین بوونی ئەو دیاردەیە لە دەقی کلاسیکی کوردی هەروەها هەبوونی ئەو دیاردەیە لە ڕێزمانی گواستنەوەی چۆمسکی و یاساکانی واتاسازیدا.

## بنەچەی ئەو زانستە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی

ئەدەبی کلاسیکی لە سەدا نۆوەدی لە لایەن مەلا کورد نووسراوە.ئەو جۆرە کەسەش باکگراوەندێکی دینی هەیە.زۆر حەز دەکات مێژووی ڕووداوێك ، مێژووی

بوون و وەفاتی کەسێك بە چەند پیتێك لە دەقێکی شیعری ئاماژەی پێبدات.دەڵێین دەقی شیعری کوردی، چونکە تێکستی کلاسیکی کوردی بە زۆری شیعر بووە و دیاردەکەش لە نێو دەقی شیعری کوردی هەیە.ئەو دیاردەیە باوەڕ دەکرێ لە ڕێگای شیعری کلاسیکی عەرەبی و فارسی هات بێتە ناو شیعری کلاسیکی کوردی. با بزانین ئەو دیاردە زمانەوانیە چۆن هاتۆتە ناو شیعری کلاسیکی عەرەبی؟؟

نووسەری ئەم چەند دێرە باوەڕی وایە کە ئەو دیاردەیە زادەی هزری عەرەبی نییە ، بەلکو لە زمانی دی نزیك لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوە.هەرچەندە مەلای کورد وەك جزیری شارەزای لە فەلسەفەی یۆنانی هەبووە بەلاّم ئەو دیاردەیە عەرەب و کورد لە هیندی کۆن و یۆنان و ڕۆمان وەرینەگرتووە بەلکو لە زمانی سریانی وەریگرتووە.

لە زمانی سریانیدا هەر پیتێك توانایەکی ژمارەیی پێدراوە وەکو کۆدێکی ئەو سەردەمە کاری پێکراوە نۆ پیتی یەکەم ژمارەکانی خانەی ( دەیان:١-٩) بۆدانراوە وەك أ=١ ، ب= ٢ ، ج=٣ هتد. نۆ پیتی دووەم ژمارەکانی خانەی سەدانیان بۆدانراوە وەك ی =١٠، ك=٢٠،هتد نۆپیتی دواییش ژمارەکانی خانەی هەزارانیان بۆ داندراوە وەك :ق=١٠٠ ر=٢٠٠،غ= ١٠٠٠!

ئەم شێوازە ئەوها بووە لە زمانی عەرەبی ، بە جۆرێك وەك ئەوەی زمانی سریانی بووە.جا بۆ ئەوەی وردتر لە بابەتەکە بگەین ، ئاماژە بەم رێسایە دەکەین :

ابجد

١٢٣٤

هوز

٥٦٧

حطي

٨٩١٠

كلمن

٢٠٣٠٤٠٥٠

سعفص

٦٠٧٠٨٠٩٠

قرشت

١٠٠٢٠٠٣٠٠٤٠٠

ثخذ

٥٠٠٦٠٠٧٠٠

ضظغ

٨٠٠٩٠٠١٠٠٠

هەر یەك لە پیتانە ژمارەیەك دەردەبڕێت ، بۆ نموونە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ا | ب | ج | د |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ |
| ذ | ض | ظ | غ |
| ٧٠٠ | ٨٠٠ | ٩٠٠ | ١٠٠٠ |

ژمارەکان لە چەپەوە دەخوێندرێنەوە.

ئەم شیانەی سریانی کاریگەرێکی زۆری لە زمانی عەرەبی وکوردیدا کردووە بەجۆرێ زۆر لەشاعیرانی کلاسیکی عەرەب وکورد سودێکی زۆریان لەو کۆدانە وەرگرتوە بۆ دیارکردنی رووداوێکی مێژوویی سالّی بوون ومردنی کەسێك..هتد.بۆ گەیاندنی مە سیحیەت وزمانی سریانی چەندەها قوتابخانە کرانەوەو ئەو قوتابخانە رۆلّێکی گرنگیان بینی لە پەرەپێدانی زیاتر بەسریانی چونکە لەو قوتابخانە ئایینی یانەدا وانەکان زیاتر بەسریانی بوون ، نەك زمانی تر ئەوانەی بە یۆنانیش بوون پەیتا پەیتا دەکرانە سریانی. زۆربەی قوتابخانەکان لە کوردستان بووە ، قوتابخانە هەرە دیارەکان ئەمانە بوون : قوتابخانەی ئۆرهای ، قوتابخانەی نسێبین ، ، قوتابخانەی ماردین ، ، قوتابخانەی مەلّاتیە ،، قوتابخانەی دێر زوقنین نزیك ئامەد ،، قوتابخانەی دێر قرتمین _ گوری یدین ،قوتابخانەی دێر مەتی ،نزیك مۆسلّ ، قوتابخانەی دێر قنی نزیك بەغدا.لەمیانی گرنگی دان بە زمانی سریانیدا ، ئەوا چەندەها زاناو پسپۆر لەو بوارەدا پەیدابوون کە زۆربەیان پیاوی ئایینی بوون وەك ئەفراها ،ئەفرامی مەزن ، نەرسی ،ئەحومەدمە ،عبد یشوع ماردینی

، ئیشوعیا ئەدیایی ، حەنایشوع ، یەعقوب ڕەهاوی یوحەنا بزمنکایی،یوسف ماردینی،ئیشوعیائەدیایی، ،خامیس قەداهی ، یوحەنا ئاسیاوی...هتد

لەسەر دەستی قەشەو مژدە دەرانی مەسیحی دا چەندەها کتێب ونامیلکە و وتار بە زمانی سریانی لەسەر مەسیحیەت وڕێزمان وئەدەبی سریانی بڵاوکرانەوە هەروەها بۆ ئەوەی زمانی سریانی هەر زمانی دین و کەنێسە و ڕێ و ڕەسمی دینی نەبێ و ببێتە زمانێکی ئەدەبی و سیاسی وکەلتووری ئەوا چەندەها فەرهەنگ لە نێوان سریانی وزمانی عەرەبی وئینگلیزی فەرەنسی و ئیتاڵی وتورکی و فارسی نووسران.

وەك خۆیا دەبێ ، زمانی عەرەبی و کوردی لەو بوارەوە سودی لە زمانی سریانی وەرگرتووە.

لە شیعرێکی شێوە کلاسیکدا ئەو شێوازی زمان لە بریتی ژمارە بە کارهاتووە :

شاعیر دەڵێ :

*وەك چریکەی بلبلان اللە اکبر دەنگی ئەدا*
*بۆ کەبار و بانگ و قامەت تا قیامەت روو ئەدا*
*بۆ نموونە باغی جنەت هاتە (شۆرش) ناویدا*
*باخچەیی هەولێر بەهەشتە بۆنی مێژووت بۆ ئەدا*

**١٩٨٤ - ٧٠٧ ٢٥١ ١٠٢٦**

## نموونە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی

تاریق العجاوی لە کورتە وتارێکدا بە ناوی" مێژووی مێژوو لە شیعری عەرەبی "دا مێژووی دەرکەوتنی ئەو دیاردەیە زۆر کورت دەکاتەوە و جەخت لە سەر ئەوە دەکات کە ئەو دیاردەیە وەك بە کارهێنان لە ئەدەبیاتی عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ ڕووداوێکی ساڵی ٨٢٢ ی کۆچی بە بەڵگەی هەبوونی ئەو دەقە :

خیر بلا مع کمال العفة

٨٢٢= ٥+ ٧+ ٨١٠

بە ڕای نووسەر ئەو دیاردەیە لە شیعر و پەخشانی عەرەبی بوونی هەیە هەروەها زیاتر لەو شیعرانە هەیە ، کە زۆر گرینگی بە فۆرم دەدەن و ناوەڕۆك و مانا فەرامۆش دەکەن.بە ڕای ئێمە ئەوانەی کار لە سەر ئەو مەسەلەیە دەکەن ، دەبێت ئەلفبای ئەو ڕێسایەی سەرەوە نەك ئەلفبای زمان و فەرهەنگ ، باش بزانن ئەگەرنا

ئەو دیاردەیەیە ( پیت و ژمارەی بەرامبەری ) کۆنترۆل ناکەن.نووسەری پێشوو ئەو نیوە دێرە وا شرۆڤە دەکات :

خ = ٦٠٠ +ی ١٠ +ر٢٠٠ =٨١٠

ب٢ +د ٤ +ا ١ =٧

٨١٧= ٧+ ٨١٠

+هـ ٥

هەمووی دەکاتە ٨٢٢

لایەنی تیۆری ئەوەمان پێ دەڵێ لە گەڵ هەندێ گۆڕانکاری لە زمانی سریانی هاتۆتە ناو زمانی عەرەبی.لە بەر ئەوەی ساڵی کۆچی بە شێك لە کەلتوری عەرەب پێکدەهێنێت بۆیە ساڵی بوون و وەفات و ڕووداوەکە بە ساڵی کۆچی لێکدراوەتەوە.

لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی بە تایبەتی شیعر شیعری بەرزیش بە پێچەوانەی شیعری عەرەبییەوە مبوونی هەیە.شاعیرێکی بەرزی وەك ( ئەحمەدی خانی ) ماوەیەك ساڵی وەفاتی جێی گومان بور ، بەڵام شاعیرێکی هاوچەرخی خۆی لە ڕێگای نیوە دێرێکی عەرەبییەوە ساڵی وەفاتی خانی بەو نیوەدێرە شیعرە دەردەبڕێت :

## طار خاني الى ربه

د.مارف خەزنەدار لە بەرگی دووەمی مێژووی ئەدەبی کوردی لاپەڕە (٣٠٨ ) دەنووسێت:"ئەو ڕستەیە بۆ مردنی شاعیر دانراوە بە حسێبی ئەبجەد دەکاتە ساڵی ١١١٩ هـ ، ئەم ساڵە بەرامبەر بە ساڵی ١٧٠٧ی مەسیحییە ،یا ڕاستر کەوتۆتە نێوان هەردوو ساڵی (١٧٠٧ و ١٧٠٨ )ی مەسیحییەوەیە".کەواتە جیان الخضري لە وتارێکدا ئەو ڕستەیە وا شیدەکاتەوە :

ط- ا- ر- خ - ا- ن -ي- ا -ل- ي- ر- ب- ه-

٩ +١ +٢٠٠ +٦٠٠ +١ +٥٠ +١٠ +١ +٣٠ +١٠ +٢٠٠ +٢ +٥

=١١١٩ ی کۆچی

بەم جۆرە ساڵی کۆچکردنی خانی بۆ لای خودای گەورە یەکلادەبێتەوە.

## ڕێزمانی گواستنەوەی چۆمسکی

ساڵی ١٩٥٧ بە وەرچەخانێکی گەورە لە مێژووی زمانەوانی دادەنرێت ،چونکە لەو ساڵە نۆوم چۆمسکی بە کتێبێك بە ناوی "پێکهاتەی سینتاکی " وەڵامی قوتابخانەی بونیاتگەری بلۆمیفیلدی دایەوە.ئەو وەڵامە تەنها تایبەت نەبوو بە تێڕوانین لە چەمکی زمان و ڕێزمان بەلکو ڕەخنە بوو لە قوتابخانەی دەروونی ڕەفتاری.هەرچەندە تێڕوانینی چۆمسکی لە" پێکهاتەی سینتاکی" هەتا" پرۆگرامی بچووکترین" شایەنی ڕەخنە و سەرنجن.ئێرە وەختی ئەو گفتوگۆیە نییە ، بۆیە هەر تەنیا ئاماژە بەو لایەنانە دەکەین کە پەیوەندی بە باتەکەمانەوە هەیە!

چۆمسکی هەندێ یاسای دارشت ، کە ناسراون بە ڕێزمانی پێکهاتەی گرێ ، لە هەندێ ئەو یاسایانە لە بریتی زمان نیشانە یاخو هێمای ماتماتیکی بەکارهاتوون :

ڕستە______گرێی ناوی +گرێی کاری

گرێی ناوی-----دیارخەر + ناو

گرێی کاری----فرمانی یاریدەدەر + بەرکار +کار

لەو هەموو یاسایە چەندین هێمای ماتماتیکی بە کار هاتووە.

پێش ڕێزمانی چۆمسکی لە نێوان وشەی پێچەوانە لە زۆربەی بەشەکانی ئاخاوتن هێمای ماتماتیکی بە کار هاتووە :

پیاو×ژن

زیندوو ×مردوو

ڕەش ×سپی

گەورە ×بچووك

هەروەها لە سەردەمی نوێدا نوختە لە نێوان هەندێ پیت بە کار دێت :

پ.د.ك

ی.ن.ك

نموونە لە ئەدگاری سیمانتیکی

پیاو : +نێر +هەراش +ژنهێنراو

ئافرەت :+مێ +هەراش -+ شووکردوو

لێرەدا چەندین هێمای ماتماتیکی بوونی هەیە ، لە بەر هۆی درێژدادڕی پیتەکان فەرامۆش کراون.

## کورتەی بابەتەکە

لە مەسەلەکانی ئەدەب و زمان و ڕێزمان هێمای ماتماتیکی بە واتای جیاواز بە کارهاتوون.لە شیعری کلاسیکی پیت لە بریتی ژمارە بە کارهاتووە.لێرەدا ئەدەب و زمان تێکەڵی یەکتر کراوە.ئەوەی گرینگە ئاماژەی بۆ بکرێ دوو شتی سەرەکیە.یەکەم ، ئەمە داهێنانی عەقڵی عەرەبی و کوردی نییە ، بەڵکو زادەی عەقڵی کلدانی و ئاشووریە.دووەم ، ئەو دیاردەیە لە شیعری نوێ و هاوچەرخی کوردی زۆر دەگمەنە و بە زۆری لە شیعری کلاسیکی عەرەبی و کوردی بوونی هەیە.

وێڕای ئەمەش بە پێچەوانەی ئەدەب ئەو دیاردەیە زیاتر لە قوتابخانە تازەکانی نەك کۆنەکان ، بوونی هەیە و لەوێ وەك لە قوتابخانەی چۆمسکی و واتاسازی بە کاردێت.

## Cleft sentence

### ڕستەی دوو کەرت

پێکهاتەیەکە کە تاکە کلۆزێك دابەشدەبێت بۆ دوو بەش کە هەریەکەی کرداری خۆی هەبێت.

## Clinical linguistics

### زمانەوانی نۆژینگەیی

پیادەکردنی زمانەوانی لە شرۆڤەی ئاشووبی زمانەوانی –تێکچوونی زمانەوانی – زمان بە تایبەتی ئەوانەیپەیوەستن بە بەرهەم یان وەرگرتنی ئاخاوتن.

## Clipping

### کورتکردنەوەی وشە

جۆرێکە لە ڕۆنانی وشە، ئەو ڕێگایە بریتیە لە کورتکردنەوەی وشەی تر.ئەو رۆنانە وەك شێوازەکانی تر ، ڕۆڵی هەیە لە دەوڵەمەندکردنی زمان بە وشەی دارێژراو بەرچاوترین وشە لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی ئێگزام(تاقیکردنەوەیە )-ە کە لە وشەی ئێگزامینێیشن ، کورتکراوەتەوە.

## Closed syllable

### بڕگەی داخراو

ئەو بڕگەیەیە کە کۆتایی بە نابزوێن دێت ، ئەمەش پێچەوانە بڕگەی کراوەیە کە کۆتایی بە بزوێن دێت.

# Context

## کۆنتێکست -سیاق-چوارچێوە

دوان لە ڕۆڵی دەق-چوارچێوە Contextلە دیارکردنی واتای وشەو فرێز و ڕستە دا زۆر گرنگە، چونکە پێش هەمووشتێ دەق لێڵی ambiguîty لە زمان دا ناهێلێ وزۆر هاوکاری خوێنەر دەکات کە بە ئاسانی لە واتای ویستراو Wanted Meaning بگاتە بابەتی کاریگەری دەق لە زێترۆشن کردن ودیار کردنی واتادا بەرەو زانستی پراگما تیکسمان دەبات. پراگماتیکس Pragmatics و واتا سازی Semantics لە نەزەری زۆر زماناسدا Linguists پەیوەندی یان بەیەکە وە هەیە، بەلام دەبێ هۆشیار بین پەیوەست بوونی هەر دووك بە واتا Meaning وامان لێ نەکەن بەیەك دید لە هەردووك بڕوانین. چۆمسکی باوەری وایە کە لەزمان دا زانیاری زەهنی لە بارەی زمان هەیە، ئەو زانیاریانە لە مێشکی مرۆڤدا پارێزراون راست و دروستن، بەلام مرۆڤ کە ئەو زانیاری یانە بە کار دەهێنێ تووشی هەڵە دەبێ. لەو ڕاوانگەوە، لیڤینسۆن دەڵێ زانستی پراگماتیکس دیراسەی بنەما و شەنگەستەکانی بەکارهێنانی زمان دەکات.(٢) کرۆفەر هەدسۆن یش لە کتێبی Essential Introductor Linguistics دەنوسێ پراگماتیکس بریتی یە لە پەیوەندی نێوان زمان و بەکار هێنانی دەق ــ ئەمە و پراگماتیکس دیراسەی ئەو پەیوەندی یەی نێوان زمان و دەق دەکات.

هەروەها هەدسۆن لەبارەی گرنگی پراگماتیکسەوە دەنوسێ: پراگماتیکس گرنگە بۆ ئەوەی مرۆڤ بزانێ زمان چۆن کار دەکا، چونکە بەبێ دەق فۆرمی

زمانەوانی بە تەنیا ناتوانێ شرۆڤەی ئەو هەموو واتایانە بکات کە ئێمە لەزمان دا بەدەستی دەهێنین.(٣) ئالێردەدا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە خوێندنەوەی سیماتیکی و خوێندنەوەی پراگماتیکی لەزمان دا هەیە، بێ گومان دەق رۆڵێکی زۆر گرنگ وکاریگەر دەگێرێ لەیەك جیاکردنەوەی ئەو دوو خوێندنەوەیەدا.

لە خوێندنەوەی سیماتیکی دا جەخت لەسەر واتای وشەو فرێز و رستەکان دەکرێ ــ بەواتای لە رێگای فۆرمی زمانە وانی دا وەك وشەو فرێز و رستە دا مرۆڤ پێش بینی واتای ویستراو بەدی دەهێنێ. هەر وشەو بەپێ ی شوێنی لە دەقەکەدا واتای ویستراو بە خوێنەر دەبەخشێ، بەلأم لە خوێندنەوەی پرگماتیکی دا چەقی شرۆڤەکردنەکە پا بەندە بە واتای وتنەکەی قسەکەر نەك واتای رووتی وشەکان.(٤) بەواتای ئەوەندەی واتاکە دەوەستێتە سەر دەقەکە یان ئاخا وتنەکە ئەوەندە ناوەستێتە سەر واتای و شەو فرێزەکان لێرەدا واچاکە نمونەیەك بهێنینەوە بۆ ئەوەی هەردوو خوێندنەوە وشروڤە کردنەکە زیاتر لەیەك جیا بکەینەوە:

ئەگەر یەکێ بلێ: **ئێرە ساردە** . بەگوێرەی واتای وشەکان ئەو رستەیە، ئەم واتایە دەبەخشێ: کەش و هەوای ئەم شوێنە ساردە (گەرم نی یە).

بەلأم بە گوێرەی شروڤەکردنی پراگماتیکی ئەو رستە یە چەند واتایەك لە خۆی دەگرێ وەك:

یەك: (چونکە ئێرە ساردە) با لەناندین نان بخۆین.

دوو: سۆپاکە هەڵبکە (چونکە ئێرە ساردە).

سێ: پەنجەرەکە (دەرگاکە) دابخە (چونکە ئێرەساردە)(٥).

چوار: بابچینەوە ژوریَ (چونکە ئیَرە ساردە).

سەیر دەکەی، لە لیَکدانەوەی پراگماتیَکی دا دەق ــ چوار چیَوە ــ رۆلــی زۆر گرنگ دەبینیَ ــ بە گویَرەی لیَکدانــەوەی یەکــەم ئــەوەی رســتەی »ئیَــرە ساردە« دەلَیَ مەبەستی لە »ئیَرە« بۆ نمونە »ژوری دانیشتنە« بۆیــە کەســی بەرامبەر ناندین، کە گەرمە، بە پەسەند دەزانی. لەهی دووەم وادیارە، وەرزی زستانە یان بەرەو زستانە، بۆیە ژورەکە پیَویستی بە سۆپایە، لەهی ســیَ یــەم دەردەکەویَ کە پەنجەرە یان دەرگای ژورە کە کراوەیە وبۆ تە هۆی سارد بــوونی شویَنەکە، بۆیە بۆ ئەوەی ساردی یەکــە نــە مــیَنیَ، ئــەوا کەســی بەرامبــەر پیَوەدانی پەنجەرەیان دەرگاکە بە چارەسەردەزانیَ. لەهی چوارەم وادیارە قسەکەر گویَ گر لە دەرەوەن یان لە باخچەی مالَەوەن، بۆیە گویَ گر هەست دەکات کە دەرەوە ساردەو کەلَکی دانیشتنی نی یە، بۆیە چوونە ژوورەوە بەپەسند دەزانی.

## رۆلی دەق لە دیار کردنی هاوبیَژو فرەواتادا

سەرەتا با بەکورتی لەهەردوو زاراوەی هاوبیَژو فرەواتا بکۆلَینەوە، چــونکە ئەو دوو زاراوە لەیەك نزیکن بە جۆریَ ئەو لەیەك نزیکــی یــە وای لەهەنــدیَ نوسەر کردووە کە جیاوازی لە نیَوان هەردووکیان نەکەن ئەمەو بــە حــوکمی ئەوەی نوسینی سەر بەخۆلە سەر ئەم بابەتەنی یە، بۆیە ئــەو ئەگــەرەش وای کردووە کە ئاسان نەبیَ هیَلَی جیاکەرەوە لەنیَوان ئەو زاراوانە دابنریَ. هەروەها لیَلَــی و تــەم ومــژی لــەواتای ئــەو دوو زاراوەدا فەراهــەم دیَ، د. موحەمــەد مەعروف هاوبیَژی پۆلَین دەکات بۆ سیَ جۆر.[٦].

١ــ **هـاودەنگ:** ئـەو وشـانەن کەلەوتنـدا لەیـەکتر دەچـن بـەڵام جیـاواز دەنوسرێن، ئەو جـۆرە لـە ئینگلیزیـدا زۆرە وەك Rite (بۆنـە)، Write (دەنوسیٚ) right (ڕاست)، Wright (دروست کەری دار، دراما...).

٢ــ **هاوپیت:** ئەو وشانەن کەلەنوسیندا وەك یەکن، بەڵام جیاواز دەوتـرێن وەك هەمانە (هەیتمان ــــ هەمبانـە).مـاوە (هێشـتا نـەمردووە)، (وەخـت Period))هاوبێژی لەم جۆرە دا ئـاوازە Intonation ڕۆڵێکـی گـرنگ دەبینیٚ لەدرکاندنی واتای ویستراودا.

٣ــ **هاوبێژی تەواو:** ئەو وشانەن کە لەنوسین وتندا وەك یەکن: ئاش (جیٚ ی هاڕین) ئاش (چێشت). دکتۆر فەتاح مامە، باوەڕی وایە، کە لـە کوردیـدا هاوبێژی هەر تەنیا لەوشەدا نـابیٚ، بـەڵکو فرێـزو رسـتەش دەگرێتـەوە، بـۆ سەلماندنی رایەکەشیٚ ئەم نمونانە دەهێنێتەوە:(٧).٨٩

لەبەرماران: لە پێش ماڵان

لەبەرماران: بەهۆی ماری خشۆکەوە (هاوبێژی فرێزین)

کە پێم لیٚ نا: کە بە ئەوم دروست کرد

کە پێم لیٚ نا: کەدانم پیانا (هاوبێژی پارستەیی)

کە پێم لیٚ نا: کە بەسەری کەوتم

لێم خوڕییەوە: دووبارەخۆم لەو تورەکرد

لێم خوڕییەوە: دوبارە هاژۆتمەوە (هاوبێژی رستەیی)

دەق یان چوار چێوە ئەم لێلی وتەم و مژی یـە لـە وشـەو فرێـز وپارسـتەو رستەکاندا ناهێڵیٚ، بۆ نموونە ئەگەر لە پێش فرێـزی (بـەرماران) بنووسـین: ئـازادم لـە بـەرماران دیـت.ئـەوا (بـەرماران) واتاکـەی ڕوون دەبـیٚ تـەنیا

(بەرمالآن) دەبەخشیٚ نەك هەردوو واتا هەروەها ئەگەر بۆ پارستەی (کەپیٚم لیٚ نا) ئەم رستەیە زیاد بکەین: دەم ودەست مرد، ئەوا تەواوی رستەکەوای لیٚ دیٚ:

کەپیٚم لیٚ نا دەمو دەست مرد.

لەم بارەش لە هەرسیٚ واتای ((کەپیٚم لیٚ نا)) لەورستەی سەرەوەدا، تەنیا واتای سیٚ یەم دەمیٚنیٚ، ئەوانی تر نامیٚنن، هەروەها لەرستەی نەوزاد زۆرقەسەی نابەجیٚ ی کرد، بۆ یە لیٚم خورپییەوە، ئەوا »لیٚم خورپییەوە« تەنیا واتای یەکەمی دەمیٚنیٚ.

## فرەواتا

زاراوەی فرەواتا یان پۆلۆاتا بریتی یە لە بەکارهیٚنانی هەمان لیٚکسیم بە دوو یان زیاتر لە دوو واتای جیاواز ــ زماننا سانی وەك پالمەر، لیچ، فرۆمکین و تۆ دمان وکریستەل باوەریان وایە کە لەفرەواتادا یەك فۆرم هەیە ئەو فۆرمەش چەندەها واتای جیاواز لە خۆی گرد دەکاتەوە.(٨) لەمەش زیاتر، گریٚیتر و ریٚدمان وئاتلەس وسو دەلٚیٚن واتا جیاوازەکانی یەك فۆرم دەبیٚ هاورەگەزبن ولە هەمان سەرچاوە سەر چاوەیان گرت بیٚ.(٩)لە زمانی کوردی، دیاردەی فرەواتا لەناو بەشەکانی ئاخاوتن بەرچاو دەکەویٚ، بەلآم لە نیٚو جۆرەکانی ئاوەلٚناوی چۆنیەتی دا قەبارەیەکی گەورە داگیر دەکات لە نەزەری دیکسۆن حەوت جۆری ئاوەلٚناو هەیە، د. مەحەمەد مەعروف وای بۆ دەچیٚ کە ئەو ناوچە بیریانەی کە پیٚویستە وەسپی بکات لە کوردیدا بەقەدەر ئەوەی ئینگلیزی نین،(١٠) بەلآم بەوەردبونەوە لە

جۆرەکانی ئاوڵناو لە ڕوانگەی سیمانتیکی یەوە ئەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بلێین گەرهەموو ئەو جۆرانە سەد لە سەد لە کوردی نەبن ولەیەك ئاست نەبن (لە ڕووی زۆری)، ئەوا بەشێکی فراوانی ئەو ناوچا نە دەگرنەوە کە دیکسۆن نەخشەی بۆ کێشاوە، لێرەدا بۆ ئەوەی لە سنوری باسەکەدا دەرنەچین وای بەچاك دەزانین تەنیا هەندێ ئاوڵناو لەهەندێ جۆردا بینین و بزانین دەق تا چەند دەتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ لە دیارکردنی واتای هەر یەکێکدا، ئاوڵناوی تایبەت بەرەنگ ڕوبەرێکی فراوان لە بۆڵواتا پێکدەهێنێ هەر بۆ نموونە ئاوەڵناوی ((ڕەش)) لە کوردیدا لە ژێر کاریگەری دەق دا بەو واتایانە دێت:

١ـ کراسێکی رەشم هەیە، (رەنگی رەش نەك سپی).

٢ـ پیاوێکی رەشە، (ناشرینە جوان نی یە).

٣ـ پیاوێکی دەست ڕەشە، (ئیدیۆمی ((دەست رەش)) بەواتای پیاوێکی بێ خێرە ـ هەر خراپەی لە دەست ڕودەدا)

٤ـ پیاوێکی زگ رەشە، (پاقژنی یە ـ نیەتی باش نی یە).

٥ـ لە بازاری رەش کار دەکات، (نایاسایی غەیرشەرعی).

٦ـ لە ئیشی رەش وای بەسەر هاتووە، (نارەسمی).لە دوای ڕاپەرینی ١٩٩١، هەرسێ رەنگی زەردوکەسك و سۆر، بێجگە لەواتای خۆیان چوار چێوەیەکی سیاسیشیان وەرگرتوە:(١١)

ـ ئەو لەلیستی زەردە، (پارتی یە).

ـ ئەو لە لیستی کەسکە (یەکێتی یە).ئەو لە لیستی سۆرە (شیوعی یە).

هەندێ ئاوەڵناو هەن لە ژێر کاریگەری دەق دا نەك هەر واتایان دەگۆڕێ، بەڵکو جۆری ئاوەڵناویشیان گۆڕانی بەسەر دادێ بۆ نموونە:

پیاوێکی رەقە: (ئاوەڵناوی رەق وەسپی مرۆڤ دەکات بەواتای بە ئاسانی ئیقناع ناکرێ دێ)

ـ دیوارێکی رەقە: (ئاوەڵناوی رەق وەسپی شتێکی نازیندو دەکات بەواتای بە »ئاسانی نا روخێ دێ).

ـ نانێکی رەقە: (بۆ خواردن ناشێ پێویستە برێشێندرێ تا بخورێ).

ـ وەلامێکی رەقە: (جوان نی یە، رێزی تێدانی یە)ئاوەڵناوی (وشك) و (نەرم) و (توند) و (تەڕ) و (گەرم) و (سارد) و (سووك) و (گران) (گەورە) و (بچووك) و (خۆش) و (کۆن) هتد...

ل ژێر کاریگەری دەق دا وەك ئاوەڵناوی رەق چەندەها واتا لە خۆ دەگرن، بەلام لە زۆر بواردا دەق ئەو لێڵی و تەم ومژی یە لەواتادا ناهێڵێ و واتای ویستراو بە خوێنەر دەگەیەنێ، ئەگەر دەرفەت نەبێ نموونە بۆ ئەو هەموو ئاوەڵناوانە بینینەوە ئەوە تەنها باس لە هەردوو ئاوەڵناوی (گران) و (گەورە) دەکەی

١ـ ئەو بارە گرانە.

٢ـ پیاوێکی گرانە.

٣ـ پرسیارێکی گرانە.

٤ـ گرانە.

٥ـ نەختی گر

١ـ خانوەکەی گەورەیە (بچووك نی یە ـ قەسرە).

٢ـ باوكم گەورە بووە.

٣ـ كو يخا عەلی، گەورەی گوندی ئێمە یە.

٤ـ نا هەقت ناگرم، گەورە بووی.

٥ـ ئەو گەورە بووە هەموو كەس نایخوازێ.

٦ـ كچەكەم گەورە بووە.

هەر وەك وتمان دیاردەی فرەواتا هەر تەنیا لە ئاوەڵناو دانی یە، بەڵكو زۆر فرمان وناوی كوردی دیاردەی فرەواتایان لێ سەر هەڵدەدات ئالێرەش، تەنیا لە واتا جیاوازەكانی فرمانی (دەگری) ورد دەبینەوە لەم هێڵكاریەدا بۆمان دەردەكەوێ، كە فرمانی (دەگری) یەكێ لەو فرمانا نەیە كە زۆر واتا لە خۆ دەگرێ، بەڵام زۆربەیان هەرواتای (گرتن) بەواتا گشتی یەكەی دەبەخش

١ـئەو دەگری (دەگریێ).

٢ـ پۆلیس دزەكە دەگری، (گرتن).

٣ـ ئەم دارە سێو دەگری.

٤ـ ئەم پەیتونە چوار كەس دەگری.

٥ـ ئەو ئازایە بەرگە دەگری.

٦ـ ئاوابڕوات دوژمن وڵات دەگری.

٧ـ ئەم وشەیە دوو واتا لە خۆی دەگری.

٨ـ حیزب كۆنگرەی دووەمی دەگری.

٩ـ زووبن ئەگەرنا پا سەوانەكە دەرگادەگری.

١٠ـ ئەو زوو گەشكە دەگری.

## چۆنیەتی جیاکردنەوەی هاوبێژو فرەواتا

هەندێ لەزماننا‌سە بیانی یەکان هەوڵیان داوە هەردوو زاراوەی هاوبێژی و فرەواتا لەیەك جیا بکەنەوە، بەڵام بە حوکمی ئەوەی لە زمانی کوردیدا هەر دوو زاراوەکە بە شێوەیەکی وا بەناویەکدا چووینە ئەستەمە بتوانرێ ئەو وشەو فرێز و رستانەی هاوبێژی وفرەواتا دروست دەکەن بەبێ بوونی چەند رێسایەکی جیاکەرەوە بەئاسانی لە یەکتر هاوێر بکرێن، نوسەرێکی وەك جەمال بابان لە بەرگی یەك ودووی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد لە ژێر ناونیشانی ((هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر هەڵدەگرن ((کۆمەڵە زاراوەیەکی زۆری کۆکردۆتەوە و وای بۆ چووە کە ئەو زاراوانە فرەواتان،(٢١) بەلام د. ئەورەحمانی حاجی مارف لە ((لێکسۆلۆژی زمانی کوردیدا)) دەنوسێ ئەو زاراوانەی مامۆستا جەمال ناوی یان دەنێ ((فرەواتا)) ئەوا زۆر بەیان هاوبێژن فرەواتا نین،(٣١) کە سەیری ئەو هەموو زاراوانەی مامۆستا جەمالم کرد، بۆم دەرکەوت کە مامۆستا نەیتوانیوە، هەردوو زاراوەی فرەواتاو هاوبێژی لەیەکتر جیابکاتەوە، د. ئەورەحمان لە زۆر نوسینەکانی دا ــ ئەوەندەی من بینیومە ــ لابەلا باسی هاوبێژی و فرەواتای کردووە، بەڵام هیچ رێسایەکی پێشنیار نەکردووە بۆ هاوێرکردنی ئەو دووزا راوەیە.پرۆفیسۆر د. موحەمەد مەعروف لە کتێبی ((زمانەوانی)) باسی لە هەردوو زاراوەکەدا کردووە، بەڵام ئەویش باسی لە چۆنیەتی جیاکردنەوەی هەر دوو زاراوەکە نەکردووە، د. فەتاح مامە عەلی لە ماستەر نامەکەیدا بەسود وەرگرتن لە ژێدەرە بیانی یەکاندا ــ ئەو حەوت

ڕێگەیەکی لەلاپەڕە (٨١) دا بۆ جیاکر دنەوەی هاوبێژی وفرەواتا تۆمار کر دووە:

١ــ لە ڕێگەی ئیتیمۆلۆجیەوە.

٢ــ لە ڕێگەی فەرهەنگەوە.

٣ــ سروشتی قسەکردنی وبابەتی باسەکە.

٤ــ بەهرەی ڕۆڵەکانی نەتەوە.

٥ــ ڕێگەی واتای سەرەکی و واتای لاوەکی.

٦ــ بەهۆی یاساکانەوە.

٧ــ لە ڕێگەی سیتاکسەوە (ڕۆنانی سەرەوەو ژێرەوە)(١٤).

لە ڕێگاکانی ١ و ٢ و ٣ و ٤ و ٥ بنەچەی وشەو دەق دەوری سەرەکی دەبینن لە جیاکردنەوەی هەردوو زاراوەکەدا، بەواتای دەکرێ ئەو حەوت خاڵە لە دوو سێ خاڵدا کۆبکرێتەوە، لەم نوسینەدا هەوڵ دەدین جەخت لە سەر سێ خاڵدا بکەین کە تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەری خۆیان هەیە لە جیاکردنەوەی هەردوو زاراوەکەدا کەئەوانیش ئەمانەن:

**١ــ یەك لێکسیمی و فرەلێکسیمی:**

لە فرەواتادا یەك لێکسیم کۆمەڵە واتایەکی جیاوازی هەیە، هەرچی لە هاوبێژی یە ئەوا بەرێکەت رێککەوتوە کە ((کۆمەڵە وشەیەك)) هەمان ڕینوس و دەنگیان هەبێ بەڵام لەواتادا جیابن، بە گوێرەی ئەو مەرجە وشەی ((گران)) فرەواتایە، چونکە ئەو وشەیە کۆمەڵە واتایەکی جیاوازی هەیە، هەرچی هەردوو وشەی ((کار ــ ئیش)) و ((کار ــ کارژۆڵە)) ئەوا

تەنیا هاوبێژن، چونکە ئەوا نە دوو وشەن نەک وشەی ((کار)) دوو واتای هەبێت.

**٢ـ ئیتیمۆلۆژی:**

بەڕای لیونزو ولیچ وکریستەل ئەگەر دوو وشە هەمان ڕەگەز ـ ژێدەر یان هەبێ ئەوا ئەو دوو وشەیە فرەواتای یەک وشەن، بەڵام ئەگەر ژێدەرەکەیان جیاواز بوو ئەوا هاوبێژن،(٥١) لەوڕوانگەوە ئەو جووتە وشانە لە کوردیدا تەنیا هاوبێژن، چونکە بەهیچ جۆرێ ژێدەرەکەیان تێك ناکاتەوە

ئازار: ئێش.

ئازار: مانگی سێ.

بیر: بیری ئاو.

بیر: هزر.

شیر: شیری مانگا (شلە).

شیر: شمشێر.

هەر چی وشەی ((تان وپۆ)) یە ئەوا فرەواتایە کە بەواتای ((تەونکاری وماتماتیك و گرێ)) دێ.

هەر سێ واتا لەیەك خاڵدا یەك دەگرنەوە ئەویش مەسەلەی ((ئاڵۆزی))یە.

**٣ـ واتای لەیەك نزیك ولەیەك دوور:**

بە گوێرەی ئەم خاڵە ئەو کۆمەڵە وشەیەی کە هاوپیت و هاو دەنگن و واتاکانی ئێستایان لەیەك نزیکە ئەوا ئەو وشانە بەفرەواتای یەك لێکسیم دادەنرێن، بەلام ئەگەر وشەکان واتایان لەیەك دوور بوو، ئەوا ئەو وشانە

بەھاوبێـژی یـەکتر دادەنـرێن.زمانناسـانی وەك لیـونزو لـیچ وکریسـتەل ئـەم مەرجە بە پەسەند دەزانن، چونکە ئەمە پەیوەستە بە ئاستی ئاسۆیی وشـە نەك ئاسنی شاقولی بەشێوازێکی تر مەسـەلەکە زیـاتر پەیوەسـتە بـەواتای ئێستای وشەکان نەك واتای کۆن و یـان بنەچـەی وشـەکان، لـەم ڕوانگـەوە ھەردوو وشەی ((خـاڵ ــ نوقتـە نیشـانە ))و ((خـاڵ ــ بـرای دایـك)) ھـەم واتایان لەیەك دوورە و ھـەم واتـای ئێسـتایان تێـك ناکـەوە، بۆیـە ئـەم دوو وشەیە ھاوبێژن نەك فرەواتا.

لە ھەردوو باردا ــ ھاوبێـژی و فرەواتـا ــ ئـەوا دەق ــ تـەنھا لـە چـەند حالەتی کەم نەبێ ـ ناھێڵێ تەم ومـژی تێکـدەر لـە زمـان دروسـت ب بـێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە تەم ومـژی لـە ھاوبێـژی و فرەواتـا ھەیـە بـەڵام لەڕووی گرنگی یەوە ھەردووك لەیەك ئاست دانـین، چـونکە ھەردووکیشـیان بەقەد یەك گرنگ نینن لەزماندا.فرەواتا لـەزمان دا زۆر گرنگـە بـە تایبـەتی لـەبواری فەرھـەنگکاری بۆیـە ئەگـەر فرەواتـایی نـەبێت دەبێـت بـۆ ھـەموو واتایـەك وشـەیەك ھـەبێت.(١٦)، پرۆسێسـەی دانـانی فەرھـەنگ لەلایـەك و فێربـوونی زمـانی ئـاوا گـران دەکـات، ھـەر چـی ھاوبێـژە ھـەر وەك پێشـوو باسمان کرد، ھێندە پێویست نی یە لەزماندا ھەبێت.

## پوختەی باسەکە

لەم باسەدا چەند ئارمانجێکی گرینگ پێکراون لەوانە:

١ـ ئەگەر فرەواتا و ھاوبێژی لە ئاستی فۆنەتیکی دا وەك یـەك بـن ئـەوا لەواتا لەیەك جیاوازن.

٢ـ بوونی فرەواتا لە زمان دا زۆر پێویستە هەرچی هاوبێژی یە بەقەد فرەواتا بوونی گرنگ نیە.

٣ـ چەند رێسایەك هەن بۆ جیاکردنەوەی فرەواتا و هاوبێژی.

٤ـ دەق دەوری سەرەکی دەبینی لەلادانی لێڵی لەو وشەو فرێز و رستانەی هاوبێژی یان فرەواتا پێکدەهێنن.

## Cryllic Alphabet
## ئەلفبێی سلاڤی

ئەلفبێی سلاڤی یان کریلیکی زیاتر ئەلفبێیەکی ئایدیۆلۆژیە .ئەو ئەلفبێیە لە لایەن سێینت کریلیك و میتۆدس لە سەدەی نۆزدەهەم بۆ قسەکەرانی سلاڤی ئەرسەدۆکسی رۆژهەلاتی لە رێنووسی زمانی یۆنانی داهێنرا. پاش کودەتای ١٩١٧ کۆمۆنیستەکان دەیانویست ئەلفبێی سلاڤی ببێتە کۆکەرەوەی شیوعیەکان بە تایبەتی شیوعیەکانی شورەوی .ئەو ئەلفبێیە لە سۆڤیەت و ئەوروپای رۆژهەلاتی باوی هەبوو.پاش هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆمۆنیستی لە سۆڤیەت و ئەوروپای رۆژهەلاتی ، تورکە عەلمانییەکانی تورکیا دەیانویست هەر شەش کۆماری سۆڤیەتی پێشوو تەبەنی لاتینی بکەن ، چونکە وا زەنیان دەبرد ئەلفبێی لاتینی دەبێتە کۆکەرەوەی تورك و تورکمانەکانی جیهان.

## Cultic
## ماڵباتە زمانی کەلتی

لە بنەڕەتدا ماڵباتە زمانی کەلتی زمانی هیندۆئەورووپین لە لایەن کۆمەڵە نەتەوەیەکی ئەورووپی قسەی پێدەکرا کە لە سەدەی پێنجی بەر لە میلاد لە

باشووری ڕۆژئاوای ئەوروپا کۆچیان کرد.کەلتیەکان لە سەرانسەری ئەوروپا بلاوبوونەوە بە شێوەی زنجیرە شەپۆلێك هەتا گەیشتنە دەریای ڕەش و ئاسیای بچووك ، باشووری ڕۆژئاوای ئیسپانیا ، ناوەندی ئیتالیا هەروەها بەریتانیا.

ئەمڕۆ هێشتا زیاتر لە یەك ملیۆن کەس ماون کە بە کەلتی قسەدەکەن.

## Czech
## چیك

زمانی چیك لە ماوەی بالادەستی کۆمۆنیستی لەگەڵ زمانی سلۆڤاك زمانی بالا بوون لە کۆماری چکسلۆڤاکیا ، بەلام لە دوای دوور خستنەوەی سیستەم و خێوی کۆمۆنیستی لە ولاتدا ولاتی چکسلۆڤاکیا بە ئاشتی بوونە دوو دەوڵەت.

زمانی چیك ئەندامە لە گروپە زمانی سلاڤی ڕۆژئاوا، ئەو زمانە لە کۆماری چیك زمانی ڕەسمیە .ئەو زمانە نزیکەی پازدە ملیۆن قسەکەری هەیە.جگە لە کۆماری چیك، لە ئەمریکا و کەنەدا و سلۆڤاك ئاخێوەری هەیە.

# پیتی D

## DA discourse Analysis
### شرۆڤەکردنی ئاخاوتن

شرۆڤەکردنی ئاخاوتن توێژینەوەیەکە ئیش لە سەر دەقی درێژی زمان دەکات نەك تەنیا ڕستەیەك –ڕایەڵە کشاوەکانی زمان بەشێك لەو دیراسە زمانەوانیە پێکدەهێنێت.ئەو جۆرە توێژینەوەیە کار لە سەر کەشفکردن و دیراسەی ئەو پێکهاتە گشتیانەی وەك بیرۆکەی گفتوگۆ ، ئارگومێنت، گێرانەوە ، نوکتە دەکات.

## Danish
### زمانی دانی –دانیمارکی

زمانێکی جێرمانی باکوورە و ئەندامی گروپە زمانی ڕۆژهەلاّتی ئیسکەندنافیە لە لایەن پێنج ملیۆن خەڵك زیاتر لە دانیمارك هەروەها خەڵك لە فارۆ و دورگەی گرینلاند قسەی پێدەکرێت.ئەو زمانە هەتا لە نەرویژ و سوید فەهم دەکرێت هەروەها دەوترێ زمانی بۆکماڵ-ی نەرویژ لەو زمانە وەرگیراوە.

## Dead language
### زمانی مردوو

زمان وەك مرۆڤ وایە سەردەمی زێرینی هەیە هەروەها سەردەمی هەرەسی هەیە.مەبەستی تر لە زمانی مردوو بریتیە لەو زمانەی چی تر لە هۆكارە ڕۆژانە سروشتیەكان لە كۆمەڵگای زمانەوانی ناو كۆمەڵگا بە كارنایەت. یۆنسكۆ سالآنە باس لە مردنی زمانێك دەكات |. بە ڕای من چۆن سەرەتا یەك زمان هەبووە هەروەها مرۆڤایەتی بەرەو یەك زمانی هەنگاو داوێت ئەویش بە نەمانی مرۆڤ نامێنێت . زمانی مردوو زۆرن لە نێو ئەو هەموو لاتینی و ئاڤێستا و پەهلەوی لە نێو كۆمەڵگای كوردی زۆر بە ناوبانگن.

## Deep structure
### ئاستی ژێرەوە-پێكهاتەی ژێرەوە

بە پێی ڕێزمانی گوێزانەوەی چۆمسكی هەر ڕستەیەكی زمان ئاستی ژێرەوە و سەرەوەی هەیە. ئاستی ژێرەوە لایەنی ئەبستراكتی نواندنی ڕستەیە هەروەها ئەو لایەنەی ڕستە هەڵگری واتای ڕستەیە .دەكرێ ڕستەیەك یەك ئاستی ژێرەوەی هەبێت و چەندەها ئاستی سەرەوەی هەبێت هەروەها ئەو ڕستانەی لێڵی دەنوێنن دەكرێ چەند ئاستێكی ژێرەوەی هەبێت.

## Deixis
### دایەكسیس

دایەكسیس كاتیگۆریەكی ڕێزمانیە پەیوەستە بە ژێدەری ڕاستەخۆ بۆ ئەو ئەدگارانەی قسە لە سەر شوێنی ئاخاوتن دەكەن .مانای ئاخاوتنی دایەكسیسی

پەیوەندی بە ڕەوشی بەکارهێنانەوە هەیە. بۆ شرۆڤەکردنی ڕاناوی من و تۆ بە پێی شوێنەکانیان دەگۆڕێن:

– من نامەم بۆ تۆ نووسی. من بکەرە ، تۆ بەرکاری بەیاریدەیە

-تۆ نامەت بۆ من نووسی. تۆ بکەرە ، من بەرکاری بە یاریدەیە.

## Deletion

## سڕینەوە

لابردن یان سڕینەوەی بێگۆڕینی واتا بە تایبەتی لە ڕستەی بەستراو هەبوونی فرەیە ، زۆربەی ڕەگەزە هاوبەشەکانی هەردوو ڕستە بەستراوەکەی دەگرێتەوە وەك ناو و کردار و ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار.

## Demonstrative

## ئاماژە –نیشانە

فۆرمێکە کە ئەرکی سەرەکی بریتیە لە جیاکردنەوەی ئایتمێك لە ئایتمێکی تری هەمان پۆل ، لە کوردیدا ئەم ، ئەو دوو ئاماژەی سەرەکین. جاران بۆ جیاکردنەوەی ڕاناوی نیشانە و ئاوەڵناوی نیشانە ئەوەیە ،ئەگەر پاش ئاماژەکە ناو هات ئەوە ئاوەڵناوی نیشانەیە ، وەك

-ئەو هات.

ئەو کتێبە بخوێنەوە.

بەڵام بەپێی پرانسیپەکانی زمانەوانی نوێ لە هیچ بوارێکدا ئاوەڵناوی نیشانە نییە.

## Denmark

### دینمارك

لەو ولاّتە ئەسکەندناڤیە هەموو تاکێکی دانیمارکی زمانی دانی- دانیمارکی دەزانێت.زمانی دانیمارکی بە شێوەیەکە لە نەرویژ و سوید مەفهومە.جگە لە دانیمارکی ، زمانی فارۆ و ئەلمانی و ئینگلیزی هەیە.

## Dental

### ددانی

دەنگەکان لە هەموو زمانێك وەك یەك نیین ، پرۆسەی ددانی بریتیە لە وەسف کردنی دەنگێکی نابزوێن کە بە هۆی پەیوەندیکردنی نێوان سەری زمان یان تیغی زمان سەرەوەی ددانی برندە دروستدەبێت. دەنگی ت لە کوردیدا ددانییە ، بەلاّم لە ئینگلیزیدا ئەلڤیولەرە.

## Derivation

### دارێژراو

پرۆسەیەکە تایبەت بە دروستکردنی وشەی نویٚ لە زماندا ، کەواتە دارِژتنی وشەی نویٚ بەشێکی سەرەکی رۆنانی وشە بە هۆی پاشگرەوە پێکدەهێنێت .بەزۆری وا رِێکدەکەویٚ کە پاشگرەکە بە تەنیا واتایەکی نەبێت ، بەلاّم کە بۆ لێکسیکۆنەکە زیاد دەکرێت واتایەك دەبەخشی.کەواتە پاشگری دارێژراو رِۆلێکی گرینگ دەبینێت لە دروستکردنی وشەی تر لە زماندا.

## Derivational morphology
## وشەسازی دارێژراوی

پرۆسەیەکی زمانەوانییە هەروەها لقێکە لە وشەسازی کە تایبەتە بە رۆنانی وشەوە .ئەو پرۆسەیە کار لە سەر ئەوە دەکات کە چۆن وشەی نویّ لە هاوکێشەی دارژتن : وشە +پاشگر پەیدا دەبێت .

## Descriptive grammar
## ڕێزمانی وەصفی

وشەی وەصفی لە چل و پەنجاکان لە ئەوروپا وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر ڕێزمانی عەقڵی ڕێزماننووس و زمانەوانی مێژوویی پەیدا بوو .ئەو دوو جۆرە ڕێزمانە کاریان لە سەر خودی زمان نەدەکرد ، بەڵکو زمانی لاتینی و فاکتەری مێژوو پارچە نووسینکی نوسەرێکی ناوداریان دەکردە بنچینە ، نەك زمان خۆی.لە ئەمریکادا وشەی وەصفی بەرانبەر وشەی سینکرۆنی تەماشادەکرد دژ بە تەیاری ڕێزمانی دەستووری و ڕەچەتەئامێزی.

## Devanagari
## ڕێنووسی دیڤانگری

**ئەو جۆرە ڕێنووسە ڕێنووسی هەموو زمانە نویّ و کۆنەکانی هیندستانە.**

ئەو جۆرە دیڤاناگاریە ئەلفبێیەکە بۆ نووسینەوەی زمانی سانسکریتی و زمانی هیندی و زمانی دی هیندی .ناوەکە لە زمانی سانسکریتی سەرچاوەی کردووە.کریستال باوەڕی وایە ئەو کۆمەڵە زمانەی بەو ئەلفبێیە دەنووسن زیاتر لە ٢٠ زمانن ناسراون بە زمانەکانی باشوور و رۆژهەلاّتی هیند.

## Developmental linguistics
## زمانەوانی پەرەسەندوو

لقێکە لە زمانەوانی گشتی تایبەتە بە دیراسەکردنی چۆنیەتی زمان لای منداڵ هەروەها لای هەندێ زمانەوان واتای قۆناغەکانی زمان لای مرۆڤ دەگەیەنێت.

## Deviance
## لادان

بریتیە لە پابەندنەبوون بە یاساکانی رێزمانی زمانەکە، جا ئەو لادانە لە پێکهاتەی ڕیزبەندی وشەکانی زمانەکە لە رستەدا : چوو ئازاد بۆ بازاڕ.
لادانی سیمانتیکی هەیە کە لەگەڵ ئاوەزی مرۆڤی ئاسایی ناگونجێت شاعیر بۆ جوانی ، عەبەسیەت ، لادان لە باو بەکاریدەهێنێت.

## Diachronic linguistics
## زمانەوانی مێژوویی

هەرچی پرۆسەی زمانەوانی هەیە لە ئەوروپادا پێش هاتنی دی سۆسێر بۆ ناو زمانەوانی دەکرێ بە فیلۆلۆژی بەراورد دابندرێ ، چونکە ئەوسا زمانەوانی بریتی بوو لە دیراسەکردنی زمان لە خاڵێکی رابردوو بۆیە ئەو جۆرە هەوڵە ناسرابوو بە زمانەوانی مێژوویی .دی سۆسێر باوەڕی وابوو کە زمان سیستەمە هەروەها باوەڕی وابوو کە زمانەکان دەکرێ لە نووختەیەکی دیارکراو دیراسە بکرێت بەبێ گوێدانە ئەوەی کە ئەو زمانانە لە رابردوو چ گۆڕانکاریەکی بەسەر هاتووە.

## Historical linguistics
## زمانەوانی میژوویی

ئەو جۆرە زمانەوانییە ناوێکی ترە بۆ زمانەوانی دایکرۆنی. بروانە سەرەوە.

## Dialect
## دایەلێکت –زار

دایەلێکت شێوەی زمانە یان رێکتر دەتوانین بڵێین لە کۆمەڵگای کوردی زیاتر زاری ناوچەیی هەیە و هەرچی زاری کۆمەلآیەتیە زۆر دەگمەنە.وەك زمانەوانێك باوەڕمان بە پۆڵینی زمان و دایەلێکت نییە ، چونکە ئەو پۆڵینە زیاتر سیاسیە لەوەی زمانەوانی بێت.باکگراوەندی کۆمەلآیەتی ئاخێو یان ئەدگاری زمانی ئاخێو دوو دیاردەی زمانی گوند و زمانی شار لەیەك جیادەکاتەوە.

## Dialect atlas
## ئەتلەسی دایەلێکت

ئەتلەسی دایەلێکت بریتیە لە نەخشەیەك یان زنجیرە نەخشەیەك زانیاری دەربارەی دایەلێکت لە ناوچەیەکی جیۆگرافی دەبەخشێت هەروەها یەکەم نەخشەی زمانەوانی لە ئەوروپادا ساڵی ١٨٨١ لە ئەلمانیا دەرکەوت دەربارەی دایەلێکتی لۆکەلی.

## Dialect continuum
## بەردەوامی دایەلێکت

بریتیە لەوەی زنجیرە دایەلێکتێك لە ناوچەیەکی جیۆگرافی قسەیان پێ بکرێت هەروەها ناسراوە بە زنجیرە دایەلێکت، لە هەر نووختەیەکی زنجیرەکە ئاخێوەرانی دایەلێکتێك دەتوانن لە ئاخێوەرانی دایەلێکتی تر نزیك بە خۆیان بگەن ، بەلاّم ئەگەر لەیەك دوور بوون ئەوا پرۆسەی لە یەکدی گەیشتن دژوار یان نامومکین دەبێت

## Dialect geography
## جیۆگرافیای دایەلێکت

بریتیە لە دیراسەکردنی جیاوازیەکانی ئاخاوتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەنێو یەك ناوچە کە زمانەکە قسەی پێدەکرێت.

## Dialect mixture
## ئاوێتەبوونی دایەلێکتی

بریتیە لە حازربوونی فۆرمی ئاخاوتنێك کە هەڵگری چەند تایبەتمەندیەکی بێت و رەنگدانەوەی ئەو ئەدگارانە بێ لەو دایەلیکتە جیاوازانەی ناو مێژوو.

## Dialectology
## دایەلێکتناسی

زارناسی دیراسەیەکە لە زار دەکۆڵێتەوە بە تایبەتی زاری ناوچەیی بۆیە هەندێ جار بە جیۆگرافیای زار یان زمانەوانی جیۆگرافی دەناسرێت.

## Dialectometry
## سەرژمێریی دایەلێکتی

بریتیە لە میتۆدێکی ستاتیستیکی بۆ شرۆڤەکردنی دایەلێکت.ئەو میتۆدە کار لە سەر پێوانی دووری زمانەوانی نێوان شوێنەکانی تاك لە ناوچەی دایەلێکتەکە دەکات بە پشتبەستن بە ژمارەی جیاوازیە ناکۆکەکان لە سامپلی ئەدگارە زمانەوانیەکان.لەو میتۆدەدا دەردەکەوێ کە هەندێ دایەلێکت زۆر نزیکن لە یەکەوە وە هەندێ دایەلێکتی تر زۆر لە یەك جیاواز و دوورن لە یەکترەوە.

## Dialogue
## دایەلۆگ

## Diglossia
## دیگلۆسیا

بریتیە لە رەوشی زمانەوانی کۆمەڵگایەك کە دوو فۆرمی جیاوازی هەمان زمان بەکاردەهێنن، کە یەکێ لەو فۆرمانە لە پەروەردە تاك بەدەستی هێناوە وە ئەوی دی پێش قۆناغی چوونە پەروەردە بەدەستی هێناوە،بۆنموونە ئەو ئەڵمانانەی بە سویسی قسەدەکەن لە سویسرا کۆمەڵگایەکی دیگلۆسی پێدەهێنن .لەوێ شێوە جیاوازەکانی ئەڵمانی بریتین لە ستاندەری ئەڵمانی و فۆرمە لۆکەلەکانی ئەڵمانی سویسری.

لە نێو کۆمەڵگای دیگلۆسی شێواز و جۆری زمان وەك فاکتەرێکە بۆ جیاکردنەوەی چینی کۆمەلایەتی : زمانی فیتەر و زمانی دکتۆر!

## Diminutive

## ناوی بچووککراوە

فۆرمێکە بە زۆری بەهۆی هەبوونی پاشگرێك گوزارشتی لێدەکرێت بە شێوەیەکی گشتی واتای بچووك دەدات.هەروەها لە زمانی کوردی بۆ دوو جۆری تر بەکاردەهێنرێ:

١.نازکێشان :نازێ ٢.شکاندن :ژەشێ

## Ding-dong theory

## تیۆری دینگ-دۆنگ

ئەم تیۆرە یەکێکە لەو تیۆرە ئەندێشە ئامێزانە دەربارەی بنەچەی زمان بە کورتی گومانی ئەوە دەبات کە ئاخاوتن وەك کاردانەوەیەکی مرۆڤ بۆ دەوروبەر پەیدابووە.

## Diphthong

## سێبزوێنی

لە برگەیەك سێ دەنگی بزوێن لە دوای یەك هەبێت.

## Direct method

## میتۆدی ڕاستەوخۆ

ئەم میتۆدە میتۆدێکە دەربارەی وتنەوەی زمان کە تێیدا تەنها قوتابی لە زمانی ئارمانج لە پۆلدا قسە دەکات.مامۆستا پەیوەندی بە ئاماژە بە شێوازێکی ڕاستەوخۆ بە قوتابیان دەکات .

## Disyllable

یەکەیەکی زمانەوانییە بە تایبەتی وشە کە لە دوو برگە پێکهاتبێ،کەواتە وشەکە دوو بزوێنی دەنگیی هەیە.

## Double articulation

**ئافراندنی دوو سەرە**

ئەو جۆرە ئافراندنە بە دوالیتی پێکهاتە ناسراوە، ئەدگارێکی پێشنیازکراوی زمانی مرۆڤ کە زمان وا دەبینیٚ کە لە روو پێکهاتەوە دوو ئاستی ئەبستراکتی هەیە: لە ئاستێکدا زمان وا شرۆڤە دەکرێت کە کۆمەڵێك یەکەی واتادارن وەك وشە لە رستەدا ، لە ئاستی دووەمدا وا شرۆڤە دەکریٚ کە زمان بریتیە لە ریزبەندی بەشی فۆنۆلۆژی هەندیٚ وشە کە مانایان نییە.گوزارشتی رووخساریی ، ئاماژە ، سیستەمی ئاخاوتنی ئاژەڵ دەوتریٚ کە دوالیتی پێکهاتەییان نییە.

## Double negative

**دوو نەفی**

هەبوونی دوو نەفی لە ڕستەیکدا واتای ئەرێنی دەگەیەنێت.ستاندەری ئینگلیزی ئەو پێکهاتەیە بەشتێکی نا-پەروەردەیی دەزانێت:

-ئازاد هیچی بە نەوزاد نەدا.

## Drum language

**زمانی دمبك**

بریتیە لە بەکارهێنانی دمبك بۆ پیشاندنی رواڵەتی ئەدگارە هەڵبژێردراوەکانی ئاخاوتن بە تایبەتی رەزم و تۆن.

## Dynamic linguistics
### زمانەوانی داینیمیکی

وشەی داینیمیکی ئاماژەیە بۆ ئەو ڕێگایەی کە ئەدگاریێکی زمانەوانی تایبەت لە کۆمەڵگای ئاخاوتنیدا بە ئاراستەی جیاواز لە ئەندازە و خێرایی جیاوازدا دەسوڕێتەوە لەو ڕێگایەدا کاریگەر دەبێت بە فاکتەری سێکس و تەمەن و چین.

## Dysathria
### دیساسریا

پەشێویەکی ئاخاوتنی هەسبزوێنە کە وا لە تاك دەکات کە نەشێت دەنگێکی ئاخاوتن بەرهەم بهێنێت .ئەو پەشێویە دەماریە بە هۆی تێکچوونی سیستەمی بووە کە بە ئەناسریا ناسراوە.ئەو پەشێویە لەوانەیە کاریگەری هەبێت لە سەر هەر بەشێکی ناوچەی دەنگیی وە هەر لایەنێکی بەرهەمهێنانی دەنگی ئاخاوتن.

## Dysgraphia
### دیسگرافیا

هەر پەشێویەك ببتە هۆی ئەوەی تاك نەتوانێت بنووسێت ئەوا ئەو پەشێویە پەیوەستە بە توانای نووسین.

## Dyslexia
### دیسلێکسیا

بریتیە لە ئاژاوەیەکی مکوڕ لە شیان بۆ خوێندن.زاراوەکە بۆ هەردوو جۆر بەکاردێت : یەکەم ، باڵغی خوێنەوار کە توانای خوێندنەوە لە دەستداوە پاش

برینداربوونی مێشك.دووەم ، ئەو منداڵانەی کە ڕووبەڕووی دژواری تایبەت بوونە کە هەوڵدەدەن بخوێننەوە لە کاتی غیابی برینداری مێشك.

## Dysphemism

**دیسفێمیزم**

بەکارهێنانی تاوان لە ئاخاوتندا لە جیاتی بەکارهێنانی قسەی خۆش و قسەی بێلایەنی .پەیامبەر لە خۆڕا نالێت قسەی خۆش صەدەقەیە، قسەی خۆش پەیوەندی بە دەروونی مرۆڤ و کەسایەتیە کۆمەلآیەتیەکە هەیە.

## Dysphonia

**دیسفۆنیا**

لە دەستدانی توانای بەکارهێنانی ژێیە دەنگیەکان بۆ بەرهەمهێنانی دەنگی نۆرمەڵ.

## Dysprosody

**دیسپرۆسۆدی**

لە دەستدانی توانا بۆ بەرهەمهێنانی ئاخاوتن لەگەڵ ئاواز و بەرزی دەنگ و ریزم.

## Dysrhymia

**دیسریمیا**

بریتیە لە دژواری ریزمی بە تەنیا پێی دەگوترێ دیسریمیا. دیسپرۆسۆدی و دیسریمیا دوو زاراوەن لە کۆنتێکستی زمانەوانی کلینیکی بەکاردێن.

## پیتی E

## Early adopter
### زوو وەرگر

یەکێك لە یەکەم کەسانێك کە وشەی وەرگیراویان لە زمانی دی وەرگرتووە.

## Ear training
### مەشقی گوێ

تەکنیکێکە لە فونەتیکدا کە هەوڵدەدات گوێ وەها ڕابینێت بۆ ناساندنەوەی دەنگەکانی ئاخاوتن.بێگومان ئەو چالاکیە لە نمایشکردن دەردەکەوێت ، ئەویش بریتیە لە کۆنترۆلکردنی جولەی ئۆرگانە دەنگیەکانی ئەو دەنگانە بەرهەمدەهێنن.

## Echo
### زایەڵە-سەدا-دەنگدانەوە

جۆرێکە لە ڕستە کە چەند جارێك هەمووی یان بەشێکی دووبارە دەکرێتەوە، ئەوەی وترا لە لایەن ئاخێوێکی تر.

## Educational linguistics

### زمانەوانی پەروەردەیی

بەکارهێنانی بنەماکانی زمانەوانی لە هەردوو پرۆسەی وانەوتنەوە و وانەوەرگرتن. چوونی زمانەوانی بۆ ناو قەڵەمڕەوی پەروەردە خۆی خۆیدا جۆرێکە لە زمانەوانی پێداگۆجی.

## Egypt

### زمانی مصری

مصر گەورەترین وڵاتی عەرەب نشینە لە کیشوەری ئەفریقیا. زمانی ڕەسمی وڵات عەرەبیە.لە سەدا ٨٥ بە زمانی عەرەبی –شێوەی مصری – قسە دەکەن.بێجگە لە زمانی عەرەبی زمانی تریش هەن وەك دۆماری-زمانی موسلمانە قەرەجەکان-ئارمێنی یۆنانی و قیپتی.......................

## Eloborated code

### کۆدی ورد و ئاڵۆز

ئەو کۆدە تا ڕێژەیەکی زۆر ڕواڵەتیە . کۆد ئاڵۆزی بریتیە لە بەکارهێنانی پەروەردەیی زمان یان ئەو مەسەلەیە زنجیرە و پلەیەکی فراوانی سترەکچەری زمانەوانی دەگرێتەوە کە پێچەوانەی چەمکی کۆدی سنوودارە کە زنجیرەیەکی سنووورداری پێکهاتە پیشاندەدات.

## Elicitation
### وەرگرتن

میتۆدێکە لە بارەی وەرگرتنی زانیاریەکی زمانەوانی متمانەکراو لە خەڵك.ئەو وەرگرتنە دوو جۆری هەیە وەرگرتنی ڕاستەوخۆ و وەرگرتنی نا ڕاستەوخۆ.

## Elision
### پەڕاندنی تیپە بزوێن یا بڕگەی وشەیەك لە بێژاندا

. کەواتە کرتاندن بریتیە لە کرتاندنی دەنگەکان ، بڕگەکان یان وشەی ئاخاوتن.لە لایەکی دی کرتاندن بریتیە لە ئەدگارێکی سروشتی و خۆلێدوورنەگری ئاخاوتنێکی نافۆرمەل.ئەو جۆرە ئاخاوتنە بە ئاخاوتنێکی تەمبەڵ دادەنرێت لە لایەن رەخنەگرانی پەتی.

## Ellipsis
### کرتاندن-سڕینەوە

بریتیە لە لابردنی چەند پێکهاتەیەك لە رستەدا بە ئامانجی ئابووری ، جەختکردن، یان شێواز .لە ڕستەی بەستراودا بە بەستێنەر ڕەگەزە وەکیەکەکان وەك کردار ، بکەر ، ئاوەڵناو.....دەسڕێنەوە.

## Elocution
### هونەری وتاردان

هونەری ئاخاوتن بەوە مەشق بکرێ بۆ ئاخاوتنی گشتی.

## Elt:English language Teaching
## وتنەوەی زمانی ئینگلیزی

## Emotive language
## زمانی سۆز دەربڕین

ئەو زمانەیە کە ئەرکی سەرەکی بریتیە لە گوزارشتکردن لە سۆزدەربڕین.سوێندخواردن جوانترین وێنەی دیاری زمانی سۆز دەربڕین.

## Empty word
## وشەی بەتاڵ

بڕوانە مۆرفیمی بەتاڵ لەوێ بەدرێژی قسەی لە سەر وشەی بەتاڵکراوە.

## Endoglossic
## ئێندۆگلۆسیك

ئێندۆگلۆسیك بریتیە لە وەسفکردنی زمانێك بە تایبەتی زمانی نەتەوە کە زمانی خەڵکانێکە لە دەڤەرێکی جیوگرافی ، بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی زمانی ئوسترالی و ئینگلیزەکانە بەلاّم زمانی کیوبیکی کەندا و سنگافورە نییە.

## Endophora
## ئێندۆفۆرا

ئێندۆفۆرا بریتیە لە پەیوەندیەکانی کۆهیژن کە یارمەتی دەدەن بۆ پێناسەکردنی سترەکچەری تێکست ئەو حاڵەتە بە ئانافۆرا و کاتافۆرا پۆلێن دەکرێت.

## Enigma
## ئینیگما

ئینگما بریتیە لە پرۆسەی لە بیربردنەوەی زمان بەئەنقەست هەروەها ئینگما وشەبازیەکە لە شیعردا فۆرمی مەتەڵ وەردەگرێت .ئینگما لە سەدەی ١٨ و ١٩ زۆر بلاّوبوو، بەلاّم ئێستا تەنها لە شیعری تەقلیدی مندالآن دەبیسرێ.

## Entailment
## گرتنەخۆ

گرتنەخۆ پەیوەندیەکی سیمانتیکی نێوان دوو ڕستەیە .ڕاستبوونی ڕستەی دووەم لە ڕستەی یەکەمەوە سەرچاوە دەگرێت ، ئەو نموونەی خوارەوە رەوشەکە ڕووندەکاتەوە

-من پشیلەیەکم بینی.
-من گیانەوەرێکم بینی
پشیلە گیانەوەرە.

## Epiglottis
## ئێپیگلۆتیس

ئێپیگلۆتیس سترەکچەری ئەناتۆمیە کە قوورگ لە کاتی قووتدان دادەخات.لە ئاخاوتندا بە دەنگ دروستکەرێکی چالاك هەرچەندە بەشداری دەکات لە بەرهەمهێنانی تریل-لەرینەوە.

## Epigram

### ئێپیگرام

بەیان یان ئاخاوتنێکی کورتی پڕ حیکمەتە لە قەسیدە یان لە پەخشان.

## Epigraph

### ئێپیگراف

## Epitaph

### ئێپیتاف

نووسینی سەر بەردی گۆڕ-کێلً-هەروەها سەر مۆنیۆمێنت.

## Eponym

### ئێپۆنیم

ناوی کەسێکە پاش داهێنان وەك ناوی هاملێت هەروەها ناوی شوێن وەك ناوی ڕووسیا ، ئەمریکا.....

## Error Analisis

### شرۆڤەکردنی هەڵە

ئەو بابەتە لە وتنەوە و فێربوونی زماندا قسەی لە سەر دەکرێت ، دیراسەی ئەو ڕەوشە نا مەقبولەی لە پرۆسەی فێربوونی زماندا هەیە ، شرۆڤەی هەڵە بە پرۆسەیەکی سیستیماتیکی دادەنرێت چونکە زانیاری مرۆڤ لە لایەك سنووردارە ، ناتەواوە لە لایەکی دی بە پێی پرینسیپەکانی پێرفۆرمەنس مرۆ هەتا لە زمانی نەتەوەیی هەڵە دەکات چ جای زمانی دووەم و زمانی بیانی.

## Ethnography of speaking
## ئێسنۆگرافی ئاخاوتن

بۆچوونێکە لە ناو زمانەوانی ئینسرۆپۆلۆژی کە وەك دامودەزگایەکی کۆمەڵایەتی تەماشای زمان-ئاخاوتن دەکات ئەو رەوشەی ئاخاوتن بە تەکنیکی ئەسنۆگرافی دیراسەدەکرێ.

## Ethnolinguistics
## زمنەوانی ئەتنیکی

زمانەوانی ئەتنیکی بریتیە لە توێژینەوە لە زماندا بە ئاماژەکردن بە لا یەنی کەلتوری کۆنتێکست .زاراوەکە بابەتی ئەنسرۆپۆلۆژی و ئیسنۆگرافی بۆچوونەکان بۆ زمان دەگرێتەخۆ.

## Ethnosemantics
## سیمانتیکی ئەتنیکی

بریتیە لە دیراسەکردنی واتای گوزارشتی زمانەوانی بە ئاماژەکردنی تایبەت بە کەلتورەکانی ناوخۆیی .ئەو بۆچوونە لە شەستەکانی سەدەی بیستەم لە لایەن ئەو مرۆناسانەی لە بواری زانستی ئەتنیکی کاریان دەکرد.

## Etymology
## ئیتیمۆلۆژی-گەڕانەوە بۆ بنەچە

ئەو زانستە بریتیە لە لێکۆڵینەوە لە بنەچە و مێژووی فۆرم و مانای وشەکان.

## Euphemism

### یوفیزم

یوفیزم بریتیە لە بەکارهێنانی لایەنی لێڵ و ناڕاستەوخۆی زمان و ئەو دەستەواژانەی لە بریتی ئەوانەی وا زەن دەبردرا کە گوزارشتی شتی ناخۆش دەکەن.دەستەواژەی یوفیزم بریتین لەو دەستەواژانەی لە بریتی هەندێ وشەی تەعبیر لە ئەرکی جەستەیی دەکەن یان ئەو قسە و ئاماژەنانەی بە وشەی ناخۆشی وەك مەرگ ، سێکسکردنی ناشەرعی دەکەن.

## Extralinguistic

### زمانەوانی زێدە-دەرەوەی زمان

پرۆسەکە قسەکردنە لە سەر شتانێك کە دەرەوەی زمانن ، بەڵام ئەو شتانەی ناو جیهان بە ناڕاستەوخۆ پەیوەستن بە زمانەوە ، بۆیە ئەو شتە پەیوەستن بە ئاخاوتن دەکرێ وەك گوزارشتی دەموچاوی و شتانی جەستەیی ئامێز ئاماژەیان پێبکرێ.

## Eye dialect

### ئای دایەلێکت

ئای دایەلێکت بریتیە لە ڕێنووسکردنی هەندێ وشە بە پێی دەستووری ناوچەکە ، کەواتە خاڵی بنەڕەتی لە ئای دایەلێکت بریتیە لە دوورخستنەوەی زمانی ستاندەر لە خوێندنەوەی زمانی ناوچەیی هەروەها لە ڕێنووسکردنی ناوچەیی خوێندنەوەی ناوچەیی دروستدەبێت.

## Eye rhyme
## ئای رایم-قافیەی ڕواڵەتی

ئەو دیاردەیە زیاتر لەو زمانانە دەردەکەوێت کە ڕێنووس و خوێندنەوەیان جودایە وەك زمانی ئینگلیزی|.کەواتە خودی مەسەلەکە ئەوەیە کە دوو وشە لە ڕواڵەتدا خۆیان واپیشاندەدەن کە هەمان قافیەیان هەیە کەچی لە سەر ئاستی خوێندنەوە خۆیا دەبێ کە ئەو جووتە وشەیە دوو خوێندنەوەی جیایان هەیە ، وەك:

Come--------------home
Love--------------prove

# پیتی F

## Fabian society
## کۆمەڵگای فابیەن

کۆمەڵگای فابیەن کۆمەڵەیەکی سۆشیالیستی ئینگلیزیەساڵی ١٨٨٤ دامەزراوە.ئامانجی بنەرەتی ئەو کۆمەڵەیە دامەزراندنی سۆشیالیزم بوو لە ڕێگەی ئاشتیەوە ، نەك شۆڕش .ئەو کۆمەڵەیە جودا بوو لە بلۆکی سۆشیالیزمی مۆسکۆ کە باوەڕی بە شۆڕش هەبوو هەتا لەیەکهەڵوەشاوە .لە کۆمەڵگەی رۆژئاوایش نەتوانرا لە ڕێگەی ئاشتیەوە ، هەریەکە بە زمانی خۆی گوزارشت لە خۆی بکات ، سۆشیالیزم بەرپابکرێت، چونکە کۆمەڵگای رۆژئاوای بە پێچەوانەی سۆشیالیزمەوە لە سەر بە یەککگرتنی تاك دامەزراوە نەك دەوڵەت بە سەنتەر گرتن.

## Faeroese
## فارۆس

ناسراوە بە زمانی گێرمانی باکوور کە ئەندامە لە گروپە زمانی سکەندناڤی رۆژئاوا .ئەو دوورگەیە دەکەوێتە نێوان ئایسلاند و شێتلاندی دانمارکی هەروەها ئەو دوورگەیە کۆمەڵگایەکی سەربەخۆیە و فارۆس زمانی رەسمی ئەو کۆمەڵگایە لەگەڵ زمانی دانیمارکی لە خوێندن دەخوێنرێ.

## Falling tone
### ئاوازی بەرەو خوار

وەسفکردنی جوڵەی پیچ لە بەرزی ڕێژەکی بۆ نزمی ڕێژەکی لە بڕگەدا هەروەها تۆنی بەرەو خوار بە زۆری پەیوەندی بە پەیوەست بە نیگەرانی و گومان هەیە.

## False friends
### برادەری ناپاك

لە بواری زمانەوانی ئەو دەستەواژەیە بۆ ئەو وشانە بەکاردێت کە لە شەکڵدا بە یەك دەچن بەلام دەلالەت لە واتای جیاواز دەکەن . لە کوردیدا وەك ئەستێرەی کوژە وان.

## Family of languages
### خێزانە زمانیەکان

دوو زمان کە لە یەك سەرچاوە هاتبن. بە زمانە سەرچاوەیەکە پێیدەوترێت دایك و باوك ، دوو زمانەکەش پێیان دەوترێت کچە زمان چونکە هەردوو کچی ئەو دایك و باوکە .فیلۆلۆژی بەراورد بە زۆری کاری لە سەر دۆزینەوەی باوکە زمان دەکرد ، زۆربەی دیراسە زمانەوانیەکانیان جەختی لەوە دەکرد کە زمانی سانسکریتی باوکە زمانەکانی هێندۆئەوروپیە.خودی دوو زمانەکەش خوشکی یەکترن.

## Feedback
## فیدباك

فیدباك لە زمانەوانی بریتیە لەوەی کە نێنەر پەیامێك بۆ وەرگر دەنێرێت وەرگریش لە لای خۆیەوە پەیامەکە تەواو شیدەکاتەوە بۆ توانای نێنەر هەڵسەنگێنێت.

## Female language
## زمانی مێینە

فێمینیستەکانی رۆژئاوا هەوڵ دەدەن یەکسانی ئافرەت بە پیاو لە دنیای سەرمایەداریدا نەك هەر تەنیا بارگەواوی بکەن بە ئایدۆلۆژیاوە ، بەلکو لە پێکۆڵی ئەوەشدان ئەو کێشە کۆمەلآیەتیە بگوازنەوە ناو زمان .

لە رۆژهەلآتیش ، ئافرەتێکی وەك نەوال سەعداوی دەیەوێ کێشەی ئافرەتیش بگوازتەوە ناو پزیشکی و جورئەتی ئەوە دەکات تایتلی یەکێ لە کتێبەکانی بکاتە " مێینە ئەصل"-ە. بە واتای لە سەرەتای ئارێشەکە رەگێکی سیاسی هەیە.

لە زۆر دیراساتی زمانەوانی قسە لە سەر ئەوە کە زمانی مێینە ، زمانێکی جودایە لە زمانی پیاو .زمانی مێینە زمانێکی میانڕەوی سۆزداریە.فێمینیستەکان بە قسە پرۆستۆی ئەوە دەکەن ، کە بۆچی لە هەندێ زماندا ڕاناوی ئەو بۆ هەردوو سێکسی پیاو و ژن بەکاردێنن . بۆ گوزارشت لە بیرۆکەی خۆیاندا ، جورئەتی ئەوە دەکەن کە لە هۆی ڕاناوی ئەوی نێر بۆ زاتی خودا بەکاردێت . زاتی خودا ، پاکی بۆ خودا ، بە نێر دەبینن ، بۆیە بەرانبەر زاتی خودا ڕەقن ، هەروەك بەرانبەر پیاو-نێر ڕەقن و دۆست نین . مارکسیەکی

وەك ئەنجلز پیاو لە خێزان وەك چەوسێنەر دەبینێت. ئـەو دیتنـە هـەتا ململانێـی چینایەتییش دەبەزێنێت.ئـەو دکتاتۆریـەی لـە چـەمکی پرۆلیتاریـا دروسـت بـوو هـەمان دکتـاتۆری سـەرمایەداری و دکتـاتۆری عەسـكەریەكانی رۆژهـەلآت بـوو .ڕایەکەی ئەنجلز ململانێ لە نێو خودی ماڵبات دروستدەکات ، هەڵوەشـاندنەوەی ماڵبات باجی بەشێك لەو ڕایانەیە.

## سێکسی بایۆلۆژی و سێکسی ڕێزمانی

سێکسی بایۆلۆژی و سێکسی ڕێزمانی لە هەندێ حاڵەتدا وەك یەك بن ، ئـەوە واتای ئەوە نادات شتەکانی بونـەوەر لـە سـەر بنیـاتێکی سێکسـی پـۆلێنکراون ، بەڵکو ئەو دوو سێکسە لە زۆر حاڵەتدا تـەواو لـە یـەك جیـاوازن و لـە ڕوانگـەی زمانەوانیەوە گوزارشت لە یەکدی ناکەن:

سێکسی بایۆلۆژی لە زمانی ئینگلیزی تەواو جیـاوازە لـە سێکسـی ڕێزمـانی نێو هەندێ زماندا، جێندەری سروشتی لـە سـەر نێـر و مـێ دامـەزراوە ، کەچـی جێندەری ڕێزمانی لە سەر جێندەری ناو دامەزراوە و هیچ پەیوەندی بە سێکسەوە نییە.لە هەندێ زماندا هەر ناو هەڵگری سێکس نییە ، بەڵکو ئـامراز و ئاوەڵنـاو شێوەی جیاواز وەردەگرن هەتا بگونجێن لەگەڵ یەکتر:

-هذ ه وردة جميلة.

**لە نێوان هەرسێ وشە :ئامازە+ناو+ئاوەڵناو ڕێککەوتن هەیە.**

لە زمانی ئیسپانی دوو جێندەری ڕێزمانی هەیە ،نێر و مێ ،بەلآم لـە زمـانی ئەلمانی سـێ جێنـدەری ڕێزمـانی هەیـە ، نێـر و مـێ و بێلایـەن .لـەوە زیـاتریش

هەردوو زمان ئامرازی تایبەتیان هەیە.دەمانەوێ دووبارە جەخت لە سەر ئەوە بکەین ، کە جێندەری ڕێزمانی لە سەر سێکسی بایۆلۆژی دانەمەزراوە :

کچی گەنج لە زمانی ئەڵمانی ، لە ڕووی سێکسی سروشتیەوە مێیە،بەلاّم لە ڕووی جێندەری ڕێزمانیەوە بێ لایەنە و ئامرازی das لە پێش بەکاردێت.هەروەها لە زمانی فەرەنسیدا le livre -کتێب ، لە ڕووی بایەلۆژیەوە بێ لایەنە و لە ڕووی سێکسی ڕێزمانیەوە نێرە کەچی هەڵگری هیچ ئاماژەیەکی نێری هەڵناگرێت.

لە لکی سۆرانی کرمانجی ناوەڕاست جێندەر زۆر دەگمەنە ، بەلاّم لە لکی بادینی کرمانجی سەروو لە ڕووی سێکسی سروشتیەوە سێ سێکس هەیە :نێر ، مێ ، بێ لایەن ، بەلاّم سەبارەت بە هەندێ خزمایەتی نێر و مێ نەبێ ، زۆربەی ناوە بێ لایەنەکان وەك بەر ، کتێب ، ژوور...لە ڕووی جێندەری ڕێزمانیەوە نێرن یان مێ.

## زمانی مێینە و بیرۆکەی فێمینیزم

لەوەی سەرەوە دەرکەوت کە هەردوو جۆری جێندەر هیچ پەیوەندیان بە یەکەوە نییە. ئەو مەسەلە جێندەریە دەکرێتە پاساو بۆ هێرشکردنە سەر پایەکانی ئیسلام. لەم دواییە لە کەنالی ئێن ئار تی باس لە پەردەی کچێنی کرا بەوەی کچ و ژن هیچ جیاواز نین ئەوە عەقڵی کۆمەڵگایە ئەو جیاوازیە دروستدەکات! خۆی لە بنەڕەتدا ئەو ڕایە بۆ شکاندنی شکۆی کچی کوردە، ئەگەرنا هەمووان دەزانین ئەو هەنگاوە هەر بەزاندنی بایۆلۆژی جەستە نییە، بەڵکو شێواندنی کەلتوری کوردیە. دیتنی کچی کورد وەك ژنی کورد بەزاندنی هێڵی سووری ئایینی

کوردیە.

زۆربەی ئافرەتی ئیسلامی کورد ، ئەو شتانە هەموو دەربارەی بەلای فێمینیزم دەزانی، بەلام لە ژێر فشاری سیکیولەری کورد و بەبێ ئەوەی خۆی ناوی بنێت فێمینیزم ، وەك فێمینیستێکی سەرسەختانە کار دەکات. ئەو هەنگاوە پالی پێوەنام ئاماژە بە فیمینیستە موسلمانەکان بکەم بەوەی ئەو فێمینستە شوناس شاراوە بنەمای قورئان دەبەزێنن.

بابەتەکە هێندەی قسەکردنە لە سەر دیدی فیمینیستە موسلمانەکان ، قسەکردن نییە لە سەر جیهانبینی فیمینیستی دەرەوەی ئیسلام ، چونکە هەندێك بنەمای فیمینیستی رۆژئاوایی و رۆژهەلاتی هەڤدژن لەگەل پایەکانی باوەڕی موسلمانان وەك دیدی فیمینیزم بەرانبەر زاتی خودا هەروەها بەحوکمی ئەوەی فیمینیزم پەلداوێت بۆ وەسەنیەت و سوڕانەوە لە دۆزی تاك ڕەگەزی-مێیاتی..... ئەوە وامان لێدەکەن قسە لەو بوارە بە مینچەنراوە نەکەم!

لە لایەکی دی فیمینیستەکانی ناو پارتە عەلمانیەکان و دەرەوەی پارتە سیاسیەکان کەسانێکی چەپڕەوی پاشخان مارکسی یان کەسانی سیکیولەرن باوەڕیان بە پرانسیپەکانی قورئان نییە.ئەو فیمینیستانە وەك چەپڕەوەکانی کوردستانن ، کە ژمارە و قەبارەیان لە کورسیەکی پەرلەمانی کوردستان ڕەتناکەن.

## کێشەی ئافرەت و هەرسێ مارە مێژووە باشەکە

گومان لەوە دانییە کە چەمکی "کێشەی ئافرەت" سروشتی نییە ، بەلکو هەولێکی دەسکردی ڕۆژئاوایە بۆ هەلوەشاندنەوەی کۆمەلگای تەبا و ئارام . تێکدانی هارمۆنیەتی سروشتی نێوان نێر و مێ یەکێکە لە ستراتیژیەکانی

فیمینیزم ، ئەو وەهمە بۆتە بەشێك لە ستراتیژیەكانی فیمینیزمە موسلمانەكان. بەر لەوەی قسە لە سەر ئەوەبكەین ، كە ئاخۆ ئەو دەستەواژەیەی پێشوو گوزارشت لە ئیسلام دەكات؟

پێغەمبەری ئیسلام لە فەرمودەیەك دەفەرموێ :" باشترین سەردەم سەردەمی من بووە ، ئینجا سەردەمی تر (سەردەمی سەحابە) و سەردەمی تر (سەردەمی تابعین ئەوانەی بە دیتنی سەحابەیەك شادبوون)....." ئەو سێ ماوە زەمەنیە لە سەر ڕەزامەندی خودا و پێغەمبەرەكەی دروستبوون، ئەوانیش لە دادگەری خودا و پێغەمبەرەكەی ڕازیبوون . لەو سێ كۆمەڵگایە بە پاڵپشتی گوتاری ئیلاهی زاتی خودا، بەدەربوونە لە نادادگەری تاكەكانی هەروەها ئەو سێ كۆمەڵگایە وەك سەید قوتب ناویاندەنێت: "ئەوەی قورئانی بێهاوتا" هەروەها بەدەر لە هەبوونی كێشەیەك بە ناوی كێشەی ئافرەت. جا بۆ ئەوەی تەواو لە ماهیەتی هەردوو گوتاری قورئان و فەرموودەكە بگەین، پێویستە خوێندنەوەیەكی ڕەفتاری، نەك هەر تەنیا مەعریفی ڕووتی، قورئان بكەین، بەواتایەكی دی لەبری ئەوەندەی لە كۆمەڵگا فشار لە سەر تەجویدی قورئان دەكەین ، با ئیش لە سەر تەدەبوری قورئان بكەین و فاكتەری ئاكتیڤكردنی تاك و كۆمەڵگا فەراهەم بینین ، چونكە تەنیا بە تەدەبوری قورئان دەتوانین دادگەری ئیلاهی لە كۆمەڵگا دروستبكەین .كەواتە ئێمە فاكتەری هەبوونی كۆمەڵگای بێ كێشەی ئافرەتمان لە مێژووی ئیسلامیدا هەبووە و حەوجەی بەرنامە و پرۆگرامی ڕۆژئاوایی نیین.

## فیمینیزمی ئیسلامی و ترس لە شوناس

وەك لە بەرایی وتارەکەمان گوتمان چەمکی فیمینزمی ئیسلامی بوونی نییە لەبەر چەند هۆیەك:

١. فیمینیزم جەختکردنە لە سەر بەشێکی کۆمەڵگا ، تەنیا مێ و بەس،

٢. کوشتنی مەعنەوی ڕەگەزەکەی تر-نێر- ئەو ڕقلێبوونەوە لە نێر سەریکێشاوە بۆ

أ. ڕقلێبوونەوە لە زاتی خودا،

ب. پێویستنەبوونی ڕەگەزەکەی تر هەتا وەك ڕێکپۆش دەڵێت :" لەعابەیەك دەتوانێ ئەلتەرناتیڤێکی باشتر بێ لە سێکسی پیاو.... نوسینەکەی هەریری "

ج. فیمینیزم بەشێکە لە وەسەنیەت . سەرکردەیەکی کورد لە سەر هەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەت لە حیزبەکەی "ڕەخنە لە پێغەمبەر دەگرێت بەوەی چۆن دەبێت ئیسلام دژی وەسەنیەت بێ، چونکە وەسەنیەت بەشێکە لە ئازادی مرۆڤ."

ئەو هەموو پرانسیپانە کەسانێك دەیکەن ، کە لە دەرەوەی ئیسلامن! بۆیە کەسی ئیسلامی، ئەو کەسەی وابەستەی ئیسلامە ، چۆن شاگەشکە بێت بە دەرچوون لە چواچێوەی بنەما و پرانسیپەکانی ئیسلام؟؟

ئافرەتی ئیسلامی ناو کۆمەڵگای مەدەنی بە عەقڵێك بیر دەکاتەوە شەرم لە ناسنامەی خۆی دەکات، ئەوەندەی وابەستەی ئافرەتی سیکیولەری کوردن ئەوەندە وابەستەی کەلتور و دیدی ئیسلامی نین.ئەو شوناسە تژیە لە هزری هەڤدژ بە پرانسیپەکانی ئیسلامی.

## ئەو دەرچوونە بەشەکییە لەدەستدانی ناسنامەی بە دوا دێت

ئەو ئافرەتانەی ناویان لە خۆیان ناوە "فیمینیستی ئیسلامی"، لە بنەڕەتدا گاڵتە بەو دوو چەمکە هەڤدژە دەکەن ، چونکە ئەو دووە بەیەکەوە کۆنابنەوە.ئەو جۆرە ئافرەتانە بە بیانوی ئەوەی پیاوی سەردەم پیاوی سەردەمی پێغەمبەر نیین هەموو ئیمتیازێکی ئیلاهی پیاو ڕەتدەکەنەوە!! لە نێو ئەو بیرکردنەوەیەدا ئافرەتی پۆست باڵا هەن ، بەوەش ناسنامەی ئیسلامی و فیمینستی لە دەست دەدەن چونکە خاوەنی ناسنامەیەکی دروستی هیچ لایەك نیین.

چۆن قەبانچی بە هەبوونی تایتلی "بیرمەندی ئیسلامی" دەیەوێت گوتار و کەلتور هەتا پرانسیپی ئیسلام بشێوێنێت ، فیمینیستی ئیسلامی فێڵێکی گومڕاکەری سەردەمە سەر لە ئافرەت دەشێوێنێت بچێتە "شەڕێکی دۆڕاو" کە نێر یان مێ تێدا سەرکەوتوو نییە. کەواتە پێکەوە ژیانی هەردوو ڕەگەز لە یەکەیەکی بە خۆشەویستی چەنراو هەوڵێکی سازاندنی هەردوو ڕەگەز بە یەکەوەیە ، نەك بەرزکردنەوەی دروشمی دایکسالاری یان پیاوسالاری بەڵکو بەرجەستەکردنی مرۆڤسالاری.

## Fiji
## زمانی فیجی

خەڵکی نیمچە دورگەی فیجی ، لە ڕووی دانیشتوانەوە بە زەحمەت ملیۆنێك کەس دەبن. لە نێو ئەو دانیشتنە کۆمەڵگایەکی چەندزمانی هەیە.زمانی ڕەسمی لەو نیمچەدورگەیە ئینگلیزیە و لە سەدا ٤٠ ی بە زمانی فیجی دەدوێن .نیوەی

دانیشتوانەکە کە بە ڕەسەن هیندین بۆیە زمانی هیندی بەکاردێنن وە سەدا ٢٠-ەکەی تر زمانی تر بەکاردەهێنن.

## Finland
## فینلاند

فینیەکان پێنج ملیۆن زیاتر دەبن زمانی ڕەسمی لە ولاّتدا فینی و سویدیە.زمانی سویدی وەك زمانی یەکەمی دانیشتوانە هەروەها زمانی سامیش لە لای ٣٠٠٠تا ٤٠٠٠ کەس بەکاردێت.

## First language
## زمانی یەکەم

ئەو زمانەی منداڵی پێگۆش دەکرێت ، مەرج نییە زمانی یەکەم زمانی دایك.بۆ ئەم جیاوازیە بڕوانە زمانی دایك.زمانی یەکەم جۆری کۆمەڵگا وا دەکا کە هەمان شوناسی زمانی دایکی هەبێت.زمانی ئەو منداڵانەی زۆڵن ، دایك و باوکیان دیار نییە ، دەبنە کوڕی حکومەت بۆیە زمانی حکومەت دەبتە زمانی یەکەمی ئەو منداڵانە ، کە دیاردەیەکی بەرچاو لە کۆمەڵگای ڕووسی و ئەورووپی پێکدەهێنن.

## Firthian linguistics
## زمانەوانی فێرسی

بریتیە لە بۆچێنێکی تایبەتی زمانەوانی کە لە لایەن جێیمس روپێرت فێرس ١٨٩٠-١٩٦٩ . ئەو بۆچوونەی زمانەوانی بەریتانی لە ئاکامی ١٢ساڵ

وانەوتنەوە لە زانکۆ دروست ببوو.کورتەی زمانەوانیەکەی بریتیە لەوەی زمان ناتوانرێت بە یەك سیستەم گوزارشتی لێوەناکرێت بەلاّم پێویستە سیستەمی جیاواز فەراهەم بێت بۆ ئەوەی لە شوێنی جیاواز لە نێو ئاستێکی زمان گوزارشتی لێبکرێت .ئەوانەی ناسراون بە گروپی فێرسی نوێ گرنگیان بە بیرۆکەکانی فیرس دا لە بەریتانیا.لە نێو ئەو گروپەش زمانەوانی گەورەی وەك هالیدەی هەبوو.

## Foot

### پێ

لە کۆندا فوت بەکاردەهات بۆ دیارکردنی کێشی قەسیدەیەك ، بەلاّم لە زمانەوانی گشتیدا گوزارشت لەو پاتینەکێشدارەی وشە یان فرێزی ئاخاوتن دەکات.

## Foreigner talk

### قسەی بیانی

شێوازێکە لە ئاخاوتن کە قسکەری ڕەسەن لەگەڵ ئەو بیانیانە بەکاردێنێت کە هێندە شارەزا نیین لە زمانی خۆیاندا.

## Foreign language

### زمانی بیانی

زمانێکە زمانی دایکی ئاخێو نییە.زاراوەکە بە زۆری ئەو کاتە بەکاردێت کە جگە لە زمانی دووەم زمانی سێیەمیش هەیە . لە باشووری کوردستاندا زمانی

کوردی زمانی نەتەوەیە ، زمانی عەرەبی زمانی دووەمە ، ئینگلیزی زمانی بیانییە.

## Forensic linguistics
## زمانەوانی فۆرینسیك

ئەو جۆرە زمانەوانیە بریتیە لە تەکنیکە زمانەوانیەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە تاوانەکان کە داتای زمان بەشێك لە بەڵگەی تاوان پێکدەهێنێت.بواری فۆنەتیکی فۆرینسیك بەوە دەناسرێتەوە بەوەی پاوانێکی سەربەخۆی هەیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتی ئەوها وەك کایەکی دەنگی و ئاکسێنت و ناسینەوەی دەنگ.

## Form
## فۆرم —شێوە

ڕواڵەتی دەق پێچەوانەی بابەتی دەقە ، لە فۆرمدا جەخت لە سەر تەکنیك و شێوەی دەق دەکرێت.

## Formal grammar
## ڕێزمانی فۆرمەلی

بۆچوونێکە لە سەر توێژینەوەی ڕێزمانی دەکات کە جەخت لە سەر فۆرمی وشە و ڕستە دەکات.

## Formalist
### فۆرمالیستی

بریتیە لە وەسفکردنی بۆچوونێك لە بارەی شرۆڤەکردنی شێوازگەری کە تەمەشای دەق دەکات وەك بابەتێکی فۆرمالی پێکهاتووە لە ستراکچەرێکی نهێنی دەق کە دەکرێ لە ڕوانگەیەکی بابەتی مامەڵەی لەگەڵ بکرێ لە دیارکردنی ئەو سترەکچەرە شاراوە و ناوەخنی.

## Free form
### فۆرمی ئازاد

## Free translation
### وەرگێڕانی ئازاد

بریتیە لە وەرگێڕانێکی سەربەخۆ کە هەندێ کۆت و بەندی وەرگێران دەبەزێنێت .|بریتیە لەوەی کە سترەکچەری زمانەوانی زمانی سەرچاوە لە زمانی ئامانجدا دەبەزێندرێت.

## French
### زمان و کەلتوری فەرەنسی

ئەو زمان و کەلتورە تەنیا لە فەرەنسا بوون و دەسەلاتی نییە ، بەڵکو جگە لە فەرەنسا لەو مستعمرە فەرەنساویانەش بوونی هەیە وەك زمانی یەکەمی حکومەت و پەروەردە دەسەلاتی بە سەر زمانی نەتەوەیی هەرێمە داگیرکراوەکە وەك زمانی مستعمرەکانی ئەفریقیا.

## Friction
## لێکخشان

بریتیە لە کاریگەری بیستنی ئەو هەوایەی بە ناو ناوچەی گرفت ڕەتدەبێت بۆ دەنگە ژێیەکان.

## Function
## ئەرك

بریتیە لە پەیوەندی نێوان فۆرمی زمانەوانی و بەشەکانیتری ڕستە ، بۆ نموونە ئەرکی گرێی ناوی لە ڕستەدا بریتیە لە بکەر ، بەرکار ، تەواوکار.

## functional grammar
## ڕێزمانی ئەرکیی

بریتیە لە وەسفکردنی بۆچوونێك کە بیرۆکەی ئەرك دەکاتە سێنتەر.ئەو ڕێزمانە وەك ئەلتەرناتیڤێك بۆ بینینی ئەبستراکتی زمان کە لە لایەن ڕێزمانی گواستنەوە پێشکەشدەکرێت کە لە سەر بینینی پراگماتیکی بۆ زمان دامەزراوە هەروەها زمان وەك کارلێکردنی کۆمەڵایەتی دەبینێت . جەخت لە سەر یاسانی کۆنترۆلکردنی دەستەواژە زمانەوانییەکان دەکات کە وەك ئامێرێك بۆ ئەو چالاکیە بەکاردێن.

## Functional change
## گۆڕانی ئەرکی

بریتیە لە بەکارهێنانی وشە لە ڕۆڵی گرامەری جیاوازی وشە.وشە هەیە هەر لە کۆنتێکسدا ئەرکێکی هەیە وەك بکەر و بەرکار و پریپۆزیشن......

## پیتی G

### Gabon
### گابۆن

ویلایەتیکی داگیرکراوی فەرەنسیە ، دانیشتوانەکەی نزیکەی سێ ملیۆن دەبێت .زمانی فەرەنسی زمانی رەسمیە هەروەها لە ولاّتدا ۳۵ زمانی لۆکەل هەیە.

### Gambia
### گامبیا

دانیشتوانەکەی نزیکەی دوو ملیۆن دەبێت.زمانی ئینگلیزی زمانی رەسمی ولاّتە لەگەلّ ۱۵ زمانی لۆکەلّ.

### GB
### زمانەوانی گی بی

کورتکراوەی تیۆری دەسەلاّت و بەستنەوە.

ڕێزمانی دەسەلاّت و بەستنەوە بەشێکی گرینگ لە ڕێزمانی چۆمسکی پێکدەهێنێت.

## Gender
## گێندەر

کاتیگۆریەکی ڕێزمانیە کە ئەو جیاوازیانە پیشاندەدات : ماسکولین –نێر ، فێمینین-مێ ، بێ لایەن هەروەها زیندوو بێگیان. زایەندی سروشتی جیاوازە زایەندی ڕێزمانی.

## Generalization
## بە گشتیکردن

مەسەلەکە پەیوەندی بە بڕیاری بەڕێوەبەر لە دایەرە نییە! لە زمانەوانی دەروونیدا گێنرەلزەیشن بریتی لە پرۆسەیەکی فێرکردن کە کاتێ منداڵان بەکارهێنانی بەرایی هەندێ ئەدگاری زمانەوانی بە تایبەتی پاشگری وشەکان درێژدەکەنەوە بۆ نموونە منداڵی ئینگلیز بەرە بەرە ڕادێت لە بەکارهێنانی ئێسی کۆتایی لە کاتی بە کۆکردنی ناوی ئینگلیزیدا.

بەڵام لە ئینسانی باڵەقدا ئۆڤەرگێنرەلایزەیشن کاتێ ڕودەدات کە ئەدگارەکە-سیمایەکە درێژدەکرێتەوە لە پشت سنوورەکانی ڕێزمانی پێگەیشتوان وەك بۆ نموونە بەکارهێنانی ئێس لە وشەی وەك ماوس و مان.

## Generalized phrase-structure grammar
## ڕێزمانی پێکهاتەی گرێی بەگشتیکراو

چوارچێوەیەکە بۆ نووسینی تەواو ڕۆشنی ڕێزمانی شێوەکی بۆ زمانە سروشتیەکان، کە لە هەشتاکان پەرەی پێدرا کە ببێتە بەدیلی ڕاڤە گوێزانەوەیی زمان.

## General linguistics
## زمانەوانی گشتی

زمانەوانی گشتی زیاتر زمانەوانیەکی تیۆریە و دەیەوێت پرانسیپی یونیڤێرسل دامەزرێنێت بۆ دیراسەکردنی زمان و هەروەها بۆ ئەوەی بڕیار بدات لە سەر دیارکردنی تایبەتیەکانی زمانی مرۆڤ وەك دیاردەیەك.

## General phonetics
## فۆنەتیکی گشتی

فۆنەتیکی گشتی جەخت لە سەر ئامانجی دۆزینەوەی پرانسیپە یونیڤێرسلەکان کە کۆنترۆلی سروشت و بەکارهێنانی دەنگی مرۆ دەکەن.

## General semantics
## سیمانتیکی گشتی

ئەو جۆرە سیمانتیکە بەرهەمی بزاڤێکی فەلسەفیە لە سیەکانی سی سەدەی بیستەم لە لایەن زانا و فەیلەسوفی ئەمریکی-پۆلەندی ئەلفرێد کۆرزیبسکی ۱۸۷۹-۱۹۵۰ پەرەی پێدرا. خودی بزاڤەکە هەولّدەدات خەلّکی ئاگادار بکاتەوە لە پەیوەندی ئاسایی نێوان وشەکان و شتەکان وەك ناوەندێك بۆ ریفۆرمکردنی سیستەمەکانی پەیوەندی و بیرکردنەوەی رۆن.

## Generative grammar
## ڕێزمانی بەرهەمهێن

ڕێزمانی بەرهەمهێن زۆر واتا هەڵدەگرێ :

١. کۆمەڵێك یاسا لە خۆ دەگرێت،

٢. بە ڕاستەوخۆ دیار دەکا چ دەتوانیٚ ڕستە بێت وە چ ڕستە نەبێت لە زماندا،

٣. لە پەنجاکان چۆمسکی ئەوانەی سەرەوەی وەك ئامێرێکی ئەبستراکت بۆ بەرهەمهێنی ڕستە.

ڕستە لەو ڕێزمانەدا کۆمەڵە یاسایەکی سنوردارە ژمارەیەکی بێ کۆتایان لە ڕستە لیٚ بەرهەم دێ.

## Generative phonology
## فۆنۆلۆژی بەرهەمهێن

هەر ژمارەیەکی فۆنۆلۆژی، لە ڕووی مەبدەئەوە ، تەبەنیکراوە لە ناو ڕێزمانی بەرهەمهێن.

## Generative syntax
## سینتاکسی بەرهەمهێن

بریتیە لە دەرهاوێشتەی تیۆری ڕێزمانی گواستنەوە لە کۆتایی شەستەکان تا ناوەڕاستی حەفتاکان .لەو تیۆرەدا وا پێشنیاز دەکرێ کە بەشی بنکەی ڕێزمان دەبێ سەربەخۆ نواندنی سیمانتیکی ڕستەکان بێنێتە بەرهەم ئەمەش تەنیا لە ئاستی سەرەوە هەیە بە بێ دەستێوەردانی ئاستی یان پێکهاتەی ژێرەوە.

## Geneva school
## قوتابخانەی جنێف

ئەو ناونانە لە دوو چاووگ سەرچاوەی گرتووە یا ناوێکی گشتیە بۆ زمانەوانانی جنێف یا لایەنگر و پەیڕەوەنی سۆسێر دەگەیەنێت.کاری بالی لە سەر شێوازگەری فەرەنسی لە ۱۹۰۹ زۆر گرینگە لە بارەی هزری سۆسەری.

## Geographical linguistics
## زمانەوانی جیۆگرافیا

بریتیە لە دیراسەکردنی دایەلێکتی جیۆگرافی یان ناوچەیی

## Geolinguistics
## جیۆلینگویستیکس

جیۆلینگویستیکس لقێکە لە زمانەوانی دیراسەی دابەشبوونی جیۆگرافی زمان لە جیهان دەکات بە ئاماژەکردن بە باری کەلتوری و ئابووری و سیاسیان.

زاراوەکە بەکاردێت بۆ بۆچوونێك کە دایەلێکتی جیۆگرافی و دیراسەی دایەلێکتی گوندیی دەبەستێتەوە بە جیۆگرافیای مرۆیی لە نێو دیەنی کۆزمانەوانیدا.

## German
## گێرمانی-ئەلمانی

بریتیە لە گێرمانی رۆژئاوا کە بە زۆری لە ئەلمانیا و ئوستریا قسەی پێدەکرێ هەروەها زمانی رەسمیە لە سویزەرلاند و لوکسمبۆرگ وە فۆرمێکی ناوچەییە لە

تیرۆلی ئیتالیا.لە ڕووی مێژووییەوە دەکرێ بە دوو دایەلێکت ئەلمانی بەرز و ئەلمانی نوی .

## Glossolalia
## گلۆسۆلالیا

بریتیە لە تێخزاندنی پراکتکی ئاینی قسەکردن لە زمانەکاندا. دیاردەیەکی بەربلاوە لە نێو ترادیشنی پێنتیکۆستەلی پرۆستانتی و کاریزمای کاسۆلیکی رۆمانی.کەواتە ئاخاوتنی بە شێوەی گشتی وا شرۆڤەدەکرێ وەك هێمایەك بۆ گوزارشتکردن لە باوەڕی ئاخێو یان وەك بەڵگەیەك بۆ گۆڕین .

ئەو دیاردەیە وا خەریکە لە نێو زانای ئیسلامی کوردی بلاودەبێت.

## Goal
## ئامانج

ئامانج ئەو یەکەیە کە لە شرۆڤەکردنی ڕێزمانیدا کاریگەر دەبێت بە کرداری کردار-فرمان.گۆل یان ئامانج بەرانبەر بەرکاری ڕێزمانییە، وەك

-دەرزیەکە بالۆنەکەی تەقاندەوە.

## Government
## دەسەلات –حکومەت
## دەسەلات

جۆرێکە لە پەیوەندی سینتاکی کە بەو بۆنەیەوە یەك وشە یان یەك بەشی ئاخاوتن داوای هەبوونی وشە و بەشێکی دی ئاخاوتن دەکات.مەسەلەی بیرۆکەی

دەسەلآت : کۆنترۆلکردنی وشەیەك لە لای وشەیەکەوە –لەم حاڵەتانەی خوارەوە شرۆڤە دەکرێت:

١.پەیوەندی نێوان بکەر و بەرکار و تەواوکەر: - من ئەوم لە پاریس بینی.

٢.پەیوەندی نێوان پریپۆزیشن و پپ.

ئەو مۆدێلەی سینتاکس بەرەو ڕێزمانی بەستنەوە و دەسەلآت بردرا.

ڕێزمانی بەستنەوە و دەسەلآت ڤێرشنێکی تری ڕێزمانی چۆمسکییە کە ناسراوە بە تیۆری پرانسیپ و پارامیترەکان ، لایەنگرانی چۆمسکی بە هۆی موحەزەرات لە بارەی دەسەلآت و بەستنەوەوە ناویان لە ڕێزمانەکەوەنا ڕێزمانی دەسەلآت و بەستنەوە.

## Grammar
## ڕێزمان

ڕێزمان بریتیە لە شرۆڤەیەکی سیستیماتیکی پێکهاتەی زمان.لە ناخی ڕێزماندا دیاردەی ڕێزمانیی و قەبوولی کۆمەڵیی هەیە.لە ناو ڕێزماندا ڕێزمانی وەسفی و ڕێزمانی ڕەچێتەیی هەیە ، ئەوەی یەکەم ئیش لە سەر زماندا دەکات ، ئەوی دووەم زیاتر کار لە سەر سیاسەت و مێژوو و پایەی کۆمەلآیەتی دەکات.

## Grammar translation method
## میتۆدی وەرگێرانی ڕێزمانی

ئەو میتۆدە لە کوردستاندا کۆنە بریتیە لە وەرگێرانی زمانی دووەم بۆ زمانی یەکەم یان وتنەوەی زمانی دووەم یان بیانی بە زمانی یەکەم.وتنەوەی زمانی

ئینگلیزی بە کوردی یان وتنەوەی زمانی عەرەبی وەك تەرەماخی کردی بە زمانی کوردی.

## Grammatical gender
## گێندەری ڕێزمانی

گێنـدەری ڕێزمـانی بریتیـە لـە کاتیگـەری ڕێزمـانی کـە حاڵـەتی پێچـەوانە نیشاندەدات وەك نێر-مێ — بێلایەن یان زینـدوو-نازینـدوو، بروانـە سـێکس لـە زماندا.

## Grammatical word
## وشەی ڕێزمانی

بریتیە لەو وشەیەی کە هـیچ واتایـەکی لێکسـیکی هـەڵناگرێت ، ئامـانج لـە هەبوونی تەنیا دەربڕینی پەیوەندی ڕێزمانی نێوان ڕەگـەزەکانی رسـتەیە هـەروەها پیشاندانی ئەرکی ئەو وشەیەیە ، وەك —ەکە ، لە ....بۆیە ئەو وشانە ناسراون بە وشەی بەتاڵ یان وشەی ئەرکیی.

## Grapheme
## گرافیم

بریتیە لە بچووکترین یەکەی بـەراورد لـە سیسـتەمی نوسـین لـە زمانـدا-ئـەو بیرۆکەیە لە سەر پێوەری وەکیەکیی فۆنیم داهێنـراوە .ئـەو فۆرمـە لـە دیراسـاتی زمانییسیستەمی دەنگیی بەکاردێت.

## Graphology
## گرافۆلۆژی

بریتیە لە سیستەمی نووسینی زمانێك یان بریتیە لە لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانی کردن لە سەر ئەو سیستەمە کە لەو پرۆسەیەدا ئەو تەکنیاکەنە بەکاردێنێت کە لە فۆنۆلۆژی بەکاردێن.

## Grimm's law
## یاسای گریم

ئەو یاسایە تایبەتە بە سیستەمی دەنگیی.بریتیە لە یاسای دەنگیی یان زنجیرە یاسای دەنگیی لە لایەن نابزوێنەکەوە لە زمانی گێرمانی کە جیاوازە بەشێوە سیستیماتیکی لە شێوەی ئافراندن-دروستکردنی دەنگ- لەو شێوە هاوڕیشانە لە زمانی دی هیندوئەورووپی:

د دەبتە ت

لە لایەکی دی وەك کریستال دەنووسێت ئەو یاسا دەنگییە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٨٢٢ لە لایەن یاکوب گریم ١٧٨٥-١٨٦٣ ەوە کاری لە سەر کرا ، ئەو یاسایە پیشاندەدات کە ڕێگای یاسایی سیستەمی دەنگیی گێرمەنی جیاوازە لە زمانی هیندۆئەورووپی دی.

## پیتی H

### Habitual دووبارەیی

وەسفی فۆرم ، فۆرمی ئاوەڵکردار، کە گوزارشت لە دووبارەبوونەوەی کردارێك.بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی بەوە ناسراوە زنجیرەیەکی بەرفرەی ئاوەڵکرداری هەیە کە واتای دووبارەیی دەگوازێتەوە ، وەك بەزۆری ، دووجار لە هەفتەیەکدا.

### Half-close
### نیوە داخراو

بریتیە لە ئەدگاری ناوەندی ڤاول.

### Half-rhyme
### نیوە قافیە

بریتیە لە نابزوێنی کۆتاییە.

### Halliday,Michael

هالیدەی یەکێك لە بزاڤی فیرسی نوێیە هەر وەها دامەزرێنەری رێزمانی ئەرکیە.تەمەشای زمانەوانی فیرسی بکە.

# Hapax legomenon

## کرتاندن لە زنجیرە

بریتیە لە کرتاندنی لە هەندێ پیتی وەکیەك لە هەندێ وشەدا.

# Harris , james 1709-1780

## جێمس هاریس

هاریس نووسەری گرینگی ڕێزمانی فەلسەفیە -١٧٥١ ، نووسینەکەی هاریس ستوونی بوو و سەرچاوەی گرتبوو لە تێروانینی ئەریستۆ بۆ بەشەکانی ئاخاوتن.ڕێزمانەکەی هاریس وەك کتێبەکەی سۆسێر لە پاش مەرگی بلاّوبۆوە بە ئەلمانی -١٧٨٨و فەرەنسی- ١٧٩٥.

# Head

## سەرە

سەرە دیارکەری ناسنامەی فرێیزی کوردیە.سەرە بە زۆر واتای جیاواز دێت: .هەر وشەیەك یان یونیتی تر ئەو یەکەیە کە دەتوانێ بە تەنیا بێت.لە نەزەر بلۆمفیلدی باوکی زماننناسی بونیاتگەری ئەمریکی دوو پێناسە هەیە بۆ سەرە .

أ. پێناسەی مەودا تەسك:

ئەگەر گرێیەك (گ) سەرەیەکی هەبێت ، ئەگەر ئەو سەرەیە هەر ئەرکێکی سینتاکسی هەڵبگرێ ، ئەوا گ-ەیەکەش هەمان ئەرکی سینتاکسی هەڵدەگرێ: زۆر سارد ، سەرەکە ئاوەڵناوە کەواتە گرێیەکەش گرێی ئاوەڵناوییە هەروەها دەتوانین تەنیا سەرەکە-سارد- بە تەنیا بەکاربێنین.

ب. پێناسەی مەودا فرەواوان

ئەگەر گ-سەرەیەکی هەبوو ئەو سەرەیە بە واتایەك دەسەلاتی هەبوو لە ناو گرێیەکەدا ئەو سەرەیە سینتاکسی یەکەیەکە.بە شیکردنەوەی سینتاکسی ئێکس بار سەرە ئەندامە لە کاتیگۆری لێکسیکی.

## Heritage language

## زمانی کەلەپور-میات

زمانیکی پڕ بەهایە یان زمانیکە وەك بەشێك لە مێژووی کۆمەڵگە وەردەگیرێت ، بەلاّم ئەو زمانە ئێستا مردووە.

## Hindu-Urdu

## هیندو-ئوردو

ئەو ناوە کورتدەکرێتەوە بە هیردو هەروەها بە زۆری پێیدەوترێ هیندوستانی .لەمەزیاتر لەو ناوەدا دووریەکی کەلتوری دیار هەیە .هیندو زمانی هیندۆسیە ،ئوردو بۆ موسلمانانی کێشوەری هیندوستانە.

## Hjelmslev, Louis 1899-1965

زمانەوانێکی دانیمارکی بوو هەروەها یەکێك بوو لە لێکدەرە و روونکەرەوەی زمانەوانی بنیاتگەری دوای سۆسێر ، گرینکترین کاری تیۆری بریتی لە بنەماکانی تیۆری زمانەوانی کە لە ١٩٤٣ دەرکەوت. ئەو تیۆرەی هیلمێسیف چەمکی سۆسێری بۆ ئاماژەی زمانەوانی گواستەوە بۆ ئاکامی لۆجیکی

## Hyperbation

### هایپەربەشن

زاراوەیەکی کۆنە بۆ هەر لادانێك و بەجێهێشتنێکی هارمۆنی وشەی ڕیز کردنی ئاسایی .

## Hypercorrection

### سەروو-ڕاستی

هەندێ ئاخێوی ئینگلیز حەزدەکەن هەندێ فۆرمی ناڕاست بەکاردێنن هەوڵ دەدەن خۆیان دوور بگرن لەو فۆرمانەی کە لەکەی شوورەیی بە دواوەوەیە.ئەو وشەیە لە کۆزمانەوانی واتای زۆر بەکارهێنانی فۆرمێك و دوورکەوتنەوە لە فۆرمی دی دەگەیەنێت.

## Hypernymy

### گرتنەوە-هایپەرنیمی

باس لە پەیوەندی سیماتیکی لێکسیکەکان دەکات .ئەو زاراوەیە پێچەوانەی هایپۆنیمیە.گوڵ :هەلاڵەیە :هەلاڵەش گوڵەباخە!

## Hypocoristic

### هایپۆکۆریستیك

وشەکە بریتیە لە لاساییکردنەوەی ئاخاوتنی منداڵ.هەروەها ئەو شێوازە ئاخاوتنە جۆرێکە لە وشەڕۆنان.

## Hyponymy
## هایپۆنیمی

بریتییە لە پەیوەندی سیمانتیکی نێوان یەکە لێکسیکیەکان بە جۆرێک واتای وشەی یەکەم لە وشەی دووەم دایە ، بۆ نموونە هەر گوڵەباخ و هەڵاڵەیەك گوڵە ، کەواتە گوڵەباخ و هەڵاڵە دوو کۆهایپۆنیمی گوڵن.کریستال نموونەی تر دەهێنێتەوە وەك سەگ هایپۆنیمی ئاژەڵە وە ئاژەڵ هایپەرنیمی سەگە.پشیلە ، سەگ ، جورج ئاژەڵن هەروەها کۆهایپۆنیمن.

# پیتی I

## Iberian ئیبریەن

زمانێکی نا هیندۆئەوروپیە لە بەشەکانی باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی ئیبرۆ لە سەردەمی پێش رۆمان قسەی پێدەکرا.

## Iconicity

پەیوەنیەکی نزیکی فیزیکیە لە نێوان ئاماژەی زمانەوانی-وشە- و ئەو شتەی لە جیهان ئاماژەی پێدەکات، بۆ نموونە وشەی نەخشە کە ئەدگارەکان لە جیهاندا پەیوەندی یەك بۆ یەك دەنوێنێ. ئایسۆنیستی نە ئاخاوتنە نە نووسینە.

## I
## Ideograph
## نووسینی بیر دەربڕ

ئەو هێمایەی لە سیستەمی نووسین بەکاردێت وەك دەربڕی تەواوی وشەیەك ، بیرۆکەیەك پێی دەوترێت ئیدیۆگرام یان ئیدیۆگراف .ئەو ئیدیۆگرافە لە نووسینی وێنەیی جودایە .ئەو ئیدیۆگرامە مانایەکی ئەبستراکتی هەیە بە وێنە دەرنابڕێت.

## Idioglossia
## ئیدیۆگلۆسیا

فۆرِمی داهێنراو لەو ئاخاوتنەی کە واتەکەی تەنیا لە لایەن داهێنراو زانراوە.

## Idiolect
## ئیدیۆلێکت

سیستەمی زمانەوانی ئاخێوەر هەروەها ناسراوە بە دایەلێکتی کەسی.

## idiom
## ئیدیۆم

ئیدیۆم یەکەیەکی سەربەخۆیە ، واتای ئیدیۆم لە دوو وشە پێك دێت جیاوازە لە واتای ناسراوی دوو وشەکە بە تە نیا. ڕیزبوونی وشەکانە کە لە ڕووی سیمانتیکی وە سینتاکی چوارچێوەکراوە بۆیە وەك یەکەیەکی سەربەخۆ کاردەکات.لە نێوان دوو زمان کەلتور و ئایین جیاواز سێ جۆری ئیدیۆم هەیە:

١.وەك یەك لە فۆرِم و واتا،

٢.وەك یەك لە واتا ،

٣.|جیاواز لە فۆرم و واتا.

## Imitation
## لاسایی

لە سیاقی زمانێکدا بە لەبەرگرتنەوەی فۆرِمێکی زمانەوانی کە زمانێك فێردەبن.پرۆسەی لاساییکردنەوە لە زمانی یەکەم و زمانی بیانی هەیە.

## Immediate constituent
## بەشی ڕاستەوخۆیی

ئەو بەشە سەربەخۆییە لە ئەنجامی یەکەم بڕینەوە دروستدەبێت.ئەو دوو بەشەوە بە یەکەوە واتادارن هەروەها یەکێك لەو دوو بەشە دەبێت بەشی سەربەخۆ بێت.

## Imperative
## داخوازی

ئەو جۆرە فۆرمە شێوەی چاووگ وەردەگرێت هەروەها لە ڕواڵەتدا بکەر و بەرکار دەرناکەون ، وەك

-بڕۆ : من بە تۆ دەڵێم بڕۆ

-سواربە:من بە تۆ دەڵێم سواری ئەسپ بە.

لە هەندێ ڕستەدا داخوازی و رستەی هۆ تێکەڵ دەبن ، وەك

-بیکوژن :من ئەوم بە کوشتندا،

-ئازادی بکەن: من وامکرد ئەو ئازاد بکەن.

## Indexical features
## ئەدگاری ئیندێکسیلی

بریتیە لە ئەدگاری ئاخاوتن و نووسین کە ئەدگاری کەسی زمان بەکارهێنەر دەردەخات ، لەوانە تەمەن.

## India

لە لایەکی دی ، ئەو وشەیە جیاوازە لە سارکازم کە مەبەست لێی گاڵتەپێکردن و بریندارکردنی بەرانبەرە.

## Isogloss
## ئیسۆگلۆس

**بریتیە لەو هێڵەی سەر نەخشە کە تخووبی ناوچەیەك پیشان دەدات کە ئەدگاری زمانەوانی وەك دەنگ و وشە و شێوەی رێزمانی بەکاردێت.پێشگری ئیسۆ لە سەراپای دیراسەی دایەلێکت وەك بەشێك لە ناونانی جۆرەکانی زانیاری بەکاردێت کە دەکرێ لە سەر نەخشە پیشانبدرێن.**

# پیتی J

## Jakobson, Roman 1896-1982
## رۆمان جاکوبسن

بە ڕەگەز یاکوبسن یا جاکوبسن رووسیە .ئەو زمانەوانێکی بونیاتگەر بوو هەروەها ئەندامێکی پێشەنگی قوتابخانەی پراگ بوو.لە سییەکانی سەدەی بیستەم سەرکردایەتی پرۆسەی بیرۆکەی مارکیتنس –نیشانکردن لە مۆرفۆلۆژی.

یاکوبسن کارگەرێکی فرەی هەبوو لە بەرهەمەکانیدا لە سەر بابەتەکانی دەرەوەی زمانەوانی بە تایبەتی لەمەڕبونیاتگەری فۆرمەلی لە شیعردا هەر لەو بارەیەوە لە چلەکان پەیوەندی لەگەڵ لیڤی شتراوسی ئەنسرۆپۆلۆژی هەبوو .هەروەها قسەی خۆی هەبوو لە سەر ئەرکی زمان .

## jamaica
## جامایکا

نزیکە ٣ ملیۆن کەس دەبن . زمانی ڕەسمی ولآت ئینگلیزیە. لە سەدا حەفتا بە ئینگلیزیەك قسە دەكەن كە لە سەر كرۆیلی ئینگلیزی دامەزراوە.

## Japan
### ژاپۆن

مرۆی ژاپۆنی ١٢٥ ملیـۆن زیـاتر دەبـن . زمـانی ڕەسمـی ژاپۆنیـە زیـاتر کۆمەڵگایەکی تاك زمانیە چونکە لە ٪ ٩٨ ژاپـۆنی بـە ژاپـۆنی دەدوێـت . هەرچەندە زمانی تر لە کۆمەڵگای ژاپۆنی هەیە وەك کۆری ، پیوکیو.

## Jesperson , Otto 1860-1943
### یسپرسن ئۆتۆ

یسپرسـن نـاوێکی دیـارە لـە ڕێزمـانی ئینگلیزیـدا .یسپرسـن خـۆی زمانەوانێکی دانیمارکیە کە کاری پایـەداری بریتیـە لـە تیـۆری ڕێزمـان و ڕێزمانی ئینگلیزی.تیۆرەکەی لە کتێبی فەلسەفەی ڕێزمان-١٩٢٤ پێشکەش کرا کە بریتی بوو لە دووکەرتبوونی چەمکەکان لە ئاستدا.

یسپرسن زەوق و دیـدێکی سـۆزداری هـەبوو دەربـارەی بەکارهێنانـەکانی زمانەوانی هەروەها یسپرسن ڕۆڵێکـی گرینگـی هـەبوو لـە بزاڤـی جیهـانی زمانی دەستکردی جیهان لە بەرەو پێشـبردنی میتۆدەکـانی وتنـەوەی زمـانی بیانی.

## Jones , Daniel 1881-1967
### دانیال جۆنز

دانیال جۆنز بریتیە لە دەنگسازێکی بەریتانی لە نیوەی یەکـەمی سـەدەی بیستەم .جۆنز پرۆفیسۆری فۆنەتیکس بوو لە زانکۆی لەندەن لە نێوان سـاڵی ١٩٢١-١٩٤٩ هـەروەها جـۆنز بـە داهێنـەری سیسـتەمی کاردینـال ڤـاول دادەنرێت .

## Jones ,William1746-94
## ویلیەم جۆنز

خۆی بەپیشە ڕۆژهەلاتناس بوو ، بەلاّم وەك پارێزەر و قازی لە ٨٣ەوە لە کالکوتا کاری دەکرد.مێژووی زمانەوانی لە ٨٦ هێنایە کۆمەلّەی ئاسیایی بەنگالی کە خۆی دامەزرێنەری بوو.باوەڕی وابوو کە سانسکریت و یۆنانی و لاتینی دەبێت لە یەك سەرچاوەی هاوبەش هاتبن.ئەو بۆچوونەی ویلیەم ڕێگای خۆشکرد بۆ زمانەوانی بەراورد.

## Juncture
## پەیوەندگا

بریتیە لە پلەی پەیوەندی لە نێوان کۆمەلّە دەنگی لە دوای یەك لە ئاخاوتندا.

## Junggrammatikar=Joung grammarian
## ڕێزمانووسی گەنج

قوتابخانەیەکی زمانەوانی بوو لە لیپزیگ لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم دامەزرا.ڕێسایی یەکێك لەو پرانسیپانەبوو کە لێسکین لە سالّی ١٨٧٦ دایهێنا.ئایدیەکانی ڕێزماننووسانی گەنج لە بواری زمانەوانی شتی زۆر نوێ بوون کە لە سەدەی بیستەم قسەکانیان بە سەرەتای زمانەوانی زانستی هەژمێر دەکرا.

## Juxtaposition
## ریز-ڕێکوەستان

پەیوەندی بە ریزبەندی یەك لە دوایەك هاتنی وشەکان یان رستەکانەوەیە .ئەو سیستەمسازی و هارمۆنیە تەنیا لە نێوان یەکە هاوسێکانەوە هەیە.کەواتە ڕستەی یەك لە دوایەك فراوانترین یەکە لە زمان پێکدەهێنن ، ئەو حاڵەتەش لە نەزەر ڕێزماننووساندا تەنیا ریزبەندی هاوسێی لە زماندا پێکدەهێنێت.

# پیتی K

## Kabardian

کاباردیەن ئەندامی گروپە خێزانی ئەبهازۆ-ئەدغەیانی قەوقازی.

## Kadai

**کادایی**

کادایی خێزانە زمانێکن لە باشووری چین و بەشی هاوسێی ڤیتنام هەنە.

## Kam-sui

**کام-سوی**

کام –سوی خێزانە زمانێکن لە باشووری چین هەنە

## Kana

**سیستەمی کانا**

سیتستەمی نووسین لە ژاپۆن کە هەر برگەیەکی دابەستەی نووسین-گرافیکی برگەیی-برگەیەك بنوێنێت.

## Kanuri
### کانوری

بریتیە لە زمانی سەهران کە لەلایەن زیاتر لە سێ ملیۆن لە باکوری رۆژهەلاتی نیجیریا قسەی پێیدەکرێت هەروەها لە لایەن چەند ئاخێوێکی باشووری نەیجەر و تشاد قسەی پێدەکرێت.

## Katz-Postal hypothesis-1964
### گریمانی کاتز

ئەو گریمانەی کاتز پرینسیپێکە چۆمسکی لە نووسینە زمانەوانیەکانیدا زۆر ئاماژەی پێدا وە و قسەی لە سەر کردووە.ئەو پرینسیپەی کاتز و پۆستەل ١٩٦٤ بووە پرینسیپێك لە پرانسیپەکانی تیۆری ستاندەری چۆمسکی ئەو پرانسیپە دەڵێت ئەو رستەیەی لە یاسای گوێزانەوە دروستدەبێت هیچ پەیوەندی بە واتاوە نییە.واتا شتێکە تەنیا لە پێکهاتەی ژێرەوە بریاری لە سەر دەدرێت.چۆمسکی لە دەسەلات و پرۆگرامی مینالیست لەو پرانسیپە پەشیمان بۆوە.

## Kashmiri
### کەشمیری

کەشمیری ئەندامە لە گروپی داردی خیزانە زمانی هیندۆئیرانی.چوار ملیۆن کەس لە کەشمیر و هیندستان و بەشەکانی پاکستان قسەی پێدەکرێت.لە لایەن موسلمانەوە بە ئەلفبای عەرەبی دەنووسرێت ، بەلاّم لە لای هیندۆسەکان بە ئەلفبای سارادا لە سەدەی ٨ی میلادیەوە.

کەشمیر لە ڕووی سیاسیەوە کراوەتە دوو بەشەوە بەشی هیندی و بەشی پاکستانی.

## Kazakh and kazan school
## کازاخ و قوتابخانەی کازان

کازاخ ئەندامی لقی زمانە خێزانی تورك-ی خێزانە زمانی ئەتلەتیە .ئەو زمانە نزیکەی ١٠ ملیۆن ئاخێوی هەیە لە کازاخستان .لەوێ زمانی ڕەسمیە هەروەها لە مۆنگۆلیا و چین و ئیران و تورکیا قسەی پێدەکرێت.لە زەمەنی پێشووتر بە ئەلفبای عەرەبی دەنووسرێت وە لە سەردەمی کەنیسا و کۆمۆنیستی بە ئەلفبای سلاڤی دەنووسرا ، ئێستاش لە دوای هەلوەشاندنەوەی سۆڤیەت و نزیکبوونەوەی کازاخستان لە تورکیا بە ئەلفبای لاتینی دەنووسرێ.

**قوتابخانەی کازان**

قوتابخانەیەکی زمانەوانییە سەنتەرەکەی بۆدوین دێ کۆرتەنەی که لەوێ بە کازان دەرس دەوتراوە لە رووسیا لە ساڵی ١٨٧٥ تا ١٨٨٣.

## Kernel
## کێرنەل

جۆری سەرەکی پێکهاتەی ڕستەیە، ئەو ڕستەیە کە ڕێزمانی بەرهەمهێنان بەکاردەهات.ڕستەیەکی سادە و بکەر دیار و دیکلەرەتیڤە ، وەك پشیلەکە بە دوای مشکەکە کەوت.دەتوانرێ رستەی نێگەتیڤ و پرس و بکەر نادیاری لێدروستبکرێت بە هەندێ یاسای گواستنەوە.

## Kinesics
### کینیسیکس

بریتیە لە بەکارهێنانی سیستیماتیکی دەربڕینی روخسار و هێمای جەستە بۆ قسەکردن و پەیوەندی واتایی.

## Kinship terms
### زاراوەکانی خزمایەتی

زاراوەی خزمایەتی سیستەمێکن لە زاراوەی لێکسیکی لە ناو زمانی پەیوەندیە کەسیەکانی ناو خێزان.ئەو زاراوانە گوزارشت لە دووری و نزیکی پەیوەندیەکان دەکات هەروەها لەو زاراوانە خزمایەتی پشت وەك باپیر –باوك –کوڕ و خزمایەتی دروستبوو لە ڕێگای زەواجەوە وەك دایك، خاڵەت.

## Kirgiz
### کیرغزی

ئەویش وەك کازاخ ئەندامە لە گروپە زمانی تورکی ناو خێزانە زمانی ئەتلەسی .ئەو زمانە نزیکەی ٣ ملیۆن کەس لە قیرغیا و ئەفغانستان و تورکیا و چین قسەی پێدەکرێت.

## Kurdish
### زمانی کوردی

زمانی کوردی لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی عەرەبی و تورکی لە نووسینی رۆژئاوایی ون بوو ، کەچی لە سەدەی نۆزدە و سەدەی بیستەم

ئامادەبوونێکی ئاکتیڤی هەبوو لە نووسینی رۆژهەلاٚتناسەکان.

زمانی کوردی ئەندامە لە گروپە زمانی ئیرانی .ئەو زمانە زمانی قسەکردنی چل ملیۆن کوردە، تەنیا لە باشووری کوردستان زمانی پەروەردەی هەولێر و سلێمانی بووە ، بەلاٚم لە دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعس ، زمانی پەروەردەیە لە حکومەتی کوردی : هەولێر و سلێمانی و دهۆك هەروەها کەرکوك.ئەو زمانە چواری زاری سەرەکی هەیە.ئەو زمانە بە سێ ئەلفبای کوردی(عەرەبی )و لاتینی و سلاڤی دەنووسرێت. ئەو زمانە لە تورکیا و ئیران و سوریا لە پەروەردە قەدەغەیە .ئەو قەدەغەبوونەش بۆ سڕینەوەی ئەو زمانە بووە،بەلاٚم کورد بە شۆرش ئەو قەدەغەبوونەی شکاند!

لە ژێر ئالاٚی حکومەتی کوردی هەندێ زانای زمانەوانی کوردی کار دەکەن بۆ لەتکردنی ئەو زمانە .لە هەمووش سەیرتر زمانەوانێکی کورد ئەو لەتبوونەی زمانی کوردی بە دیموکراسیەت دەزانێت .

## Kurdistan
## کوردستان

کوردستان ولاٚتی کوردانە.زمانی کوردی لە باشووری کوردستان بە پێی دەستووری کوردستان و دەستووری عیراقی فیدرالی زمانی ڕەسمیە ، بەلاٚم لە بەشەکانی کوردستان زمانی کوردی قەدەغەیە.لە باشووری کوردستاندا جگە لە زمانی کوردی زمانی تر هەن:زمانی تورکمانی ، زمانی سریانی ، زمانی عەرەبی.

# پیتی L

## Labial
## لێویی دەمی

بریتیە لە وەسفکردنی ئەو ئاخاوتنەی کە دەنگە مرۆ ئاساکانی بە هۆی لێوێك یان هەردوو لێو دێنە بەرهەم ....

## ویلیەم لابۆڤ

ویلیەم لابۆڤ ١٩٢٧-؟ لە نیوەی شەستەکانی سەدەی بیستەم ڕابەری بزاڤی کۆزمانەوانی بوو و سەرکردایەتی ئەو بوارەشی کردووە:بواری لێکۆڵینەوە و تیۆریی بووە هەروەها لایەنگری پیادەکردنی ئەو دوو بوارە بووە لە کۆزمانەوانی.

## Lad : language Acquisition Device
## وەرگرتنی زمان

لە مێشکی مرۆڤ ئامێرێك هەیە کە تایبەتە بە زمان وەرگرتن .ئەو ئامێرە لەگەڵ تەمەنی مرۆڤەکەیە : هەتا گەنجە چالاکە ، کە پیر دەبێ بەرەو سستبوون دەچێت . بۆ نموونە ئەو باوك و کوڕەی دەچنە ولاتێکی بیانی ،

کوڕەکە زۆر زووتر فێری زمانی بیانی دەبێـت لـە باوکی،چـونکە ئامێرەکـەی مێشکی ئەو گەنجتر و چالاکترە لە هی باوکی.

## La-la theory
## تیۆری لا لا

تیۆرێکە لە بارەی بنەچەی زمانەوە کە گریمان دەکـات زمـان لـە ڕێگـای گۆرانیەوە پەیدا بوو بێت . ئەم تیـۆرە پێـی وایـە سـەرەتا مـرۆ ، مرۆیـەکی نەخوێنەوار بووە ، بەلاّم نووسەری ئەم فەرهەنگە باوەڕی وایە کە سەرەتا مـرۆ خوێنەوار بووە و لە ڕێگای لاسایی گۆرانی و شانۆ زمان دروستنەبووە.

## Laminal
## لامینەل

بریتیە لەو نەبزوێنەی بە هـۆی دەمـی زمـان لەگـەڵ ددانـی بـرەڕ یـان ئەلڤیۆلەر ڕیج دروستدەبێت .

## Lango
## لانگۆ

زمانێکی نالۆتیکیە لە لایەن زیاتر لە یەك ملیۆن ئاخێو لـە ڕۆژهـەلاّتی ئۆگەندا قسەی پێدەکرێت هەروەها زۆر نزیکە لە زمانی ئەکۆلی و بە شێوەی ئەلفبای ڕۆمانی دەنووسرێت.

## Language
### زمان

زمـــان ئـــەو کاتـــە دەبێتـــە زمـــان کـــە دەنگـــەکانی بەشـــێوەی ئۆرگـــانی و سیستیماتیکی گوزارشت لە دەنگە مرۆیـەکان دەکـات . هـەر پەیوەندیـەکی ئاخاوتن لە کۆمەڵگای زمانیی ئاخاوتن ناسنامەی زمان وەردەگرێت ئەگەر لە نێوان ئاخێوەر و وەرگر لەیەککگەیشتن هەبوو.زمانی منداڵی ساوا و نوزە نوزی هەندێ گیانەوەر ناچنە ناو چوارچێوەی زمانەوە.

## Language aptitude
### توانای زمان

توانای زمان بریتیە لە توانای سروشتی مـــرۆڤ بـــۆ فێربـــوونی زمـــان .ئـــەو بیرۆکەیە سەربەخۆیە و تەواو جودایە لە زیرەکی و مۆتیڤەیشن و دەرفەت.

## Language areas
### ناوچەکانی زمان

ئەو ناوچانە لە مێشکی مرۆڤ هەن و پەیوەستن بە قسەکردن و خوێندنەوە و فێربوون.دوو ناوچەی سەرەکی هەن تایبەتن بە ئاخاوتن و بیستن ، ئـەو دووە ئەگەر بریندار بن کاریگەر دەبن بە سەر پرۆسەی قسەکردن و بیستن.

## Language arts
### هونەری زمان

ناوچەکانی زمان کە لـە مێشـکی مـرۆڤ هـەن کـە تایبـەتن بـە پـەیڕەو پرۆگرامی پەروەردەیی بـۆ چـوار بـەهرەکانی فێربـوون: قسـەکردن ، بیسـتن

،خوێندنەوە ، نووسین هەروەها ئـەو بیرۆکانـەی پەیوەسـتن بـە رێنووسـکردن و پەیوەندی ناکردەکی.

## Language as nation's identity

### زمان وەك ناسنامەی نەتەوە

زمان مەرجی جیاکردنەوەی نەتەوەیەکە لە نەتەوەیـەکی دی لـە ڕواڵەتـدا هـەروەها هەسـتی نـاخی مـرۆڤ ناسـنامەیەکی نـاخی نەتەوەیـە .باشـووری کوردستان بە حـوکمی ئیسـتیعماری لۆکـەلی بۆتـە هـەرێمی کوردسـتان و دەرەوەی کوردستان ، بۆ ئەوەی ئـەو دوو دەڤـەرە ببوونـەوە یـەك ، زمـان وەك ناسنامەی نەتەوە دەتوانێت ئەو ڕۆڵە ببینێت.لە لایـەکی دی ، مـادام کـورد بڕیاری ئەوەی داوە شەریك بێ لە هەرەمی دەسەڵاتی عیراقدا ،ئەوا قسەکردن بە زمانی کوردی مەرجێکە بۆ هـەبوونی کیـانێکی فیـدرالی چـەند زمـانی چەند نەتەوەیی لە عیراقدا.

### زمانی کوردی لە ناو دەستووری عێراق

پرۆژەیەك بۆ پەرلەمانتارە نوێیەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق

لەکۆمەڵگای کراوەدا ، کە مرۆڤ وەك بونەوەرێکی پڕ ڕێز چەقی فەلسەفەی سیاسی دام و دەزگاکان پێکدێنێ ، چاوەڕێ دەکرێ دەمارەکـانی دکتاتۆریـەتی سیاسی ، نەتەوەیی هەتا کەسیی خاو ببنەوە ، بەشێوازێکی تر ، مـرۆڤ ناتوانـێ بە ئازادی خۆی وەك بونەوەرێکی زمانەوانی ئینسانی دەرك بە بوونی سیاسـی خۆی بکات هەتا لەمپەرەکانی بەردەم کۆمەڵگای کراوە لانـەبرێن. ئەنزیمـەی عەرەبی لە عیراق نەیتوانیوە هیچ گۆڕانکارییەك لە زهنیەتی تـاکی عـەرەبی بکات ، چونکە حیزبی عەرەبی خاوەن هەر فەلسـەفەیەکی سیاسـی بـێ یـان

هەتا هەر رەوتێکی سیاسیش بێت عەلمانی بێ یان (نا ـ عەلمانی) نەیتوانیوە لەبەرانبەر کورد گڕ لە کەلتووری شۆفێنزمی سیاسی و نەتەوەیی بەربدات. لەهەندێ قۆناغی سیاسیدا، حیزبی عەرەبی وەك حیزبێکی کەمالی ئەتاتورکی لە ئاست کورددا نەك هەر شۆڤینیەت بەڵکو بەرەو فاشیەت چووە.
کورد لەمێژووی عیراقدا بەدوو جۆر (بەشداری سیاسی) لەگەڵ عەرەبی عێراقدا کردووە. لەسەردەمی پاشایەتیدا بەشێك لە کورد بەشداری سیاسی لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی داکردووە. بەشێکی تر لەدوای روخانی رژێمی بەعسی وەك پارتی سیاسی بەشداریان لەو ئەنجومەنە کردووە.

ئەگەرچی ئەو دوو (بەشە) لە کورد لەیەك جیان: ئەوانەی سەردەمی پاشایەتی (تەواو) نوێنەری کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان نەبوونە، بەڵام ئەوانەی دوایی لەرێگای هەڵبژاردنەوە، وەك نوێنەری حیزب و خەڵك بەشداربوونە، ئەم نووسینە هەوڵ دەدات ئەو راستیە روون بکاتەوە کە دەسەڵاتی کوردیش مکوڕ بووە لەپاراستنی حاڵەتی داگیرکردن لە کوردستان و دیار نەبوونی ناسنامەی نەتەوەیی کورد لە عیراقدا، وێڕای ئەمەش تەواو جەخت لەسەر (زمان)ی نوێنەرانی کورد دەکات، کە کەسیان جورئەت ناکەن بەزمانی خۆیان بدوێن. دەبێ هۆکارو پاساوەکان چین؟

عەرەبەکانی دەسەڵات بە (شیعە) و (سونە) و (عەلمانی)یەوە باوەڕیان بە بنەماکانی سیستەمی فیدرالی نییە، ئەوان بەحوکمی (زۆرینە) و (دەسەڵات) هەتا (دین) خوێندنەوەیەکی عەرەبایەتی بۆ ناسنامەی عیراق دەکەن، ئەوان عیراق وەك هەر دەوڵەتێکی دی عەرەبی دەبینن، کوردیش وەك (نەتەوەی دووەم و خاوەن ماڵ و شەریك) ناخوێنێتەوە، کورد لە نەزەر ئەوان (ئەقەلیەتی

قەومیە) نەك نەتەوەیەكی جودا لەعەرەب و خاوەن خاك لـەعیراقی زۆرەملـێ زۆربەی پەرلەمانتارەكانی كورد لە بەغدا (سیاسی) و (نەتەوەیی) نـین و لـە مەسەلە نەتەوەییەكان، وەك (زمان) و (جوگرافیـا)ی نەتـەوەیی بـێ ئاگـان. ئەمەریكا گەمەی سیاسی لە عـیراق بـە (ئاراسـتەیەك)دا بـردووە، كێشـەی دەسەڵاتی سیاسی كورد لە بەغدا هەر تەنیا بۆتە قسەكردن لەسەر بودجـە!! بەجۆرێك چارەنووسی سیاسی هەرێمی كوردستان بەرەوشی بودجەی عیراقـەوە بەستراوەتەوە، هەر كێشەیەكی سیاسی لە پاشان عەسكەری لەنێوان (بەغدا) و (هەولێر) دروست ببێ و بەغدا بودجەی هەرێم نـەنێرێ، ئـەوە گـەورەترین كێشەی سیاسی و ئابووری لەكوردستان بەرپا دەبێت كورد لە بەغدا عـەرەب بە (برا گـەورە) دەخوێنێتـەوە، بـەگوفتارو رەفتـاری خۆیـان لـە پەرلـەمانی عیراقیدا جەخت لەسەر (یەك گەلی). عیراق دەكەنەوە!

ئەگەر فاكتەری زمانی جودا كاری لەسەر نەكرێ، چـۆن بزانـرێ لـەعیراق زیاتر لە نەتەوەو گەلێك هەیە؟

ئەوە دوو خولی پێشوو تـەنیا كاریـان لەسـەر ناسـنامەی كـورد لـەرووی زمانەوە نەكرد ئەمجارە كە نوێنـەرانی كوردسـتان (نـەك كـورد) هـەر تـەنیا نوێنەری دەسەڵاتی كورد نین، بەڵكو ئۆپۆزسیۆنیش بە قەبارەیـەكی گـەورەتر لـەجاری پێشـوو بەشـدارە، بۆیـە دەتـوانن مەسـەلەی زمـان وەك پرۆژەیـەك پێشكەشی پەرلەمانی عیراقی بكەن، پرۆژەی زمانی كـوردی بـۆ دیـاركردنی هەقیقەتی دوو نەتەوە لە عیراق مەسەلەیەكی فاكتـەری زمـان رۆڵێكـی زۆر گرنگ دەگێرێ لەرۆنانی جودایی نەتەوەدا، زمان و بونیادی نەتەوە لەوڵاتێكی

فرە نەتەوەدا پێویستییەکی حەتمییە بۆ پاراستنی کەلتور و زمان و دینی نەتەوە Language and nation – building زمان یەکێ لە ئەستونە پتەوەکانی ناسنامەی نەتەوەییە، بۆیە گرنگە نەك هەر نوێنەرانی کورد لەهەرەمی دەسەلاتی ئەو جۆرە دەولەتەدا، بەلکو تاکەکانیش مەسەلەی زمان بە ئامانجی ستراتیژی خۆیان بزانن و بە بەشێك لە ئاسایشی نەتەوەیی بزانن نوێنەری کوردستان دەتوانن لەسەر چەند بنەماو شەنگستێك (شەڕی زمان) لەگەڵ نوێنەرانی (باشور) و (ناوەڕاست) ی عیراق بکەن.

عەرەب فاکتەری دین زۆر دیماگۆژیانە بەکاردەهێنن هەتا عەلمانییەکانی عەرەبیش بە بەهانەی زمانی قورئانەوە (پرۆسەی تەعریب) بەسەر (غەیرە عەرەب) پەیڕەو دەکەن. هەر لەدامەزراندنی یەکەم حکومەتی عیراقیدا، کەسێکی وەك (ساتع ئەلحەسەری) وەزیری مەعاریفی ئەوسا، شەڕی تۆفیق وەهبی دەکرد بەوەی نابێ لەپێناو دروستکردنی ئەو دەنگانەی لەزمانی عەرەبی نیین و لەزمانی کوردی داهەن لەسەر شێوەی پیتی عەرەبی گۆڕانکاریان تێدا بکرێ!! ئەو وەزیرەی حکومەتی ژێر سایەی ئینگلیز دەیگوت: نابێ دەسکاری پیتەکانی زمانی عەرەبی بکرێت، چونکە زمانی قورئانی پیرۆزە!! بێگومان (ئەلحەسەری) دەیزانی ئەم گۆڕانکاریە پەیوەندی بەزمانی قورئانەوە نییە، چونکە زیاتر لەسەردەمی (ئیمامی عەلی) نەك پێغەمبەرو سێ خەلیفەکەی تر ئەو پیتانەی زمانی قورئان سەرە و بۆر) و نوختەیان بۆ کراوە!!

لەلایەکی ترەوە (زمانی قورئان) و (ئاخاوتنی عەرەبی) زۆر لەیەك جودان. شێوەی ئاخاوتنی عیراقی هیچ پەیوەندییەکی بەزمانی قورئانەوە نییە ئەمەو

زمانی قورئان، زمانی قورئانەو زمانێکی (ئومەمی)یە نەك (نەتەوەیی) دوا دینی خودا دینێکی جیهانییە نەك نەتەوەیی، بۆیە زمانەکەشی زمانێکی ڕۆحانی جیهانییە.

قورئانی پیرۆز فاکتەری زمان بە بونیادی نەتەوە هەروەها بە ئایەتێکی خودای گەورە داناوە: (وجعلناكم شعوبا وقبائلا.. ومن اياته اختلاف السنتكم) جودایی ئەم (دووە ـ زمان و نەتەوە) دەسەڵاتی پڕ هەژموونی خودا لە ئافراندنی مرۆڤی یەك شێوازی زمان و نەتەوەی جودا دەسەلمێنێ. مرۆڤ خۆی بونەوەرێکی زمانەوانییە. ئەو هەقیقەتەش ئەوکاتە تەواو دەرکی پێدەکرێ کە تەواو لەپرسی تایپۆلۆژیای زمانەکان بگەین کە هیچ دوو (زمان)ێك هەرچەندە لەهەمان خێزانە زمان بن بەگوێرەی تیۆرەکانی (فۆنیم) و (مۆرفیم) و (سینتاکس) وەك یەك نیین! لەم ڕوانگەوە نوێنەرانی کوردستان دەتوانن تەواو داکۆکی لە قودسیەتی زمانی خۆیان بکەن و ئەو ئەفسانەی عەرەبەکانی دەسەڵات پوچەڵتر بکەنەوە و شانازی بەزمانی خۆیان بکەن، چونکە خودای گەورە شانازی بە زاتی خۆی دەکات بەوەی ئەو هەموو مرۆڤەی لەیەك (مرۆڤ ـ ئادەم) دروست کردووە و خاوەن ئەو هەموو زمانە جودایەن.

بەپێی دەستووری کاتی عیراقی سەردەمی شۆڕشی چواردەی تەمموز، کورد لە عەرەب جودایە لەگەڵ عەرەبی عیراق هاوبەشە لەدەوڵەتی عیراق، لەسەردەمی پاشایەتیش بەگوێرەی بنەماکانی بڕیاری سەربەخۆیی عیراق ئاماژە بەکورد کراوە وەك نەتەوەیەکی جیاواز لەعیراق کە دەبێ زمانی خۆی لەولاتی خۆی بەکاربێنێ حکومەتی عیراقی لە ١٩٣١/٥/٢٣ پەیمانی "یاسای زمانە ناوچەییەکانی بلاوکردەوە بەناوی یاسای ژمارە (٧٤) ئەم

یاسایە لەژمارە (٩٨٩) الوقـائع العراقيـە لـە ١٩٣١/٦/١ بلاوکراوەتـەوە. لەدەستووری ئێستای عیراقدا زمانی کوردی لەهەرێمی کوردسـتان زمـانێکی فەرمییە و زمانی یەکەمە، هەروەها لەباشور و ناوەڕاستی عیراقـیش زمـانی دووەمە، ئایا (دەق) لەمە راشکاوتر دەبێ؟! ئایا فەرامۆشـکردنی ئـەم دەقـە لەلایەن خودی سەرۆك کۆمار و وەزیرە کوردەکـان و پەرلـەمانتارە کوردەکـان هەڵاتن نییە لە (کـوردێتی)؟ دەبـێ بیـانووی ئەوانـە چـی بـێ؟! ئایـا ئـەو بێدەنگییەی ئەو (پۆسـتدارانە) بـە عـەرەب ناسـاندنی عـیراق ناگەیـەنێ؟! خۆشمان دەزانین، ئەگەر سەرۆك کۆمار گوتـارێکی نیشـتمانی بـە (کـوردی) بدات و لەژێرەوە قسەکانی بـۆ عـەرەب وەربگێـڕدرێ لـە ٨٠٪ عەرەبـەکانی عیراق بە (زگ دەدەن!) بەڵام ئەگەر هەمان گوتار بە (ئینگلیزی) بدات هـیچ روونادات؟! سەرۆك کۆمار و کوردەکانی تر بەگوێرەی دەستوری عیراقی بۆیـان هەیە بەزمانی زگماکی خۆیان بدوێن و بنووسن، لەم روانگـەوە بـەکارهێنانی زمانی کوردی لەو دام و دەزگایانە تەواو ئەو راستییە ساغ دەکاتـەوە کـە لـە عیراقدا دوو نەتەوەی جیاواز دەژین. ئەگەر کورد خۆی ئـەو هـەنگاوە ناوێـت، هەرگیز عەرەبەکان چ عەلمانی چ (نا عەلمانی) نەك ئەو هەنگاوە ناوێن بەڵکو ناشهێڵن.

زمان جودایی بەڵگەیە لەسەر کوردستانێتی ناوچە جێ ناکۆکەکان.

هەردوو بەندی (٥٨) ی کۆن و (١٤٠)ی فەرامۆشـکراو بـەڕێگای دیـاری کردنی پرۆسەی زمانی جوداوە چارەسەر دەکرێن، هەموو عەرەبێك دەزانێ ئەوە دەسەڵاتی عەرەبی بووە کە لەسەردەمی حکومەتەکەی نوری سەعیدەوە هـەتا ئێستا خەریکی بەعەرەبکردنی کوردستانن ئەمـە راسـتیەکە هـیچ کەسـێك

ناتوانێ نکوڵی لێ بکات، دەسەڵاتی کوردی دەتوانێ بانگی هەموو ڕێکخراوە جیهانییەکان بکات لەسەر بنەمای زمان چارەنووسی ئەو جێیانە دیاری بکرێ، دەسەڵاتی عەرەبی باوەڕی بە فاکتەری مێژو و سیاسی نییە، دەسەڵاتی کوردی لەو روانگەوە هەوڵی لەگەڵ دان، بەس ئەو عەقڵیەتە ئەمەی قەبوڵ نییە، بەڵام کورد بە پاڵپشتی هەر ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی دەتوانێ لەسەر بنەمای زمانەوە ئەو ناوچانە بگێڕێتەوە سەر کوردستان. عەرەبی عیراق ئەگەر بۆ مەسەلەی هەوالگری یان ناچاری نەبێ نایەوێ (کوردی) فێرببێ، هەرچی کوردە بەتایبەتی کوردی ئەو جێیانە کوردی و عەرەبی چاك دەزانێ، لەو پێودانگەوە دەکرێ خەڵکی ئەو ناوچانە لەڕووی زمانەوە تێست بکرێن Test.

زمانی کوردی بونیادی نەتەوەی کوردی دەگەیەنێ، زمان و نەتەوە هاوتای یەکترن، هەر بەزمانەوەش ناسنامەی نەتەوە دەردەکەوێت، ئەو دووەش هەردووك ئایەتی گەورەیی خودا دەسەلمێنن، بەکەمزانی زمانی ئەویتر، یان هەوڵدان بۆ سڕینەوەی زمانی ئەویتر شۆڤێنیزمی زمانی لێ بەرپا دەبێت، هەروەها پێکۆڵە، هەوڵێکە بۆ سڕینەوەی ئایەتێکی خودای گەورە هەروەها ڕەتکردنەوەی چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزە.

نوێنەرانی کوردستان لە پەرلەمانی ئایندەی عیراق لەسەریانە وەك (موسلمان) وەك (کورد) لەهەموو دانیشتنەکانی پەرلەمانی عیراقی بە (کوردی) قسە بکەن بەمەش هەم پەیامێکی خودا جێبەجێ دەکەن، هەم تەواو بەندێکی دەستووری عیراقی جێبەجێ دەکەن کە دان بە ناسنامەی قەومی و زمانی نەتەوەیی کورد دادەنێت.

ئەگەر لەم خولەی پەرلەمانی عیراقی نوێنەرانی کوردستان نەتوانن لەسەر بنەماکانی (زمان) و (نەتەوە) سنووری جوگرافیی کوردستانی باشور (نـەك هەرێمی کوردستان) لەگەڵ دەسەڵاتی عەرەبی بەغدا یەکلا بکەنەوە، ئەوە لە خولەکانی ئاییندە ڕەوشەکە زۆر ئاڵۆزتر دەبێت و بـەدوور نـازانرێ عەرەبـەکان مەسـەلەی سـاغ نەبوونـەوەی زمـانی فـەرمیی لەکوردسـتان و بزاڤـی جووتستاندەری لـە کوردسـتان بقۆزنـەوە و زمـانی کـوردی تـەنیا بـەزمانی (هەولێر) و سلێمانی شرۆڤە بکەن!!

## Language awareness
## وشیاری زمانی

وشیاری یا وریایی زمان بریتیە لە وەڵامدانەوەی ڕەخنەیی و هەستیاریی و نافۆرمەلەیی بۆ بەکارهێنانی زمان لە لای کەسێك و کەسـەکانی.ئەو زمـان وریاییە ئامانجی زمانەوانییە.

## Language barrier
## پەرژینی زمان

بریتیە لەو ئاستەنگ و دژواریانەی ڕووبەڕووی ئەو خەڵکانە دەبێتـەوە کـە هەمان زمانی دایکیان لەگەڵ وەرگرەکە کاتی هەوڵ دەدەن پەیوەندی بکـەن ، بۆ ئەوەی ئەو دژواریانە لە نێـو ببـەین زۆر ڕێگـا هـەن لەوانـە وەرگێـران و تەفسیرکردن.

## Language change
## گۆڕانی زمان

گۆڕانی زمان پرۆسەیەکی سروشتی زمانە.ئەو پرۆسەی گۆڕانە لە ناخی زمانە لە سەردەمێکدایە مەسەلەیەکی یونیڤێرساڵی و نەوەستاوە و بەردەوامە و زیندوویەتی زمان دەگەیەنێت.ئەو گۆڕانە لە سەدەی هەژدەهەم لە لایەن زمانەوانی بواری فیلۆلۆژی بەراورد دۆزرایەوە لە کاتی ئێستاش زمانەوانی مێژوویی و کۆزمانەوانی قسە لەو بارەیەوە دەکەن.زمانی کوردی سەدەی نۆزدەهەم و زمانی ئێستا باشترین بەڵگەن بۆ ڕەوشی گۆڕانی زمان.

## Language death
## مردنی زمان

بریتیە لە ونبوونی زمان لە بوارە چالاکەکانی کۆمەڵگا و قەتیسبوونی تەنیا لە بوارێکدا .لە ئوستralیا و ئەمریکای باکوور لە کۆندا هەبوو ، بەلام زۆربەی ئەو زمانانە ون بوون و زمانی ئینگلیزی جێی گرتوونەتەوە.کۆمەڵگا و تاك دەوری سەرەکی دەبینن لە ونبوونی زمان بە شێوەیەکی پەیتا پەیتایی ، بەلام دەسەلاتی داگیرکەری دەورێکی بالای هەیە.

## Language disorder
## پەشێوی زمان

پەشێوی زمان بە شێوەیەکی زۆرتربە هۆی تێکچوونی هەردوو ناوچەی دەماغ دەبێت وەك قسەنەکردن و نەبیستن.

## Language dominance
### زمان زالی

ئەو دیاردەیە تەنها لە کۆمەڵگای چەند –زمانی هەیە کە زمانێـك زاڵ و گرینگتر دەردەکەویٚ لە زمانی تر هەندیٚ جار ئەو هۆکـارە بـە هـۆی ژمـارەی ئاخێو دەبێت ئەوەش ڕۆڵێکی ئەرێی دەبێت .

## Language generation
### نەوەی زمان

نەوەی زمان بریتیە لە ئافراندن و بەرهەمی ئاخاوتن و نووسین و پـەیامی هێمایی لە لایەن خەڵك و کۆمپیوتەر، ئەو زاراوەیە زیاتر بەکاردێت لە بواری دارژتنی کۆمپیۆشنی دەقی چاپکراو.

## Language isolate
### تەنیایی زمان

قەتیسبوونی زمان لە ناوچەیەك، کەواتە تەنیایی زمان بریتیە لەو زمانەی ناتوانێت ببێتە ئەندامێك لـە خێزانـی فـرە، باسـك لـە ئیسـپانیا نموونـەی کلاسیکیە.

## Language learning
### فێربوونی زمان

پرۆسەی فێربوونی زمان مەسـەلەیەکە پەیوەنـدی بـە هۆکـاری نـاوەوەیی تاکەوە وەیە .ئەو فێربوونەوە پەیوەستە بە زمانی دایك و زمانی بیانی.

# Language loss

## ونکردنی زمان

ئەو پرۆسەیە لە لایەن تاکەوە لە دوو ڕێگەوە دەبێت :

١.تراوما-برین لە مێشك،

٢.ونبوونی تاك لە کۆمەڵگای بیانی

هەروەها ئەو ونبوونەی زمان هەمیشەیی و کاتی دەبێت.

# Language loyalty

## دڵسۆزی بۆ زمان

بۆ دەربڕینی دڵسۆزی بۆ زمان دوو ڕێگەی سەرەکی هەیە :

١.پاراستنی بەکارهێنانی زمان ،

٢.هێشتنەوەی شێوەی کۆنی زمان.

دوورخستنەوەی زمان لە گۆڕان وەك پیاوانی هیندۆسی بەرانبەر سانسکریتی دەیانکرد.

## کوشتنی زمان

زاراوەی کوشتنی زمان زاراوەیەکی سۆزداریە .ئەو کوشتنە لە دوو ڕێگەی سەرەکی دەبێت :

١.مردنی ئاخێوانی زمانەکە ،

٢. کاریگەری زمانێکی تر لە سەر زمانەکە

## Language pathology
## نەخۆشی زمان

نەخۆشی زمان بریتییە لە دیراسەکردنی هەموو فۆرمەکانی رەفتاری زمانەوانی ناسروشتیە بە تایبەتی کە ئەو ڕەفتارانە پەیوەستن بە ڕەوشی میدیکەلی.

## Language planning
## پلانی زمان

کورد بە خوێنەوار و نەخوێنەواری کار لە سەر بنەمای نازمانەوانی دەکات بۆ قەراردان لە سەر زمانی ستاندەر :فاکتەری مێژوو و ژمارە گرەو کردنە لە سەر ئەسپی تۆپیو .قەوانی ئەو دوو بەرەیە کۆتایی نایێ هەروەها رەنج بە خەساریە .پلانی زمان ئیش لە سەر رەوشی زمان دەکات و دوورە لە هەردوو فاکتەری سەرەوە.پلانی زمان ، شێوازێکە زمان لە میر وەردەگرتەوە و دەیداتەوە بە زانا و گەدای ولآت .ئەو ڕێگایە تەواو دیموکراسی زمان دەسەلمێنێ ، چونکە هەموو تاکەکانی نەتەوە بێگوێدانە دەڤەر و عەشیرەت زمانێك بۆ پەروەردە و حکومەت قەرار دەکات .هەر ئەو خودی دەسەلآتی زمان دەگەیەنێت زمان بە ئاشتی لە چنگی سیاسەتوانی کورد دەردێنێ!ئەو هەوڵە هەوڵێکی وشیاریە.

## Language policy
## سیاسەتی زمان

واتای بنەڕەتی ئەو پرۆسەیە بریتیە لەوەی شێوەیەکی زمان بە زمان دابنێی.لە فەرەنسا لە سەردەمی ناپلیۆن هەتا ئێستا سیاسەتی زمان بریتیە لە بەرزکردنەوەی زمانی فەرەنسی لە دامودەزگاکان و موستەعمەرەکان بۆ ئەوەی ببێتە زمانی نیشتیمانی لە سەر حسێبی زمان و دایەلێکتی تر.

## Language suicide
## خۆکوشتنی زمان

دیاردەی خۆکوشتنی زمان دیاردەیەکی نوێیە لە بەرانبەر دیاردەی کوشتنی زمان دارێژرا|.لە کۆمەڵگایەکی چەند زمانیدا کاتێ دروستدەبێ کە تاك بە خۆهێشتی خۆی واز لە قسەکردن بە زمانەکەی دێنێ و پەسەندی زمانێکی تر دەکات بە تایبەتی زمانی دەسەلاّت.

## Language and tribe
## زمان و خێل

سستاندەربوون ، لە لایەك پرۆسەیەکی سۆسیۆ- سیاسییە ، لە لایەکی تر پرۆسەیەکی زمانەوانی - سیاسییە ،ئامانجی ئەم پرۆسەیە " دروستکردنی " زمانێکە لە زار یان بنزارێکی زمانی نەتەوە بۆ ئەوەی ببێتە زمانی خوێندن و فێرکردن لەناو سیستەمی پەروەردەدا . ئەم زمانە لە بنەڕەتدا نە زمانی دایکە " و نە زمانی ئاخاوتنی نەتەوەیە !

ئەم زمانە بە سێ ڕێگە دروست دەبێ ، ڕێگای لـە خـۆوەیی ، هـەژموونی زارێك لەناو زارەکانی دی نەتەوە بەهۆی جیۆپۆلیتیکی و سیاسـی شـوێنەکە زارەکە دەکاتە زمانی سـتاندەری نەتـەوە ، یـان بـەهۆی دەقێکـی ئـایینی و هەژموونی ئەو دەقە بەسەر دەسەلاّتی سیاسـی ولاّتـدا یـان دەقـی ئـەدەبی ، زارێك لە زارەکانی نەتەوە دەبێتە زمانی ستاندەر !

ڕێگای دووەم ، هەوڵی تاکە کەسی ،ئەکادیمیا ، یان دەسەلاّتی سیاسی بـۆ "سەپاندنی" زارێك لە زارەکانی زمانی نەتەوە . بۆ هەریەك لەمانە چـەندەها نموونـە لـەناو نەتەوەکانـدا هـەن ! ڕێگـای سـێیەم ، پلانـی زمـان ، ئەمـە ڕێگایەکی زمانەوانییە بۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی زمـانی سـتاندەر . ئـەم ڕێگایە بۆ کورد چاکترین ڕێگەیـە ، چـونکە هـەموو زانایـانی زمانـەوانی و عەوامێکی نەتەوە لەو پرۆسەیە بەشدار دەبن ، چونکە بە هەوڵی زمانـەوانی دەست پێدەکات بە دەنگی خەڵکی عەوام و نا_عەوام کۆتایی پێدێ !

چەند پارچـە کردنـی کوردسـتان و هـەبوونی چـەند زارێـك ، ئاسایشـی نەتەوەیی زمانی کوردی تووشی چەندەها گرفتی ستراتیژی کردووە، ئارێشەی هەرە سەرەکی نەبوونی

زمـانێکی سـتاندەرە ! تورکـەکانی تورکیـا ، عەرەبـەکانی سـوریا و فارسەکانی ئێران دەرفەتیان بە منـداڵی کـوردی نـەداوە ، کـە بـە زمـانی نەتەوەیی خۆیان بخوێنن . ئەمە وایکردووە، کە زمانی کوردی لەو بەشانە زۆر لاواز ببـێ ، و لـە دەرەوەی سیسـتەمی پـەروەردەو خوێنـدن بـێ بـەلاّم لـە باشووری کوردستان هەر پـێش دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عێـراق ، زمـانێکی

ئەدەبی هەبووە و لە پاشان دەوڵەتی عێراقیش وەك ( زمانێك ) لـە بەشـێكی کوردستان دانی پێداناوە .

ئەو ڕەوشە سیاسیەی کورد- دابەشکردنی کوردستان- وایکردووە ، بەشێ لە رۆناکبیری کورد تەسلیمی واقیعی داگیرکردن بووەو بەرگـەی سیاسـەت و سیسـتەمی خوێنـدنی ئـەوانی نـەکردووەو تەبـەنی هـەردوو ئـەلفبای داگیرکەرانی:

ئەلفبێی ( لاتینی) و (سلاڤی ) کردووە. بەڕاستی فاکتەری ئایدیۆلۆژیا و سیکیولاریزمی دینیی ڕۆڵی خۆیان بینیووە لەو پرۆسە داگیرکاریە کەلتوریـە ، کە ئەمڕۆ دەردەکەوێ کە هیچ کاریگەری لە داگیرکاری عەسـکەری کـەمتر نییە! بەلاّم لە باشورر ، کورد دەست بەرداری ئەلفبێ ڕەسەنەکەی خۆی نەبووە ، بەڵکو هێندە گرنگی پێداوە بە جۆرێ هیچ کێشـەکی زمانـەوانی ئـەوتۆی تێدانەماوە.ئەلفبێی کوردی زۆر بێ کێشەترە لە ئەلفبێی لاتـینی بـۆ زمـانی ئینگلیـزی و فەرەنسـیلوێڕای ئـەو ڕاسـتیەش ئـەکادیمیای کـوردی لـە دوو کۆنفرانسداتوانی ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردی بریار لە سەر بدات.

ێستا لە سەردەمی حوکمڕانی کوردیدا چاوەڕێ دەکرا ، حکومـەتی کـوردی مەسەلەی زمانی ستاندەر بە پرۆژەیەکی ستراتیژی نەتەوەیی پێناسە بکا بەلاّم ئەفسوس کە قسە لە سەر زمانێکی ستاندەر دەکرێ هێندە ئارێشـە بـۆ ئـەو پرۆسەیە دروست دەکرێ وا دەزانیت لە ناو حکومەتێکی نا-کوردی دەژیین!!، لـەو لاوەش کۆمـەڵێ شـەهادەداری کـورد لـە دەرەوە و نـاوەوەی کوردسـتان دەیانەوێ کورد چەند ستاندەرێکی هەبێ نەك یەك ستاندەر . سـەیرەکە لـەوە دایە حکومەتـە یـەك لـە دوا یەکـەکانی سـەردەمی پاشـایەتی و کۆمـاری

باوەڕیان بە یەك ستاندەری کوردی هەبوو ، بەلاّم سیاسەتمەدار و رۆشنبیری کورد لە ژێر سایەی حکومەتی کوردی بانگەشەی فرەستاندەری کوردی دەکەن؟؟!! هەموونەوانەش دیاردەی فرە زاری زمانی کوردی دەکەنە بەهانە و کاری لە سەر دەکەن

دەبێ دیاردەی فرەزاری مەسەلەیەك بێ هیچ نەتەوەیەك کاری لە سەر کردبێ؟خۆم باوەڕ ناکەم هیچ نەتەوەیە گەیشتبێتە قۆناغی نەتەوەبوون لە هزر و بیرکردنەوە و هەست..زارەکانی نەتەوەکەی بەرەو زمانی جودا ببات.عەرەبی ئیسلامی و عەلمانی و مەسیحی و جولەکە لە سەر هیچ کۆك و هاوڕا نەبن لە سەر مەسەلەی یەك زمانی ستاندەری عەرەبی کۆك و هاوڕان.هەبوونی چەند زارێك لە زمانێکدا دیاردەیەکی ناوازە و نا-سروشتی نیە، بۆیە ئەو بەهانەیە هیچ بنەمایەکی نییە و تەنها مەسەلەیەکەلە واهیمەی ئەو کەسانە دایە هێشتا لە تەلبسمی پیرۆزکراوی قەلەمڕەوی عەشیرەت ڕزگاریان نەبووە و هەروەها بەلگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە ئەوانە بە ئاگایی یان بێ ئاگایی زمان و زار لە یەکتر جیاناکەنەوە!

**لێرەدا گرنگە ، ( زمان- ) و ( زار ) لەیەك جودابکەینەوە**

زمان- ناسنامەی نەتەوەیە هەروەها بونیادی نەتەوە پێکدێنێ، هەرچی ز ارە ئەوە بەشێکە لە(زمان ) و بەشێکە لە نەتەوە نەك هەموو نەتەوە هەروەها زار زیاتر جوگرافییە ، یان کۆمەلاّیەتی نەك ئەتنیکی ! هەروەها ئەوە (زار )_ ە لەسەر ئاستی یەك نەتەوەدا ، کە زمانی دایکە نەك خودی زمانەکە ، چونکە ئەوەی پێی دەوترێ زمانی ستاندەر زمانی نووسینە ، خوێندنە نەك ئاخاوتنی مندالاّن !!

زمانی ستاندەر کۆکەرەوەی ئاخێوەری زارەکانی کوردیە ،هەروەها مولکی هیچ دەڤەرو توێژو چینێك نییە ، بەڵکومولکی هەموو نەتەوەیە ، چونکە هەر زارێك کەپاش چەندەها گۆڕانکاری دەبێتە زمان ، سیما و ئەدگارەکانی (زار ) لە دەست دەدات و لە زمانی عەشیرەت و هۆزو دەڤەرێکی جوگرافی دەربازی دەبێ و دەبێت بە زمانی نووسینی هەموو نەتەوە. لەناو نەتەوەیەکیش تەنها یەك زمانی ستاندەر دروست دەبێ نەك هەر زارو بنزارێکی زمانی نەتەوە بکرێنە زمانی ستاندەر . فرە ئاینی و فرە مەزهەبی و فرە زاریی دیاردەی ساخلەم و سروشتی —ن ، بەڵام فرەستاندەری سەرەتانی نەتەوەیە و هەڕەشە لە تەواوی نەتەوە و پێکهاتەکانی دەکات!

لەم ڕوانگەوە با بە جدی و زانستیانە وەك زمانەوانێك و لە سەر بنەماکانی زمانەوانی قسە لە سەر هۆکاریتر بکەین و بزانین هیچ ئارگومێنتێك لەو بانگەشانە هەن کە لێرە و لەوێ دەورووژێنرێن!!

هەندێ کێشەکە لە ڕێنووسدا دەبینن، هندێکیتر، مەسەلەی نەبوونی قەوارەیەکی نەتەوەیی بە هۆکارێکی سەرەکی دروست نەبوونی زمانی ستاندەر دادەنێن!!

هەبوونی (سێ) ئەلفبێ لە ناو کوردان ئارێشەیەکی دژوار نییە ، چونکە هەردوو ئەلفبێی لاتینی و سلاڤی زیاتر ئەلفبێی سیاسین و بە سەر کورد و زمانی کوردی سەپێندراون و لە ئاکامی پرۆسەیەکی زمانەوانیەوە دروست نەبوون:سلاڤیەکە لە ناو کوردانی ئێزیدی ئەرمێنیا بەرپا بوو هەروەها ئەو جۆرە ئەلفبێیە بەشێ بوو لە ستراتیژیەتی کۆمۆنیستی و هۆکارێك بوو بۆ

چەوساندنەوەی ئاینی و نەتەوەیی ! کەواتە ئەو پرۆسەیە پرۆسەیەکی خۆهێشتی نەبوو !

ئەو ئەلفبێیە هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی بە سەر مەسەلەی زمانی ستاندەری کوردییەوە نییە!

هەرچی ئەلفبێی لاتینییە، ئەلفبێیەکی "ئاینیی" و "رۆژئاواییە" و موڵکی هیچ نەتەوەیەك نییە و مۆرکی نەتەوەیی نییە و ئەلفبێیەکی تێژی ئاریشەیە!

سەپاندنی ئەلفبێی لاتینی بە سەر کورد و زمانی کوردی پرۆسەی سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی کوردی زۆر ئاسانتر کردووە و بۆتە هۆکارێك بۆ ئەوەی کوردی باکور نەتوانن بە کوردی بە دروستی بنووسن و بخوێننەوە ئەمەش حاڵەتێکی نەخوێنداری لە ناو کوردان دروست کردووە بەجۆرێ لەو بیست ملیۆن کوردەی ئەوێ ، دوو ملیۆن کوردی ناتوانێ دەقێکی کوردی بە دروستی بخوێنێتەوە!هەروەها بە حوکمی ئەوەی بلاوکردنەوە بە زمانی کوردی قەدەغەبووە ، بۆیە ژمارەیەکی یەکجار کەمی کتێب بەو ئەلفبێیە هەیە . وێڕای ئەمەش ئەو حاڵەتە وایکردووەکوردی باشور و باکور درەنگتر لە یەك بگەن و پرۆسەی یەکگرتنەوە دژوارتر بێ.

لە باشووری کوردستان ، هەر لەسەدەی نۆزدەهەمەوە زمانی کوردی ، زمانی حوجرەی کوردی بووە و ئەو حوجرەیەش هۆکارێ بووە بۆ زیندووکردنەوەی زمانی کوردی( کە هەر پاش ڕوخانی دەوڵەتی میدیا زمانی کوردی لە دەوڵەت و خوێندن doورخرابۆوە) هەروەها لەو حوجرەیە زمانی ( کوردی مەلایی)! دروست بوو و بووە زمانی وتاری هەینی مەلای کورد و

زمانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی. ئەمەو لە ڕێگای قوتابخانەی ئەدەبی بابانەوە ،زمانێکی ئەدەبی لە بەشێکی باشور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەژموونی پەیدا کردووە .بەحوکمی ئەوەی سلێمانی پایتەختی میرینشینی بابان بووە ولە سەردەمی شۆڕشی شێخ مەحمودیش بە (ڕەسمی) بوتە زمانی حکومەت و حکومەتی عیراقیش بە (ڕەسمی ) دانی پیێداناوە .

هە رچەندە لە دوای ڕوخانی حکومەتەکانی شێخ مەحمود ، شاری سلێمانی وەك پایتەختێکی سیاسی نەما ، بەڵام زمانە سیاسی و ئەدبییەکە(نەك شێوەزاری سلێمانی) هەژموونی خۆی لە دەست نەدا ، بە جۆرێ هەر لە شۆڕشی یەکەمی بارزانەوە هەتا شۆڕشی ئەیلوول مەلا مستەفا هەر ئەو ( زمان )ەی بە زمانی ستاندەری کوردی دادەنا!!

لەو بەشەی کوردستان هەر تەنها ئەو زمانە زمانی خوێندن بووە و هەموو کوردیش لە سەر ئەمە کۆك و تەبا بوونەهەتا ڕژێمی عیراقیش کتێبە مەنهەجییەکانی کوردی بەو زمانە چاپدەکرد هەروەها ئەلفبێی لاتینی لەم دەڤەرە هێندە بەهەرمێن نەبووە و نییە هەتا ململانێی ئەلفبێی کوردی بکات! لەو پێودانگەوە ،دەکرێ بڵێین زمانی ستاندەری کوردی کێشە لە ڕێنووسەکەیدا نییە، چونکە هەر ململانێیەکی لەو بارەوە دەستکردە گوزارشت لە ڕەوشی زمانی کوردی ناکات!

هەبوونی قەوارە خۆی لەخۆیدا " هۆکارێکە "بۆلابردنی ئاستەنگ و ئارێشەکانی بەردەم دروست بوونی زمانی ستاندەر ، بە تایبەتی ئەگەر قەوارەکە زادەی بزاڤێکی ناسیۆنالیستی بێ ، چونکە ئامانجی ستراتیژی هەر بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی بەرز ڕاگرتنی خوێندن و ناسنامەی

حوکمرانیەکەیەتی ؟ کورد لە باشووری کوردستان حکومەتی خۆی هەیە ، بودجەکەی لە بودجەی زۆر " دەوڵەت " زیاترە !! بەلاّم ئەو حکومەتە بە پێچەوانەی شۆڕشی کوردیەوە ، بە بیانووی ئەوەی هەر منداڵێك بە ( زمانی دایکی ) بخوێنێ ، ئەوە خەریکە مافی ( زمان ) بوون لە زمانی کوردی بسەنێتەوە و جارێکی تر وەك (زار ) ێك بەرانبەر (زار ) ێکی تر قسەی لەسەر بکات ! لێرەش، هۆکاری هەبوونی قەوارەی نەتەوەیی بۆ کورد بوّتە هۆکاری دروست بوونی ئارێشە لە بەردەم زمانی ستاندەری کوردی نەك لابردنی ئارێشەکان !! بەڕای من هۆکاری تر هەن کە لەمپەر لە بەردەم پرۆسەی دروستبوونی زمانی کوردی دروست دەکەن : یەکەم . بیرکردنەوەی کوردی ، بیرکردنەوەیەکی دواکەوتووانەیە لە مەڕ پرسە نەتەوەیەکان بە تایبەتی پرسی زمانی ستاندەر ! ئەو بیرکردنەوەیە زۆری پیاوی حکومەتی کوردی و بەشێك لە زمانزانی کوردی و بەشێکی زۆری عەوامیە کوردی

گرتوّتەوە . بە حوکمی ئەوەی لە ڕوخانی ئەپراتۆریەتی میدی ٥٤٩ پ.ز هەتا حکومەتی هەرێم کورد فەرمانڕەوایی تەواوی ولآتی خۆی نەکردووە ئەمەش وایکردووە ( عەشیرەت ) و ( هۆز ) و(میرینشین) بەرەو (نەتەوە) و (دەوڵەت) نەچێ ! بەواتای مێنتاڵی کورد قۆناغەکانی ( نەتەوە) بوونی نەبریوەو هێشتا لە بازنەی مێنتاڵی‌خێڵ دەژی .دووەم . زمانی ستاندەریش لەناو مەملەکەتی (شار)ی نەتەوە بەرپا دەبێ نەك گوندو دەڤەری ( عەشیرەت ) جا هەتا حکومەتی کوردی ، ڕوناکبیری کوردی لە دێوەزمەی ( عەشیرەت ) و ( دەڤەری جوگرافی ) ڕزگاری نەبێ ، هەست نەکات لە شار دەژی ، جیهانییەکەی هەرگیز پەرە ناسێنێ نابێتە نەتەوەیەکی یەك زمان ! بە کورتی

و کوردی زمانی ستاندەر و زمانی ڕەسمی واتای نەتەوە و حکومەت دەگەیەنن هەرچی زار و بنزارە ئەوە عەشیرەت و عەشیرەتگەری دەنوێنن!

## Langue
### زیان

سیستەمی زمانە. زاراوەکە زاراوەیەکی فەرەنسیە لە سۆسێر وەرگیراوە و بریتیە لە بەرەستی ریالیتی کۆمەڵایەتی ئاخێو لە لانگیج -دیاردەی گشتی زمان و پارۆل -پەیرەوی ئاخاوتنی تاك-جودایە.

## Laryngology
### گەرووزانی

گەرووزانی بریتیە لە دیراسەکردنی ئەناتۆمی و فسیۆلۆژی و نەخۆشیەکانی گەروو.

## Larynx
### لارینکس-گەروو-قورگ

نێوەندێکە دەوری هەیە لە سەر دروستکردنی دەنگ لە هەموو زمانەکاندا هەروەها نەخۆشکەوتنی یان پەککەوتنی گەروو ڕۆڵی دەبێت لە سەر دەربڕینی هەندێ وشە.

## Latin alphabet
### ئەلفبێی لاتینی

زۆربەی هەرەزۆری زمانە هیندۆئەوروپیەکان پەیرەوی ئەو ئەلفبێیە دەکەن و لە نێو موسلمانانیش تورکیا و شەش کۆمارەکەی سۆڤیەتی پێشوو و بەشێك لە کورد پەیڕەوی ئەو ئەلفبێیە دەکەن .

## Latin language
### زمانی لاتینی

زمانی لاتینی زمانی باوکی خێزانە زمانی رۆمانیە لە هەزارەی یەکەم پێش میلاد لە رۆما و دەوروبەری نووسین و قسەی پێ دەکرا هەروەها سەردەمانێك لە ئەوروپا زمانی ئەدەب و سیاسەت و دین بوو ، بەلاّم لە پاش سەردەمی ڕێنیسانسی ئەوروپیدا زمانە ناوچەیەکان دەسەلاّتیان پەیدا کرد و زمانی لاتینی تەنیا لە نێو کەنیسە ما.

## Levi Shtraws
### بونیاتگەری شتراوس

دەروازە

لەم بەشەدا لە پەیوەندی خودی زمان و چەمکی ئەفسانە دەدوێین ، چونکە ئەو دووە کرۆکی بابەتی ئێمەن . لەم بەشەدا قسە لە سەر پەیوەندی ئۆرگانی ئەو دووە قسە دەکەین .پەیوەندی نێوان دەق و زمانی دەق و خودی زمان خۆی لە خۆیدا پرسێکە لە نێو میتۆدە ڕەخنەییەکانی سەدەی بیستەم .پێش دەرکەوتنی بیروڕاکانی سۆسێر دەربارەی خودی زمان لە جیهانی رۆژئاوا هیچ بیرۆکەیەك نەبوو دەربارەی دیراسەی زمان و زمانەوانی.چەقی دیراساتی

زمانەوانی ئەوسا دوور بوون لە ڕەهەندی زمان ، بەلکو تایبەتبوون بە پێکچوون و جیاوازی زمانەکانی هیندوئەورووپی .سۆسێر لە بەرایدا ڕای لەگەڵ ڕێزمانووسە لاوەکان بوو ، بەلاّم هەر زوو لەو ڕایە کۆنانەی پەشیمان بۆوە و کاری لە سەر خودی زمان کرد بۆیە سۆسێر بووە باوکی زمانەوانی ئەورووپی .ئەو بیرە نوێیەی سۆسێر دوو قوتابی خۆی لە کتێبێك بەناوی کۆرسێك لە زمانەوانی گشتی بلاّوکردەوە.ئەو خوێندنەوە و شرۆڤەکردن و دیتنەی سۆسێر بۆ زمان شۆڕشێکی زمانەوانی بوو.

لیڤی شتراوس مەسەلەی بونیاد پێکهاتەی دەق دوور لە بەهای جوانناسی و مەعریفی و سیاسی و کۆمەلاّیەتی و دەروونی دەق ، کلۆد لیڤی شتراوسی مرۆڤناسی فەرەنسی بەرەو ئەوە برد کە لە لێکۆلّینەوە ئەنسرۆپۆلۆژی و ئەدەبیتەکانی تەواو جەخت لە سەر بونیاد بکات.بونیادگەری سۆسێر و بونیادگەری دەق(بونیادگەری شتراوس ) ئەوە دەهێنن شرۆڤەبکرێن.

## بونیادی زمان و ڕەخنەی بونیادگەری بۆ شرۆڤەکردنی دەق

بونیادی زمان وەك سۆسێر بۆی دەچێ : خودی زمان وەك سیستەمێکە بۆیە لە تۆڕێکی پێکەگرێدراوی هاوچارەنووس دەچێت ، ئەوەی پێکهاتەی زمانە شوناس و بوون و جوولە بە ڕەگەزەکانی ئەو تۆڕە دەدات .ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سۆسێر دیتنەکی ناوەکی بۆ زمان هەبووە ، نەك دەرەکی .کاتێ زمان بە یاری شەترەنج دەشوبهێنێت ، ئەو دیتنە ئاشکراتر دەبێ بەوەی گرینگ نییە تەختەی شەترەنج دار بێت یان زێڕ. لەو بارەیەوە سۆسێر دەلّێت:" زمان بریتییە لە سیستەمێکی بونیادی پێکهاتەی ڕەگەزەکان لە نێو

سیستەمەکە وا ڕێکخراون ،کە هەر ڕەگەزێك بە پەیوەندی لەگەڵ ڕەگەزەکانی تر پێناسەدەکرێ." ئەو پەیوەندیە دووسەرەی ڕەگەزەکانی ناو سیستەمەکە ، هیچ پەیوەندی بە ماهیەتی دەرەکی ڕەگەزەکانەوە وەنییە ،بەلکو ئەوە پێکهاتە و بوونی ئەوانە (ڕەگەزەکانە )، سیستەمەکە دروستدەکات .

ساپیر و ورف لە گریمانەکەیاندا بانگەشەی ئەوە دەکەن ، کە " پێکهاتەی زمانی ئێمەی مرۆڤ پێویستە تا ئاستێك هۆکار بێت بۆ دیاریکردنی شێوەی جیهانبینیمان هەروەها لە جیهان گەیشتنمان ." لەمە زیاتر وەك ئەبرامز لە کتێبەکەی دەڵێت ، ڕەخنەی بونیادگەری زیاتر پەیوەستە بە زمانەوە ، نەك دەقی ئەدەبی ، وەك دەڵێت :" ڕەخنەی بونیادگەری مێژوویێکی کۆنی هەیە لە ئەریستۆ تالیسەوە دەستپێدەکات :بیرۆکەی ئەو جۆرە ڕەخنەیە بریتییە لە شرۆڤەکردنی ئەدەب لە سەر بنەما و شەنگستی مۆدیلی تیۆری زمانەوانی نوێ ."بێگومان تێڕوانینەکانی ڕەخنەی بونیادگەری ، کە سەرەتا لە سەدەی بیستەمدا ، بە شێوە تیۆرییەکەی خۆی لە کارەکانی فۆرمالیستەکانی ڕوسیا وەدەرکەوتن ،ئەو تێڕوانینانە بریتیبوون لە خوێندنەوە و شرۆڤەکردنی دەقی ئەدەبی وەك خوێندنەوەیەکی داخراوی ئەو دەقە بە شێوازێکی تر ، رۆبەرت دیاینی لە ڕەخنەی فۆرمالیست دەنووسێت :" ڕێگای دەسپێکی فۆرمالیزم بریتییە "لە خوێندنەوەیەکی داخراوی دەقی ئەدەبی بە جەختکردن لە سەر بەکارهێنانی میتافۆر و هێما لە بەرهەمەکەدا و پەخشکردنی ئایرۆنی و نموونەکانی ئایرۆنی لە وێنە و جولەدا...."ڕاستە ، تیزی ئەو گروپە ، کە خۆی لە کەسانی وەك یاکوبسن و سەرانی دی فۆرمالیستی روسی دەنوێنێ ،بەلام نە یاکوبسن و ئەوانیدی نکۆلی لەوە ناکەن ،کە ئەوە سۆسێر بوو هەندێ چەمك

و جیاکاری شیکاری لە سەر هەندێ دەقی ئـەدەبی شـرۆڤەکرد بـە کـورتی ، فۆرمالیستەکان دەقی ئەدەبی وەك مۆدیلێکی تایبـەتی زمـان دەبینن.ئـەوان هێندە جەخت لە سەر زمانی ئەدەب دەکەنەوە هەتا دوو جۆر ئـەدگاری زمـان لەیەك جیادەکەنەوە : بەکارهێنانی ئەدەبی –شـیعریەتی زمـان ، دووەم ، بەکارهێنانی ئاسایی زمان :ئەو زمانەی لە ئاخـاوتن و پەیوەنـدیکردن هتـد بەکاردێت .زمانی ئاخاوتن زمانێکە لە دەرەوەی بونیادی زمـان و دەرەوەی دەق بەکاردێت،هەرچی زمانی ئەدەبییە ئەوە لـە سـەر خـودی خـۆی دامـەزراوە و خاوەن ئەدگارە شەکلّی و بونیادەکانی خۆیەتی.لەم ڕوانگەوە زمانەوانی ئەدەب جیـاوازە زمانـەوانی ئاخاوتن،چـونکە زمانـەوانی ئـەدەبی ، ئەدەبیـەت : ئەدەبیبوون بەرهەمدەهێنێت.هەر لـەو بـارەوە ،ڕۆمـان یاکوبسـن لـە سـاڵی ۱۹۲۱-ەوە نووسیویەتی :"بابەتی لێکۆڵینەوە لە زانستی ئەدەبیـدا ، ئـەدەب نییـە ،ئەدەبیبوونـە ، ئـەدەبیبوونیش شوناسـی دەقـی ئـەدەبی بـە دەقەکـە دەبەخشێت ."

هەر لە کۆنەوە ، زمان یەکێك لە خەمەکانی مرۆڤ بووە.قورئان جەخت لـە سەر ئەوە دەکاتەوە ، کە زیان هەروەها زمان خەلاّتی خودان بۆ مرۆڤبـەو دووە مرۆڤ لە گیانەوەر جیابۆتەوە . زمانی هیچ مەخلوقێك ناگاتـە زمـانی مـرۆڤ. تێکەڵبوونی مرۆیی ڕۆژهەلاّتی بە دینە ئاسمانییەکانەوە ، وایکردووە زووتر لە ڕۆژئاواییەکان لـە گرینگـی زمـان بکۆڵنەوە.پرۆسـەی جـوان خوێندنـەوە – تەجوید-و وربونەوە لە پیت و دەنگەگانی قورئان خۆی لە خۆیدا تێروانینێکی فۆرمالی هەروەها بونیادگەرییە هەروەها حالّەتێکی هێرمۆنتیکیە بۆ جـۆری خوێندنەوەی قورئان یان خوێندنەوە بە تەجوید پێویستیەکی دینیە کەچی لە

رۆژئاوا زمانی دەق و شیعریەتی دەق و ئەدەبیبوون تەمەنێکی هێندە درێژی نییە.سۆسێری سویسری یەکەم توێژەری رۆژئاواییە، کە لە بەرایی سەدەی بیستەم کە گوتویەتی زمان سیستەمە ، پەیڕەوە ، یان تۆڕە ، ڕایەلێکە هەموو دانەکانی لە پەیوەندیەکی دیالێکتین لەگەڵ یەکدا. زمان لای سۆسێر لە سێ وشە کۆدەبنەوە : لانگ-سیستەمی پەیوەندی ، لانگویج ، پارۆل:گوتن. دەیڤید کریستال (١٩٩١،ل٢٠١) ئەوها پێناسەی ئەو سێ زاراوە ئالۆزە دەکات :" پارۆڵ بریتییە لە ئاخاوتنی کۆنکریتی کە ئاخێو لە هەندێ رەوشی کردەیی دایدەهێنێت ، هەرچی زاراوەی لانگویجە ئەوە توانای گشتی دەگەیەنێت،لانگیش بریتیە لە سیستەمی پەیوەندیکردن لە کۆمەڵگادا." سۆسێر لە توێژینەوەکەی خۆیدا زیاتر جەختی لە سەر هەردوو زاراوەی گوتن و لانگ کردووە .ئەو دووە هەرچەندە زۆر پەیوەستن بە یەکەوە ، بەلام زۆر لە یەك جودان .گوتن چەند ئەدگارێکی تایبەتی هەیە وەك ، لایەنی بەرجەستەیی زبان دەنوێنێ و لێرەوە ئاخێو دەتوانێ شرۆڤەی گوتن هەروەها لانگ بکات.هەر لە رێگەی گوتنەوە دەتوانرێ هەندێ تایبەتمەندی ئاخێو خویا بکرێت وەك تەمەن ، جێندەر ،باری جڤاکی ، چینی کۆمەلایەتی .جیاوازی زمانی نێر و مێ لە گوتنەوە بەدەردەکەوێت .ئەو دیاردەیە لە ئەفسانەی گەلان دەرکی پێدەکرێ هەروەها لە قسەی کارەکتەرەکان تەمەن و چینی کۆمەلایەتی بەدەردەکەوێت .هەرچەندە لە کۆمەڵگای کوردی جۆری زمان (شێوەی ئاخاوتن ) تەواو نەبۆتە جیاوازی چینی کۆمەلایەتی ، بەلام دانە وشە و دەنگی ئاغا وەك دانە وشە و دەنگی سەپان نییە،وێرای ئەمانەش،گوتن هەڵگری کاریزمایێتی کارەکتەرە لە ئەفسانەی کوردی :دێوبەزێن ، ئەژدیهاکوژ...بە

هەموو کەسێك ناکرێت ، تـەنیا کەسـی وەك کـاوە ، زۆراب ، رۆسـتەمیزاڵ ...نەبێت.لە زمانەوانی بونیادگەری سۆسێر لانگ زۆر گـرینگترە لـە گـوتن ، چونکە ئەبستراکتە و کرۆکی زمانـەوانی سۆسـێر و بابەتـەکانی پێکـدێنێت. سۆسێر لە بارەی جیاوازی ئەو دوو زاراوەیـە دەنووسـێت :" لـە جیاکردنـەوەی زاراوەی لانگ لە گوتن ، ئەوەی کۆمەڵایەتیە لە خودی جیادەکەینەوە،چـونکە لانگ دەستەجەمعییە هەرچی گوتنە گوزارشت لە خودیەت دەکات هـەروەها جیاوازی نێوان ئەو دووە گوزارشت لە جیاکردنەوەی گەوهەرییەت لـە لاوەکـی دەکات."ئەو فرە جیاوازیەی نێـوان ئـەو دووە ، سۆسـێری ناچـارکرد بڵـێ :" زمانەوانی لانگ و زمانەوانی گوتن لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانیدا هەیە." لـە لایەکی دی ، دوای نیو سەدە لە مردنی سۆسـێر ، نـۆوم چۆمسـکی هەنـدێ زاراوەی نزیك لەو دوو زاراوەی داهێنا وەك زاراوەی توانست و چالاکی ،رۆنـانی ژێرە و رۆنانی سـەرەوە.هەردوو زاراوەی توانسـت و چـالاکی لـە رواڵـەت لـە هەردوو زاراوەکەی سۆسـێر، بـەلاّم هەدسـن (١٩٧٦،ل ٢٧٩ ) دەنووسـێت:" رۆنانی ژێـرەوە لای سۆسـێر زمانـە ، دەرەوە دەقـە ، هەرچـی لای چۆمسـکیە رۆنانی ناوەوە چالاکیە ، دیوی دەرەوەش بەجێهێنانە ." هۆرسی (٢٠٠٠،ل ٢١ ) باوەری وایە :"دوو زاراوەکەی سۆسـێر جیاکەرەوەیـەکی سـەرەکیان لەگـەڵ دووەکەی چۆمسکی هەیە :دووەکەی سۆسـێر لـە سـەر بنـەما و شەنگسـتی هۆشەکی پێناسە نەکراون ." چۆن سۆسێر لـە بـەرایی سـەدەی بیسـتەمدا ، هەولّیدا خوێندنەوەیەکی بۆ ناوەکی زمان بکات و خۆی لەوانەی پـێش خـۆی جیابکاتەوە بەوەی لە دەرەوەی زمان دوور بکەوێتـەوە و بـەرەو نـاوەوەی زمـان بچێت و بڵێ : زمان خـۆی لـە خۆیـدا سیسـتەمە ، رەگـەزەکانی نێـوی لـە

هارمۆنیەکی تەواو دان ، جولەی هەر یەکیان کاریگەری لە سەر ئەویتر دروست دەکات وەك جولەی داشەکانی شەترەنج.ئەو دیتنە بونیادگەریە بۆ زمان ، سۆسێری کردە باوکی زمانەوانی نوێ.شتراوس یان کلۆد لیڤی شتراوس خوێندنەوەیەکی بونیادگەری بۆ ئەفسانە کرد ، بزانین بونیادگەری شتراوس دەربارەی ئەفسانە چیە هەروەها پەیوەندی ئەفسانە و زمان چیە؟؟

## بونیادگەری شتراوس دەربارەی ئەفسانە

به حوکمی ئەوەی کلۆد لیڤی شتراوس مژۆل بوو بە کارکردن لە بواری مرۆناسیدا ، دانە وشە و دەنگی مرۆناسی دوور لە شوناسی ئەتنیکی لە بەرهەمەکانیدا بەرچاو دەکەون .مرۆناسی بەشێکە لە شوێنەوارناسی هەروەها قسەکردنە لە سەر رابردووی مرۆڤ .لەمەوە هەست بە رایەلێك لە پەیوەندی لە نێوان مرۆناسی و ئەفسانە هەست پێدەکەین .

وەك لە پێشەوە گوتمان ، بە حوکمی ئەوەی شتراوس لە بواری مرۆناسی کاریکردووە ، هەوڵی داوە لە گرێدانی سروشت و بونیادگەرییەوە کاتێ لە ئەفسانە دراوە.لە شرۆڤەکردنی ئەفسانەدا هەموو بەهایەکی دینی و کۆمەلآیەتی و سیاسی دادەبرێت ، بە چاوێکی فۆرمالی تەماشای دەقی ئەدەبی وەك ئەفسانەی کردووە .ئەو شرۆڤەکردنە ، دوو ئامانجی پێکاوە ، یەکەم بەوەی خۆی دەڵێت :" ئەفسانە زمانە " دووەمیش ، مرۆناسیەکەی وایلێکردووە بەرەو کەلتورە بەراییەکان بگەرێتەوە .ئەو بەستنەوەیەی زمان و کۆمەڵگای بەرایی وەی لە شتراوس کردووە دیتنێکی جیاوازی بۆ ئەو دوو تێرمە هەبێت.لە کتێبی پێکهاتە بەراییەکانی خزمایەتی لە پەیوەندییە

خزمایەتیەکاندا ، شتراوس دەنووسێت :" ئەو جۆرە پەیوەندیانە جۆرێکی تایبەتی بونیاد پێکدەهێنن ." لە کتێبی خاو و کولاو شتراوس دەیەوێ پێمانبلێت ، کە چۆن بونیادەکانی ئەفسانە ،بونیادی بنەڕەتیمان دەداتێ هەتا لە پەیوەندیە کەلتوریەکان بگەین .پاش ئەوەی لە پەیوەندیە کەلتوریەکان حالیبووین ، کاتی ئەوەیە لە هەردوو تێرمی خاو و کولاو بگەین ." خاو پەیوەستە بە سروشتەوە ، هەرچی کولاوە پەیوەستە بە کەلتورەوە . ئەو هەڤرکی و هەڤدژیانە بونیادی بنەڕەتی بۆ هەموو ئایدیا و چەمکەکانی کەلتور پێکدەهێنن .ناونیشانی شرۆڤەیەکی بونیادگەری ئەفسانە ، ئەفسانە وەك دەقێکی ئەدەبی دەبینێ ، یاکوبسن گوتەنی :" مەبەستی توێژەر خودی ئەدەبەکە نییە ، وەك ئەدەبێکی ڕووت یان ئەدەبێکی ئایدیۆلۆژی ، بەلکو ئەوەی گرینگە دەرخستنی ئەدەبیبوون و زمانی ئەدەبی دەقەکەیە .هەر ئەو دوودش ناسنامەی دەقی ئەدەبی بە ئەفسانە دەدەن. لەم وتارەدا ، شتراوس پرسیارێکی گرینگ دەوروژێنێت،ئەویش ئەوەیە: بۆچی ئەفسانەکانی هەموو کولتورە جیاوازەکانی جیهان ، ئەوەندە لە یەك دەکەن؟ خوێندنەوەی ئەو لەیەکچوونە ،لای شتراوس وەك بونیادگەرێك جیاوازە لە تێڕوانینی ئەفسانەناسێك یا فۆلکلۆرناسێك .شتراوس خۆی وەلامی پرسیارەکەی خۆی دەداتەوە:شرۆڤەکردنی بونیادگەری کار لە سەر بونیادی ئەفسانەکان دەکات ،لەوەی خۆی بە ئایدلۆژیا و چەمکی کۆمەلایەتی و سیاسی ئەفسانەکانەوە مژۆل بکات.پێکچوونی ئەفسانەکان لە سەر یەکچوونی بونیاد دامەزراوە ، نەك پلۆت و کارەکتەر و دەمکاتی ئەفسانەکە ، چونکە لەوانەیە ڕوداو و پلۆتی ئەفسانەکان زۆر لە یەك جودابن.

## پەیوەندی ڕیشەیی دووانەکەی سۆسێر لەگەڵ بونیادگەریەکەی شتراوس لە بارەی ئەفسانەوە

شتراوس لە چەند شوێنێکی وتاری " شرۆڤەیەکی بونیادگەریانەی ئەفسانە " ڕژدبوونی خۆی دووپاتدەکاتەوە ، کە ئەفسانە زمانە بە حوکمی ئەوەی زۆربەی ئەفسانەکان پەیوەستن بە کۆمەڵگای بەرایییەوە هەروەها لە پێش پرۆسەی چاپەوە حزووریان هەیە ، بۆیە شتراوس دەڵێت :" ئەفسانە لە هەر کەلتورێکدا دەقێکی وتراوە." گووتن ڕەگەزێکی سەرەکی پێکهاتەی ئەفسانە پێکدێنێت .لەو بارەیەوە شتراوس دەنووسێت :" ئەفسانە زمانە ، چونکە ئەفسانە دەبێ بگوترێت بۆ ئەوەی بوونی خۆی بسەلمێنێت ." هەروەها ئەفسانە زمانە وەك هەر زمانێکی تر، چونکە ئەفسانە هەمان بونیادی هەیە ، کە سۆسێر بۆ زمانی دیاریکردووە.

ئەفسانە وەك زمان لە گوتن و لانگ پێکدێت.هەردووکیان ( زمان و ئەفسانە ) سینکرۆنی –هەنووکەیی – پەرەسەندنەکانی دایکرۆنی- مێژوویییان – لە نێو پێکهاتە هەیەوێڕای ئەمەی ، کە ئەفسانە هەردوو دووانەکەی سۆسێری ( گوتن و لانگ) هەیە ، شتراوس ڕەگەزێکی تر بۆ ئەو دووانەی سۆسێر زێدە دەکات و دەنووسێت :" زمان-لانگ پەیوەستە بە کاتی دووانە-دوو کاتی هەیە ، دەکرێ کاتی یەکەمی دووبارە بکرێتەوە ، هەرچی گوتنە پەیوەستە بە تاك کاتی ." مەبەست لەم دیاردەیە ئەوەیە ، کە گوتن وەك نموونەیەکی تایبەت ، تەنها لە کاتی ئاسۆیی بوونی هەیە : ئەو حاڵەتەش ئاراستەیەکی یەك لاییە. بە شێوەیەکی تر ، گوتن-قسە لە دەم

دەرچوون وەك گوللە —فیشەك ، میلی کاتژمێر وایە ، کە قەومان ، هەرگیز شیمانە ئەوە ناکرێت ، بگەڕێندرێنەوە بەرەو دواوە بۆ ئەوەی جارێکی تر روبدەنەوە.لەم قسانە دەردەکەوێت ، کە پرۆسەی گوتن یەك ئاراستە و یەك کات و یەك جار بێت ، گرێدرابێ بە چرکەی ڕودانی کارەکە!هەرچی لانگە ، کە لای سۆسێر ئەبستراکت و سیستەمی پەیوەندیکردنە کرۆکی زمانەوانییەکەیەتی .لەبەرئەوەی لانگ خۆی بونیادە ، ئەوە لە ڕابردوو ، ئێستا ، داهاتوو بوون و ئامادەگی هەیەبە کورتی ، گوتن پرۆسەیەکی سینکرۆنیە ، هەرچی لانگە دایەکرۆنیە.

## ئەنجام

زمان-لانگ بنەما و شەنگستی زمانەوانی بونیاتگەری سۆسێر پێکدەهێنێت ، چونکە ئەو وای دەبینی زمان-لانگ هەر خۆی بونیادی زمانیی-لانگویج پێکدەهێنی . هەر ئەو دیتنەش بوو وا لە سۆسێر بکات ، کە بڵێت گوتن بەشێك لە لایەنی سەرژمێری زمان پێکبێنێت. شتراوس و چۆمسکی و هەدسن و ئیدیش لە شرۆڤەکەیاندا سوودیان لە جمکەکەی سۆسێر بینیوە و ئەوەشیان نەشاردۆتەوە و ئاماژەیان پێکردووە. شتراوس بۆ نموونە لە ڕێگای شرۆڤەکردنێکی بونیادگەریانەوە بۆ ئەفسانە ئاماژەی بە دووانەکەی سۆسێر کردووە.ئەفسانە لە نەزەری شتراوس خۆی زمانە ، هەروەها دەقێکی زارەکی یان وتراوە ، ئەوە وایکردووە هەموو ئەفسانەکان لە کەلتورە جیاوازەکان پێکبچن ، هۆیەکەی ئەو پێکچوونە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئەفسانەکان هەمان بونیادیان هەیە . ئەمەش ، بۆ نموونە ، بەڵگەیەکی

زمانەوانی بونیادگەرییە ، کە ئەفسانەی فارسی و کوردی بە یەك بچن یان هەتا ئەفسانەی کۆنی سۆمەری و بابلی بە هی کوردی بچن.

## Lexeme
## لێکسیم

زاراوەی لێکسیم زاراوەیەکە بەرانبەر وشەیە لە واتاسازی — سیمانتیکس.هەر یەکەیەك دەگەیەنێ کە واتای لێکسیکی هەبێت ، نەك تەنیا واتایەکی ڕێزمانی.

## Lexical density
## چڕی لێکسیکی

چڕی لێکسیکی ڕێژەی وشەکان لە دەق دەگەیەنێت.

## lexicography
## لێکسیکۆگرافی

بریتیە لە نووسینی قامووس-فەرهەنگ یان بریتیە لە بەکارهێنانی پراکتیکی یان بۆ هەر مەبەستێکی تر هەروەها ئەو زاراوەیە جیاوازە لە زاراوەی لێکسیکۆلۆژی.

## lexicology
## لێکسیکۆلۆژی

لێکسیکۆلۆژی لقێکە لە زمانەوانی کە دیراسەی پێکهاتەی سیمانتیکی لێکسیکۆن.بواری واتایی و پەیوەندی واتایی بەشێك لەو بوارە پێکدێنێت.

# Lingua franca
## لینگوا فرانکا-زمانی هاوبەش

بریتیە لەو زمانەی پەیوەندی هاوبەش لە نێوان دوو گروپ.ئێستا لە باشووری کوردستان زمانی کوردی بۆتە زمانی هاوبەش لە نێوان کورد و تورك ، کورد و ئاسووری ، کورد و ئەرمەنی.کەواتە

## لینگۆا فرانکا چییە؟
## چەمکی لینگوا فرانکا Lingua Franca

لینگوا فرانکا یان (زمانی هاوبەش) زاراوەیەکە لەبواری زمانناسیی کۆمەڵایەتی بەکاردێ، بوونی زمانی هاوبەش لە کۆمەڵگایەکی فرە زمانی و باڵادەست بوونی ئەو زمانە لە هەندێ بواری کۆمەڵایەتیدا دەگەڕێتەوە لەلایەك بۆ خودی زمانەکە هەروەها رازی بوونی بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگا لەسەر زمانەکە. بە واتایەکی تر ئەدگارو شەنگستەکانی زمانەکە لەلایەك بوونی خۆی بەسەر زمان و دیالێکتەکانی دەوروبەرەکە دەسەپێنێ هەروەها فاکتەری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینیش رۆڵی خۆیان دەبینن لە فراژووبوون و نەشونماکردنی ئەو زمانەدا.

لە رووی مێژووییەوە زمانناسانی وەك فرۆمێکین و رۆدمان و کریستەل دیاردەی سەرهەڵدانی زمانی هاوبەش دەگەڕێننەوە بۆ ئەو بزاڤە بازرگانییەی بەندەرەکانی دەریای سپی ناوەڕاست لە چاخاکانی ناوەڕاستدا بە خۆی بینی بوو. لە فەرهەنگی (المورد ۲۰۰۲)دا لە بارەی لینگوافرانکا ـ ەوە هەمان شت دووپاتکراوەتەوە، هەروەها نووسراوەکە ئەو زمانە لە بنەڕەتدا ئیتاڵییەکی

تێکەڵاوە لە فەرەنسی و ئیسپانی و یۆنانی و عەرەبی. ئەو زمانە لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا بۆتە ناوەندێکی لەیەکگەیشتن لە بواری بازرگانیدا. هەر لەم رووەوە لە کتێبەکانی زمانناسیدا لینگوا فرانکا هەر بە زمانی بازرگانی ناو زەد کراوە.

## Linguist
## زمانزان

زمانزان ئەو کەسەیە لە زمانەوانیدا کە بابەتەکە دەردەبڕێت و پیادە دەکات.

## linguistics
## زمانەوانی

زمانەوانی بریتیە لە توێژینەوەی زانستی و ئەکادیمی زمان .زمانەوانی چەند بوارێکی هەیە وەك زمانەوانی کۆمپیوتەر ، سایکۆلۆژی ، کۆمەلایەتی ....

## Linguistic Society of America
## کۆمەڵەی زمانەوانی ئەمریکا

ئەو کۆمەڵەیە لە کۆتایی ١٩٢٤ دامەزراوە .خەمی بنەڕەتی ئەو کۆمەڵەیە رەوشی زمانەوانییە لە ئەمریکا.

## Litrary Pragmatics

### پراگماتیکی ئەدەبی

پراگماتیکی ئەدەبی بریتیە لە توێژینـەوە لـە پەیوەنـدی بەرهـەمهێنان و وەرگرتنی دەقە ئەدەبیـەکان لـە بـەکارهێنانی فـۆرمی زمانەوانیان،ڕووبـەری گەڕان و دیراسەکە لەو بابەتە بریتیە لە ئاوێتـەبوون و چـوونە ناویـەکی لـە نێوان سێ بابەت:

١.زمانەوانی ،

٢.تیۆری ئەدەبی،

٣.فەلسەفەی زمان.

ئەو سەر بابەتانەی لە پراگماتیکی ئەدەبی دەبێ دیراسە بکرێن بریتین لـە بەکارهێنانی دایەلێکتی دەڤەریی ، چەپەڵی ، کـوفر لـە درامـادا لەپاشـان دەرخستنی ئەوەی ئەو بابەتانە چ کاریگەریەك لە سەر هەڵوێست و هەستیاری خوێنەر و وەرگر بەجێدێڵن.

## Loan Words

### وشەی لە زمانی دی وەرگیراو

بریتیە لە پرۆسەی ڕۆنانی وشە لە زماندا.ئەو وشە وەرگرتنە نەنگیی نییە، زمانێکی وەك ئینگلیزی پڕە لە وشەی زمانی داگیرکەر و داگیرکراو.

## London School

### قوتابخانەی لەندەن

دیدی فیرسی پێکهێنەری ئەو قوتابخانەی زمانەوانی بوو لە شاری لەندەن.

# Lyons,John-1932-?

## جۆن لایەنز

جۆن لایەنز زمانەوانێکی بەریتانیە.لە چاو زمانەوانینی ئەمرۆ بە زمانەوانێکی کلاسیك دادەنرێت.یەکەم کتێبی بریتی بوو لە سیمانتیکی پێکهاتەیی -١٩٦٣ .نووسینەکانی لە بارەی پەیوەندی واتایی بە کاری بنەڕەتی و سەرچاوەیی دادەنرێت .لایەنز زیاتر لە چل ساڵ حزوری هەبوو لە بواری زمانەوانی پێکهاتەیی و واتاسازی پێکهاتەیی. هەروەها لایەنز، جگە لە دیدەکانی خۆی لە بارەی واتاسازی لە دوو بەرگی قەبەدا، کتێبێکی لە بارەی چۆمسکی هەیە هەروەها شوێن پەنجەی لە بزاڤی زمانناسی سەدەی بیستەم دیارە.هەروەها ئەو کتێبانەی سەرەوەی لایەنز کتێبی سەرچاوە ئامێز و متمانەپێکراون.

# پیتی M

## Maban
## مابان

گروپێکی بچووکی نیلۆ-سەحران زمانە.ئەو زمانە لە سودان و چاد و کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست هەروەها مابا و میمی و مەسەلیت دەگرێتەوە.

## Machine translation
## وەرگێرانی ئامێری

ئەو جۆرە وەرگێڕانە تەواو جیاوازن لە وەرگێڕانی مرۆیی .وەرگێرانی ئامێری لە بواری ئەنتەرنێتدا وەرگێرانێکی ورد نییە زیاتر جەخت لە سەر پێکهاتەی زمانی سەرچاوە دەکات و پێکهاتەی زمانی ئامانج فەرامۆش دەکات.بەلاّم لەو وەرگێرانە ئامێریەی یوئێن و پەرلەمانی فرە نەتەوە ، ئەو وەرگێرانە ورد ترە هەروەها لەو ولاّتانە وەرگێرانی ئامێری شوناسی جیاواز بە نەتەوەی ئامانج دەدات.

## Macrolinguistics and microlinguistis
## زمانەوانی ماکرۆیی و مایکرۆیی

لە زمانەوانی نوێدا ململانێی زمانەوانی لە نێوان زمانەوانی ماکرۆیی و مایکرۆییدا هەیە.زمانەوانی ماکرۆیی بریتیە لە چەمکێکی فراوانی بە

دواچوونی زمانەوانیە بە تایبەتی لە پەنجاکان ئەو بیرۆکەیە بەرزکرایەوە .زمان لە زمانەوانی ماکرۆییدا وەك لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەزموونی سەروو زمانەوانی دەبینرێ هەروەها لەگەڵ فۆنەتیکی فیزیایی و ئەدگاری گرافی دەبینرێ هەرچی زمانەوانی مایکرۆییە بریتیە لە شرۆڤەی زانیاری زمانەوانی کە باری ستوونی و قووڵی دیراسات دەگرێتەوە.

## Major sentence

### ڕستەی سەرەکی

هەبوونی ڕستەی سەرەکی لە ڕستەی سەبۆردینێت بوونی هەیە.رستەیەیەك سەرەکیە پێی دەوترێت شارستە .ئەو رستەیە مانای تەواوی هەیە .رستەی دووەم رستەی پارستەیە بە تەنیا واتای نییە.

واتایەکی دی رستەی سەرەکی بریتیە لە هەبوونی رستەی بچووك .رستەی سەرەکی بریتیە لە بەرزە بەرهەمهێنی زمان هەروەها رستەی بچووك بریتیە لە بەرهەمهێنی سنووردار یان پێکهاتەکەی هەندێ بەشی –رەگەزی کەمە.

## Malapropism

### مالاپرۆپیزم

بریتیە لە هەڵەیەکی ئاخاوتن کە تێیدا وشەیەکی تر لە جیاتی وشەیەکی تر بەکاردێت کە هەمان سەرەتای هەبێ وە کۆتایی دێ بە هەندێ بڕگەوە .نموونە یووسف لە جیاتی یسووف .

## Manner of articulation

### شێوازی ئافراندن

بریتیە لە سروشتی تەنگپێهەڵچنینی ئافراندن لە کاتی بەرهەمهێنانی دەنگی کۆنسنەنت.شێوازی ئافراندنی هەر کۆمەڵە دەنگێك جیایە لە هی تر هەروەها ئەو پرۆسەیە مەرجی جیاکەرەوەی دەنگە.

## Markedness

### نیشانەداری

لە سێ حاڵەت ئاماژە بە نیشانەداری دەکرێت:

یەکەم ، نیشانەداری ئەدگارێکی هەیە ، ئەو ئەدگارە بەهای پۆزەتیڤی ئەدگارە بەرانبەر ئەدگاری نێگەتیڤی.دەنگێك ئەگەر لووتی بێت دەبێت دژ بە دەنگی دەمی بێت،کەواتە ئەدگاری لووتی نیشانەدارە.

دووەم ، ئەدگارێکی هەیە ،بەهای ئەو ئەدگارە ئەوە نییە ئەوەی چاوەڕێ دەکەی بە هۆی هەندێ پرانسیپی گشتیەوە لە ئەدگاری ترەوە .سێیەم ، بە گشتی هەر یەکەیەك لە هەر دۆخێك زۆر ئاڵۆزە و وا وەردەگیرێت کە شتێکی نامالوفە و دەگمەنترە.

## Martinet , Andre

### مارتنێت ئەندرێ ١٩٠٨-١٩٩٩

ئەندرێ زمانەوانێکی بونیاتگەریە زۆر کاریگەر بووە بە بیرۆکە و تیۆری بەر لە جەنگی قوتابخانەی پراگ.یەکەم کاری ئەندرێ بە نیوەچلی لە کات و پاش جەنگی جیهانی دووەم نووسراوە لە لایەن قوتابخانەی پراگ پەرەی

پێدراوەرەگەزەکانی زمانەوانی گشتی نووسەر -١٩٦٠ بریتیە لە کورتە دەروازەیەکی زمانەوانیێکی بونیاتگەری یان ئەرکیی کە کارگەریەکی گەورەی هەبوو لە فەرەنسا.

## Masculine
## ماسکولین –نێر

بڕوانە جێندەر و زمان

## Mathematical linguistics
## زمانەوانی ماتماتیکی

بریتیە لە لقێکی زمانەوانی کە دیراسەی ئەدگاری ماتماتیکی زمان دەکات .ئەو هەندێ دەڤەری زمانەوانی دەگرێتەوە وەك ئەدگاری ستاتیکی دەق.

## Meaning
## مانا-واتا

واتا داتای سەرەکی واتاسازیە هەروەها واتا داتای ناراستەوخۆی پراگماتیکسە .چۆمسکی لە ڕێزمانی یەکەم هەتا دوا ڕێزمانیدا بە تەواوی ساغی نەکردۆتەوە ئاخۆ واتا لە کوێیە : لە بنیاتی سەرەوە یان ژێرەوەیە؟

## Metalanguage
**میتا لانگویج-سەرووی زمان**

بریتیە لەو زمانە وەسفی شتێکی ناو دیراسە دەکات وەك زمانی تەکنەلۆژی کیمیا ، ئەندازە ،یاسا.

## Metanalysis
**میتائەنالیسیس**

بریتیە لە رۆنانی لێکسیکی نوێ لە رێی شرۆڤەکردنی هەڵە.

## Metathesis
**میتاسێسیس**

بریتیە لە بە شێك لە دەنگ گۆڕین هەروەها بریتیە لە ئاوەژووکردنەوەی دوو دەنگ ، وەك ناوخۆش —خۆشناو.

## Method
**میتۆد**

وشەی میتۆد بە پلەی یەکەم لە بواری وتنەوە و فێربوون بەکاردێت.لە کۆنتێکستی زمانەوانی پێداگۆجی بریتیە لە رێگایەکی تایبەتی وتنەوەی زمان.

## Metonymy
### میتۆنیمی

بریتیە وشەیەك لە بری وشەیەکی دی نزیك لە ئەزموونی رۆژانە ، وەك هەموو بوتلەکەی -شلەکەی-خواردەوە.

## Morph , zero
### مۆرف

### مۆرفی سفرو مۆرفی بەتاڵ

**دەروازەیەك:**

مۆرف، فۆرمێکی پەیوەستە. جگە لە مۆرفی سفر و بەتاڵ ، هەرمۆرفێکی تر وابەستەی مۆرفیمە، هەر بۆیە قسەکردن لەسەر چەمکی مۆۆف ، بێ زانینی چیەتی چەمکی مۆرافیم ئامانجێکی روونی نابێت.

ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدات لە چەمکی مۆرفیم و مۆرف بدوێ. هەروەها جەختێکی بنەڕەتی لەسەر سێ چەمکی مۆرفی سفر و مۆرفی بەتاڵ و مۆرفی پۆرمانتۆ بکات . ئامانجی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەیەك جیاکردنوەی ئەو سێ چەمکەیە . هەرچی دۆخی دەرکەوتن و یاخود بوونە (سفر) و (بەتاڵ) ی هەیە ئەوە تەنها تا یبەتە بە (مۆرف) نەك مۆرفیم . هەندێ وشە کەبە ((بەتاڵ)) ناودەبرێن ئەدگار و تایبەتمەندی مۆرفی

((بەتاڵ)) یان نییە ، ئەوەی هەیە خودی وشەکەیە ، نەك لە ڕۆنانەوە ، وەك "بەتاڵ" دەربکەون. لەسەر ئەم بنەمایە،هێڵی جیاکەرەوەی مۆرفی بەتاڵ و وشەی بەتاڵ وەك دوو ناسنامەی جودا کێشراوە.

**چەمکی مۆرفیم :**

لە مێژووی مۆرفۆلۆژیدا ، پێناسەیەکی زۆر بۆ چەمکی مۆرفیم کراوە . ئەمانەی خوارەوە هەندێ لە پێناسەکانن:

- مۆرفیم وشەیەکی سەربەخۆیە ، یان بەشێکە لە وشە.
- مۆرفیم بچووکترین یەکەی ڕێزمانییە.
- مۆرفیم بچووکترین یەکەی زمانە.
- مۆرفیم بچووکترین یەکەی جیاکەرەوەی ڕێزمانە.

زمانەوانان هەندێ ئەدگاریان بۆ مۆرفیم داناوە ، ئەو ئەدگارانە مەرجی (مۆرفیم) بوون دەگەیەنن:

١. مۆرفیم وشە بێ یان بەشێك بێ لە وشە واتای هەیە.
٢. مۆرفیم شیانی ئەوەی هەیە لەچەند ژینگەیەکی زمانەوانی جودا دەربکەوێ .
٣. مۆرفیم یەکەیەکی ئەبستراکتییە.
٤. مۆرفیم بۆ یەکەی لەخۆی بچووکتر دابەش ناکرێ .
٥. لە پۆلێنکردنی دیاریکردنی بەشە سەرەتایی ( Immediate Constituent) و بەشەکۆتاییەکان ( Ultimate Constituent) دەبێت ڕەچاوی جێپێکهاتەی بنەڕتی مۆرفیم بکرێت نەك دابەشکردنێکی ڕەمەکی!

ئەدگارەکانی مۆرفیم لەرزۆکن، چونکە ئەو ئەدگارانە لە بەرانبەر هەندێ وشەدا دەرناچن.مەرجی هەبوونی واتا مەرجێکی شلۆقە. ئەوەتە، چەند وشەیەك لە زمانی ئینگلیزی هەن ، شێوەیان هەیە، بەلام (واتا ) یان نییە. وشەی (-Cran) و (-rasp) لە cranberry و raspberry هیچ واتا یەکیان نییە. لە زمانی کوردیش ، چەند وشەیەك هەن لەو ژینگانە بەتەنیا هیچ (واتا)یەکیان نییە:

- نان و مان
- ژن و من
- قاپ و ماپ
- دز و مز

لە لایەکی تر ئەوەی شێوەی فۆنیمیی هەیە ، مۆرفە نەك مۆرفیم، چونکە ئەوە مۆرفە نەك مۆرفیم کە لە فۆنیم پێکدێ. وێرای ئەمانەش .، هەموو مۆرفیمێکی سەربەخۆ ئەو شیانەی نییە لە چەند ژینگەیەکی جودا بێ. ئەو بڕیارە ڕەهایە لە وانەیە لەگەڵ زۆرێك لە مۆرفیمی بەند لە جێی خۆی بێ، بەلام بۆ مۆرفیمی سەربەخۆ ، بۆ نمونە لە کوردی، لە جێی خۆی نییە:

کوڕگەل - کچ گەل*
مێگەل - نێرگەل*

مۆرفیمی بەندیش بە شێوەیەکی ڕێژەیی، نەك ڕەهایی، لە ژینگەی جودا دەردەکەون ، ئەوەتە مۆرفیمی ناسین (-ەکە) و کۆ (-ان) لەگەڵ ئەو وشانە نایەن:

سەوزە : سەوزەکان*

میوە : میوەکان*

## مۆرف

مۆرفیم زیاتر یەکەیەکی نا بەرجەستەیە (Abstract) هەرچی مۆرفە ئەوە نواندنی فۆنۆلۆژی مۆرفیمە. مۆرفیم لەسەر ئاستی فۆنۆلۆژی کاری لەسەر دەکریّ ، هەر بۆیە دەبێت مۆرفیم لەنێوان دوو کەوانە ( ) دابندریّ، هەرچی مۆرفە ، چونکە شێوەی فۆنەتیکی مۆرفیمە دەبیّ لە نێوان [ ] دابندریّ:

- (کوڕ) مۆرفیم
- [کوڕ] مۆرف
- (-ەکە) مۆرفیم
- [-ەکە] مۆرف

هەرچەندە زۆربەی مۆرفیمەکانی کوردی تەنها یەك مۆرفی هەیە، بەڵام ناتوانین بێژین پەیوەندی نێوان مۆرفیم و مۆرف پەیوەندییەکی یەك بە یەکی یە، چونکە هەندیّ مۆرفیمی کوردی زیاتر لە مۆرفێکی هەیە. ئەم وشانەی خوارەوە تەنها یەك شێوە خوێندنەوە و فۆرمی فۆنەتیکییان هەیە:

- (بەفر) مۆرفیم ← [بەفر]
- (شار) مۆرفیم ← [شار]
- (پار) مۆرفیم ← [پار] ..... هتد

هەندیّ ڕەگی کوردی زیاتر لە مۆرفیمێکیان هەیە:

مۆرفیم: هەش — حەف

مۆرف: هەشت، هەژ — حەف، حەڤ

هەشتا — هەژدە — حەفتا — حەڤدە



هەروەها زۆربەی مۆرفیمە بەندەکان زیاتر لە مۆرفێکیان هەیە:

مۆرفیمی (-ەکە)

مۆرف : |-ەکە| |-یەکە| |-کە|

کوڕەکە — چایەکە — چەنەگەکە



هەردوو فۆرمی |-ک| و |-ە| مۆرفی تەواوی مۆرفیمی (-ەکە) نین، چونکە یەکێ لە مەرجەکانی (مۆرف بوون) دەبێ ئەو فۆرمانە خاوەن ژینگەی تا یبەت بە خۆیان بن و لە بریتی یەکتر لە (جێ) ی یەکتر نێن. شێوەی |-ک| بە تەنیا وەك مۆفێکی کۆ نایەت، هەرچی شێوەی |-ە| یە ئەوە لە هەندێ ژ ینگە لە بریتی یەکتر دێن:

- ژنەکە بەدووکەوت.
- ژنە بە دووکەوت.

لە لایەکی تر مۆرفیمی (-ان) چەند شێوەیەکی نارێسایی هەیە ، کە هەر یەکەیان بە مۆرفی ئەو مۆرفیمە دادەنرێن، چونکە ئەو شێوانە تایبەتن بە چەند وشەیەکەوەو لە بریتی یەکتریش نایەن:

- (کوڕ) ⟵ /کوڕان/ هەروەها /کوڕەکان/
- (ژن) ⟵ /ژنان/ هەروەها /ژنەکان/
- (کورسی) ⟵ /کورسیان/* بەڵام /کورسییەکان/

ئەو مۆرفانەی خوارەوە ، مۆرفی تەنها پاشگری کۆکردنەوەن:

(سەوزە) ⟵ /سەوزەوات/

(شووشە) ⟵ /شووشەوات/

(مێوە) ⟵ /مێوەجات/

هەریەك لە /-ەکە/ ، / -یەکە/ ، /-کە/ پێکەوە ئەلۆمۆرفی – allomorph مۆرفیمی (-ەکە) ن هەروەها / -ان/ ، / -وات/ ، / -جات/ ئەلۆمۆرفی مۆرفیمی (-ان) ن.

لەمەدا دەدەکەوێ، کە مۆرف تەنها شێوە دەنگییەکەی مۆرفیمە. ئەو هەموو شێوانە – ئەلۆمۆرفانە هەریەکە ژینگەی وشەی تایبەت بەخۆی هەیە و لە بریتی یەکتر نایەن هەروەها مۆرف واتای وشە ناگۆڕێ:

- (سەوزە) ⟵ /سەوزەیان/* ⟵/سەوزەجات/*
- (مێوە) ⟵ / مێوەیان/* ⟵ /مێوە وات/*
- (کوڕ) ⟵ /کوڕەوات/* ⟵ /کوڕجات/*

**مۆرفی سفر**

مۆرفی سفر ئەو مۆرفەیە کە لەگەڵ مۆرفیم یەك شێوەی هەیە – بە شێوەیەکی تر لە پرۆسەی دروستکردنی ئەو جۆرە مۆرفەدا ، (input) و (output) وەك یەکن و هیچ گۆڕانکارییان تێدا دروست نابێت. ئەو جۆرە مۆرفە لە زمانی ئینگلیزی لەچەند شوێنێك دەردەکەوێت:

١. لە کۆکردنەوەی هەندێ ناو (بەتا یبەتی ناوی دهەندێ گیانەوەر وەك swine – بەرازی مێ، sheep – پەز).

مۆرف		مۆرفیم

- (sheep) → /shi:p/
- (deer) → /diə/

٢. لە گەردانە کردنی هەندێ فرماندا هیچ جیاوازییەك لە نێوان چاوگی فرمانەکە و شێوەی ڕابردووی فرمانەکە دانیە بە واتای مۆرفیم و مۆرف وەك یەکن:

مۆرف		مۆرفیم

- (let) → /le t/
- (put) → /put/
- (set) → /set/

٣. ئامرازی سفر. لە چەند شوێنێك بەتایبەتی لەگەڵ ناوی مەعنەوی ، ئامرازی سفر لە بریتی ئامرازی ناسین و نەناسین لە ئینگلیزی و کوردی دەردەکەوێ، بەڵام لە عەرەبی پێچەوانەی ئینگلیزی و کوردییە:

- ژیان خۆشە. (1)– Life is nice
- ژیانەکە خۆشە.※ ※ – The life is nice
- حياة جميلة.※
- الحياة جميلة.

٤. فرمـانی (بـوون) لـە هەنـدێ پێکهاتـەدا لـە ئینگلیـزی و کـوردی دەرناکەوێ:

( )

- The sooner the better.

نان بۆ نانەوا ( ) گۆشت بۆ قەساب ( ) .

٥. ئامرازی لێکدەری (that) و (کە) لە رستەی ناراستەوخۆدا indirect speech بە سفر دەبێ چونکە لە دۆخی بەرکارە:

- He said (that) he was coming.

ئەو وتی ( کە ) ئەو دەهات.

٦. لە Relative clause یـش کلـۆز دیارخـەر دەکـرێ لـە هەنـدێ حاڵەتدا ببێ بە سفر.

- The man (whom) you met….

ئەو پیاوەی (کە) تۆ بینیت......

- The book (which you bought….

ئەو کتێبەی (کە) تۆکڕیت......

## مۆرفی سفر و مۆرفی پۆرمانتۆ

مۆرفی پۆرمانتۆ ئەو مۆورفەیە، کە کۆمەڵێك ڕەگەزی ڕێزمانی جودا لە خۆ دەگرێ. ئەو جۆرە مۆرفە بە (جانتایەك) چواندرایەکە کۆمەڵێك کەرەستەی ڕێزمانی جودا لە خۆ بگرێ. هەببونی (S) بە کۆتایی کاری ئینگلیزییەوە ، چەند ئەرکێکی ڕێزمانی نیشاندەدات: دەمکات، کەسی سێیەمی تاك، کات.

- speaks → He speaks…..
- plays → She plays….

لە زمانی عەرەبی ، جگە لەو سێ ئەدگارە ، ئەوە تەنها مۆرفێك ئەدگاری جێندەریش – gender پیشاندەدات:

یذهب : هو (ئەوی نێر) ڕانەبردوو

تذهب : هی (ئەوی مێ) ڕانەبردوو

لە دیاردەی کورت کردنەوەی ڕستەدا، هەر دوو مۆرفی سفر و پۆرمانتۆ دروست دەبن. هەردووك تەواو لەیەك جودان. مۆرفی سفر لە کورت کردنەوەی ڕستە لە (فۆرمێکدا) دروست دەبێ ، وەك:

- من کارەکەم کرد ⟵ کردم

کر + د + م

(Ø مۆرفی کارەکە ون دەبێ)

- من ئەوم برد ⟵ بردم

بر + د + م

(Ø (ئەو )ون دەبێ )

ویڕای ئەمەش، مۆرفی سفر لە نەرێکردنی رستەی کورتکراوە لە فۆرمێکدا دەردەکەوێ:

- دەڕۆم + نا ← نا Ø ڕۆم

(دە) ون دەبێ ←

- دەخۆمەوە + نا ← نا Ø خۆمەوە

مۆرفی پۆرمانتۆ لە زۆر شوێن لەگەڵ مۆرفی سفر تێکەڵ کراوە . لە ڕستەی : (ڕۆیشت) وا پیشاندراوە کە هیچ مۆرفیمێك نییە ، مۆرفیمی (ئەو) بنوێنێ! لە ڕاستیدا مۆرفی /-ت/ مۆرفێکی پۆرمانتۆیە ، چونکە لەو ڕستەیە سێ ئەرکی ڕێزمانی پیشاندەدات:

- کەس : ئەو
- کات : ڕابردوو
- دەمکات : ڕابردوو

مۆرفی / -ت/ تەنها تایبەتە بە ڕاناوی (ئەو). لە ڕانەبردووش هەر دەردەکەوێ:

من دەڕۆم      تۆ دەڕۆی      ئەو دەڕوات

ئەمەو ، وەنەبێت دەرکەوتنی مۆرفی (-ت) بۆ مۆرفیمی (ئەو) تەنها لە فرمانی تێنەپەر دەرکەوێت، بەڵکو لە تێپەڕیش دەردەکەوێ:

من ئەوم کوشت ← کوشتم.
تۆ ئەوت کوشت ← کوشتت.
ئەو ئەوی کوشت ← کوشتی.

بەلاّم لە فرمانێکی وەك (چوو ، بوو) جۆرە لێلّییەك دروست دەبیّ.
لەلایەك، لە ڕوالّەت مۆرفی سفر بۆکەسی سێیەمی تاك دروست دەبیّ:

من چوو م ، تۆ چوو ی ، ئەو چوو Ø

هەروەها دەکریّ بلّێین لەم حالّەتەدا دوو (واو) ەکە هەم کات و دەمکات نیشاندەدات هەم کەسی سێیەمی تاك!

## Empty Morph - مۆرفی بەتالّ

ڕاسك (١٩٩٣ : ٩٠) دەنووسیّ: " مۆرفی بەتالّ لە مۆرفۆلۆژی، ئەو مۆرفەیە کە هیچ مۆرفیمێك نانوێنێت". ئەو پەیوەندییە "بەتالّ" ەی نێوان (مۆرف) و (مۆرفیم) لە کاتی ڕۆنانی وشەی دارِێژراو و لێکدراو پەیدادەبیّ. پرسیارێك دروست دەبیّ ، مۆرفی بەتالّ هیچ واتایەك لە خۆ دەگرێت؟

مۆرفی بەتالّ شێوەی هەیە، بەلاّم واتای نییە. هەبوونی شێوە فیزیکیەکەی لە زۆر زماندا بەرچاو دەکەوێت. لە زمانی ئینگلیزی لە چەند شێوەیەك دەردەکەویّ. وەك:

- Psyche + logy = Psychology
- Child – (r) –en = children
- Brother + en = Brethren
- Media + event = Midiarevent

لە زمانی باسك Basque یش ئەم دیاردەیە هەیە، هەربۆ نموونە:

لەناو شاخەکاندا دۆخ کۆ (شاخ)

Mendi + -e + -n + -ta = mendietan



لە زمانی کوردیش ئەم دیاردەیە لە چەند شوێنێك دەردەکەوێ، وەك:

نۆ + دە + -از ← نۆزدە

مۆرفی بەتاڵ

شەش + دە + -از ← شازدە

مۆرفی بەتاڵ

یەك + دە + -از ← یازدە

لە وشەی (یازدە) نەك هەر مۆرفی بە تاڵ دەردەکەوێ ، بەڵکو مۆرفی سفریش: (-ەك)هەروەها لە وشەی (شازدە)ش (-ەش) دەبێ بە سفر.

لە کورتکردنەوەی ڕستە لە وشەیەکدا، لە کرمانجی ناوەڕاست مۆرفی بەتاڵ دروست دەبێ، بەڵام لە کرمانجی سەروو دروست نابێ:

من بە ئەوم گوت پێمگوت

گوتێ - گوتمێ

لە هەندێك شوێن /-م/ دەرناکەوێ دەبێتەمۆرفیمی سفر نەك بەتاڵ هەروەها لێڵی واتایش دروست دەبێ، چونکە جێندەر ون دەبێ: (گوتە وی) یان (گوتە وێ)؟

**مۆرفی بەتاڵ و وشەی بەتاڵ:**

(مۆرفی بەتاڵ) و (وشەی بەتاڵ) نەك هەر هاوواتای یەکتر نین، بەڵکو هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکەوە نییە.

وشەی بەتاڵ، وشەیەکی ڕێزمانییە و ئەرکی تەنها گوزارشت کردنە لە پەیوەندییە ڕێزمانییەکان. جگە لە وشەی بەتاڵ ، ئەو وشەیە چەند ناوێکی تری هەیە وەك وشەی شێوە ، وشەی ئەرك، وشەی پێکهاتە.

لە کوردی ، ئەو جۆرە وشەیە ئامرازەکانی ناسین و نەناسین و ئامرازی پەیوەندی و بەستنەوە ...هتد دەگرێتەوە.

وشەی بەتاڵ وەك مۆرفی بەتاڵ هیچ واتایەکی لێکسیکی هەڵناگرێ ، بۆیە ئەدگاری (بەتاڵ) بۆ وشەی بەتاڵ بە هۆی نەبوونی واتاوەیە هەرچی (بەتاڵ) ی مۆرفی بەتاڵە نە بوونی هیچ ژێدەرێکی مۆرفیمییە بۆ ئەو مۆرفە هەروەها ئەو مۆرفەش پەیوەستە بە ڕۆتانی وشە لە زمانەوە، ئەگەرناوشەیەکی سادە بەتەنها نابێتە مۆرفی بەتاڵ وەك وشەی بەتاڵ، کە هەموو زۆربەی سادەن و بێ واتان.

جیاوازییەکی تری نێوان مۆرفی بەتاڵ و وشەی بەتاڵ ئەوەیە: مۆرفی بەتاڵ لە فەرهەنگ نانوسرێ چونکە شێوەو یەکەیەکی سەربەخۆی نییە ، هەرچی وشەی بەتاڵە هەموو لە فەرهەنگ وەك یەکەیەك دەردەکەون.

## Morphology

### وشەسازی

لقێکە لە ڕێزمان کە دیراسەی پێکهاتەی وشە دەکات هەروەها خۆیشی دابەشدەبێت بۆ مۆرفۆلۆجی داڕێژراو و مۆرفۆلۆجی لێکسیکی.

## Morphophonemics or morphophonology

### مۆرفۆفۆنۆلۆجی

لقێکە لە زمانەوانی کە شرۆڤەی ئەو هۆکارە ڕێزمانی یان فۆنۆلۆجییانە دەکات کە بڕیار لە سەر فۆڕمی فۆنیم دەدەن. یەکەی بنەڕەتی ئەو شڕۆڤەیە بریتیە لە مۆرفۆفۆنیم ، بیرۆکەی کۆکردنی ناوی ئینگلیزی هەڵگرێ گۆڕانی دەنگ و فۆڕمە.

## Morphosyntax

### مۆرفۆسینتاکس

بریتیە لە توێژینەوە لە کاتیگۆریە ڕێزمانیەکان کە مەرجە مۆرفۆلۆژی و سینتاکسی لە خۆ دەگرێت، کاتیگۆری ژمارە لە ناو دەکرێت بە پێوەری مۆرفۆلۆجی و سینتاکسی . دەمکات ، کەس ، ڤۆیس نموونەن بۆ کاتیگۆری مۆرفۆسینتاکس.

## Motherese

### شیوەن یان سەردولکە یان لایلایە

بریتیە لە ستایلی ئاخاوتنی دایکانە کاتی منداڵەکانیان دەلآوارێننەوە.ئەو ئاخاوتنە چەند تایبەتیەکی هەیە وەك ڕستەی کورتی سادە ، ڕستەی دووبارە، دانەوشەی سادە

# Mother language

## زمانی دایك

ئەو ڕۆژە بە هۆی خۆپیشاندانی لاوی بەنگالی لە پێناوی زمانی دایك لە کۆمەڵگای پاکستانی دروست بووبەڵێ لە ٢١ی شوباتی ١٩٥٢ کۆمەڵە لاوێکی زانکۆ ڕازی نەبوون ، کە زمانی ئوردوی پاکستانی بە سەریان وەك نەتەوەیەکی جودا لە پاکستانی فەرز بکرێت . پاش ٤٧ ساڵ ، یۆنسکۆ ئەو ڕۆژەی بە ڕۆژی زمانی دایك ناساند .

لە نێو کوردانی باشوور ئەوە چەند ساڵێکە قسە لە سەر ڕۆژی زمانی دایك دەکرێت ، بەلاّم ئەفسووس زمانی دایك و زمانی زگماك تێکەڵ بە یەك دەکرێت ، جا ئەم کورتە نووسینە لەو ڕۆژە بۆ ئەو دیاردەیە لە دایك بووە.

**زمانی دایك و زاری دایك**

جۆری کۆمەڵگای زمانەوانی ناسنامەی زمان دیاری دەکات .ئەگەر کۆمەڵگای زمانەوانی تاك نەتەوە بوو ، بە واتای هەر کورد بوو ، ئەوە ئەوەی پێی دەوترێت زمانی دایك لە بنەڕەتدا زاری دایکە .دوورە لەوەی ببێتە زمانی خوێندن لە پەروەردە ، چونکە لەو کۆمەڵگا زمانەوانیە چەند زارێکی دایك ئامادەگی هەیە . سروشتیە هەر زمانێك بە هۆی سیاسی و جیۆگرافی چەند زاری جیۆگرافی هەبێت . ئەو زارانە هەتا ئەدگاری ناوچەیی لە دەست نەدەن ، یەکیان بەرەو زمان ناچێت. لە کۆمەڵگای زمانەوانی چەند نەتەوەدا وەك کۆمەڵگای زمانەوانی ئیراق ، زمانی دایك تێیدا زمانی نەتەوەیە . کورد لە ڕۆژی دامەزراندنی یەکەم دەوڵەتی ئیراق داوای لە حکومەتی بەغدا کردووە زمانی کوردی وەك زمانی عەرەبی ڕەسمی بێت.لە کۆمەڵگای زمانەوانی ئیراق

عەرەب و کورد و تورکمان و ئاشووری هەیە .لەو حاڵەتە زمانی دایك زمانی نەتەوەیە .

## زمانی دایك و زمانی زگماك

زمانی دایك لە کۆمەڵگای زمانەوانی چەند نەتەوەدا زمانی دایك ، زمانی نەتەوەیە یاخود ماچیوس لە فەرهەنگی زمانەوانی ئۆکسفۆردا ، زمانی دایك بە زمانی خەڵکی ڕەسەنی وڵات ناوزەد دەکات ، دەیڤید کریستالیش زمانی دایك بە یەکەم زمان و زمانی ڕەسەن دادەنێت. زمانی دایك ، زمانێکە پەیوەندی بە پرۆسەی فێرکردنەوە نییە ، منداڵ ئەو زمانە لە دایکێکی خوێنەوار یان نەخوێنەوار فێردەبێت .لەو پرۆسەیەدا منداڵ پاسیڤ نییە ، چونکە دایکیشی نەبێت لە کۆنتێکستی کۆمەڵگاوە وەریدەگرێت.

زمانی زگماك پرۆسەیەکە منداڵ تێیدا پاسیڤە ، دەتوانین بڵێین حاڵەتێکی کرۆمۆسیە ، بە پێچەوانەی زمانی دایك حاڵەتێکی کرۆمۆسۆمی نییە.زمانی زگماك نابێتە زمانی نەتەوە و لە بریتی زمانی نەتەوە بەکار نایەت. چۆن نەخۆشی زگماك هەیە ، نەخۆشەکە دەوری لەو پرۆسەیەدا —تووشبوونی نەخۆشەکە-دا نییە . بە هەمان شێوەش دەگوترێ فلان کەس لە زگماکەوە لاڵە ، کەڕە ....لەو لاڵبوون و کەڕبوونە نەخۆشەکە دەوری نییە ، بەڵام زمانی دایك لە کۆمەڵگای زمانەوانی چەند زمانی ، زمانی نەتەوەیە .

## زمانی دایك و تیۆرە سایکۆلۆژییەکان

لەم بەشە ئاماژە بە شوناسی ئایین و زمانی زگماکی منداڵ دەکەین.بەرلەوەی قسە لە سەر دید و بۆچوونێکی دەرەوەی بازنەی دیین بکەین، بە پێویستی دەزانیین گوتاری دیین ئاماژە پێبکەیین...

لە قورئاندا ، لە ئایەتێکدا بە ڕاشکاوی قسە لەسەر( باوەڕی) مرۆڤ کراوە بەر لەوەی بێتە ناو جیهانی دەرەوە:خودا مرۆڤی لە سەر سروشتی دینی خۆی ئافراندووە..ڕۆم:٣٠ هەروەها لە فەرمودەیەك هاتووە:" هەمور زارۆکێك بە ڕەمەکی لە سەر سروشتی دینی خودا لە دایك دەبێ ، ئەوە دایك و باوك و دەوروبەرە لەو سروشتە دووری دەکەنەوە و بە جولەکە و گاوری و ئاگرپەرستی دەکەن." ئەم دوو دەقە تەواو ئەوە دەردەخەن کە مرۆڤ لە ژێر کاریگەری ژینگەی کۆمەڵایەتی و ئایینی و سیاسی دایە....هەرچی مەسەلەی زمانە ،ئەوە قورئان لە (٢٥) دەقدا ،بە واتای جودا باسی لە (زمان) کردووە.جگە لە واتا کۆزمانەوانی و ئەتنیکییەکانی، ئەوە لە چەند دەقێك بە ڕوون و ئاشکرا ئاماژە بە (زمان-وەك زبان:ئەندامی ئاخاوتن و تامکردن و چێژوەرگرتن دەکا ، بە تایبەتی لە مەسەلەی ئافراندنی مرۆڤدا.بە واتای مرۆڤ بە زمانەوە لە دایك دەبێ:هەموو زارۆکێکی سروشتی خاوەن سیستەمی وەرگرتنی زمانە.ئەو سیستەمە لە تەمەنی دوو ساڵیەوە تەواو ئامادەیە نەك هەر تەنیا بۆ (وەرگرتنی) زمانی دایکی ، بەڵکو هەتا (فێربوونی) زمانی تر!!

زمان لە قورئاندا ناسنامەی ئادەمیینی مرۆڤ دەگەیەنێ!! هەبوونی سیستەمی وەرگرتنی زمان هەر تەنها (جەستەیی) نییە ، بەڵکو (مەعنەوی)یشە.لەم ڕوانگەوە دەکرێ بانگەشەی ئەوە بکەین کە (باوەڕ) و (زمان و زبان) بەشێك لە سروشتی ئافراندی منداڵ پێکدێنن ، بەڵام ئەوەی یەکەم ناسنامەیەکی هەیە لە هەردوو دنیای کۆنکریتیدا ،هەرچی زمانە لە

بەرایی ڕەمەکییە و لە پاشان کۆمەڵگا ناسنامەیەکی نەتەوەیی یان ئایینی بە مل دادەبڕێ!!

هەرچی هزری مرۆڤە ئەوە ئێمە قسە لەسەر دوو تیۆری دژ بەیەك دەکەین.

**تیۆری یەکەم**

**تیۆرەکەی ستیڤن پینکەر**

پینکەر لە سێ کتێبدا لە پڕانی زمان و ئەدگارەکانی دەدوێ. سەرەتا پینکەر بە پالپشتی تیۆرەکانی نۆم چۆمسکی و تیۆری پەرەسەندن تیۆرەکەی خۆی فۆرمەلە دەکات: زمانی ڕەمەکی منداڵ لە ئاکامی پرۆسەی هەلبژاردنی سروشتەوە پەیدادەبێ.منداڵ کە لە دایك دەبێ هەلگری جینێکی ڕەمەکییە و ئەو جینە شیانی ئاخاوتن و فێربوونی لە خۆ گرتووە.

پینکەر باوەڕی بە مەسەلەی تابلۆی سپی مێشکی منداڵەوە نییە !!چونکە ئەم تیۆرە هەر تەنها جەخت لە سەر پرۆسەی فێربوون دەکات و هەبوونی سیستەمی وەرگرتنی زمان لە مێشکی زارۆك ڕەتدەکاتەوە.

لە سێیەم کتێب باس لە زمانی هزر دەکات و دەڵێ هەموو مرۆڤێ هەڵگری ئەو جۆرە زمانەیەکە .ئەو جۆرە زمانە پەنجەرەیەکە بە سەر سروشتی مرۆڤەوە و هەر بەو هۆیەوە هەوڵ دەدەین ڕامانێك بە جیهانی دەورووبەرمان ببەخشین. پینکەر دەنووسێ:"ئەو وشانەی بە کاریان دەهێنیین و کار و ناوەکان ، میتافۆر و پێکهاتە ڕێزمانییەکان دەتوانن زۆر شتمان پێبلێن: لە بارەی ئەو کۆمەڵگایانەی تێیان دەژیین هەروەها لە بارەی عەقڵ و میشکمان و چۆنیەتی کارکردنیان.

**تیۆری دووەم**

گیۆفری سامپسۆن لە "پەروەردەکردنی حەوا" بە شێوازێکیتر لە زمانی ڕەمەکی دەدوێ. سامپسۆن لە سەر بنەما و شەنگستەکانی تیۆرەکانی کارل پۆپەر لە پرۆسەی فێربوون دەدوێ:"کە لە دایك بووین هیچمان نەدەزانی ،بەڵام شیانی ئەوەمان هەیە فێری هەموو شتێك ببین" هەر لەو بارەیەوە لە حەوا دەدوێ:"حەوا کە دروست بوو هیچی نە دەزانی ، جاهیل بوو ،بەڵام فێرخواز و وەرگرێکی باش بووا!"

هەردوو تیۆرەکە کێماسیان زۆرە ،چونکە هەر یەکەو لایەنێکی وەرگرتووە هەرچی قورئانە جەخت لە هەردوو لا دەکاتەوە :مرۆڤ هەم پرۆگرام کراوە بە سیستەمی وەرگرتنی زمان هەم خۆی کائینێکە توانای فێربوونی هەیە.توانای فێربوون لە منداڵ بەهێزترە نەك لە پیاو.

## Mutual intelligibility
## تێگەیشتنی دووسەرە

تێگەیشتنی دوو لایەنە یان دووسەرە بریتیە لە مەرجێکی بەکارهاتوو لە شیکردنەوەی زمانەوانی کە ئاماژە بەوە دەکات کە گوزارشت لە توانای خەڵك دەکات بۆ لە یەکتر گەیشتن.ئەگەر دوو شێوە تەواو لە یەك بگەن ، ئەوا ئەو دوو شێوەیە دایەلێکتی یەك زمانن، ئەگەر ئەو لەیەکگەیشتنە دوو سەریە فەراهەم نەبوو ، ئەوا ئەو دوو شێوەیە دوو زمانی جیاوازن.

ئەو مەرجە زۆر سادەیە، چونکە هەر سێ زمانی دانیمارکی ، نەرویجی ، سویدی لە یەك دەگەن ، زمانی جیاوازیشن هەروەها سامی باکور و باشوور دایەلێکتی یەك زمانن ، کەچی ڕێژەی لە یەکتر گەیشتن زۆر کەمە هەروەك

چۆن کرمانجی ناوەڕاست و لوڕی بە جوگرافیا و شێوە لە یەك جیاوازن ، کەچی دوو دایەلێکتی یەك زمانن.

## Myanmar
## مینامار -بۆرما

ئەو ولاّتە زیاتر لە ٤٣ ملیۆن کەسە.زمانی ڕەسمی ولاّت زمانی بۆڕمیە کە نزیکەی ٦٠٪ بۆرمی قسەی پێدەکەن، سەدا چلەکەی تر زمانی تر پێکدەهێنن.لە بۆرما خۆیا بوو کە بوزیەکان بەرامبەر کەمینەی موسلمان چەند توندڕەو و پەڕگیرن...............

# پیتی N

## Na Dene
## نا دێنی

بریتیە لە کۆمەڵە زمانێك کە زیاتر لە ٢٠ زمان دەبن و لە ئالاسکا و باکووری رۆژئاوای کەنەدا و باشووری رۆژئاوای ئەمریکای ناوەند قسەی پێدەکرێت.

## Namibiaنامیبیا

نزیکەی دوو ملیۆن دەبن ، زمانی رەسمی ولآت ئینگلیزیە هەروەها لە سەدا دەی خەڵك بە ئینگلیزی قسە دەکەن ، لە سەدا دەی تر بە زمانی ئەفریکی قسە دەکەن....

## Narrative
## "گێڕانەوە

ئاخاوتنێکە زنجیرە ڕوداوی خەیاڵی یان هەقیقی دەگێرنەوە.گێڕانەوە ڕەگەزێکی نۆڤلە هەروەها تۆپیکێکی بنەڕەتی پراگماتیکی ئەدەبیە کە دیراسەی پێکهاتەی لۆژیکی چیرۆك دەکەن.

## Nasal
### لووتی-کەپوویی

بریتیە لەو دەنگانەی لە ڕێگای لووتەوە دروستدەبن ، وەك دەنگی /ن/ و /م/و/نگ/.

ئەو دەنگەش بە هۆی دابەزینی مەلاشوو دەبێت تا هەوا بە لووت تێپەڕێت.

## National language
### زمانی نیشتیمانی

ئەو زمانەیە کە ناسراوە بەوەی زمانی سەرچاوە و هێمای شوناسی نەتەوەیە.ئەو زمانە جیاوازە لە زمانی ڕەسمی .لۆکسمیێرگ دوو زمانی ڕەسمی هەیە ، فەرەنسی و ئەلمانی.

## Native language
### زمانی ڕەسەن

ئەو زمانەیە کە، زمانی خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکەیە بە شێوەی سروشتی لە منداڵیەوە بەدەستی هێناوە ، کە جیاوازە لەو زمانەی خەڵك فێری دەبێت.

## Natural language
### زمانی سروشتی

سیستەمێکی مەزەندەیی و داهێنراوە کە بە زمان دەچێت جگە لە پەیوەندی نێوان فۆرمەکان و واتاکان کە سیستیماتیکیە هەروەها هەندێ ڕێگا لەگەڵ واقیعی وەرگیراو پێکدەهێنێت.

## Negation

**نەرێی**

بریتیە لەو رستە و فۆرمەی بوون و ڕەگەزی نەرێی لە خۆ دەگرێت.

## Neo-firthian

**قوتابخانەی فیرسی نوێ**

قوتابخانەیەکی زمانەوانی بەریتانیە ، کە لایەنگری هالیدەی رابەری زمانەوانی ئەرکییە.

## Neogrammarians

**ڕێزماننووسی گەنج**

کۆمەڵە ڕێزماننووسێکی گەنجی سەدەی نۆزدەهەم بوون.

## Neo-Gricean

**قوتابخانەی گریسی نوێ**

قوتابخانەیەکی پراگماتیکی نوێیە کە پەرەی بە مەکسیمەکانی تیۆری ناسراوی گریس دا.

## Neo-Humboldtians

### قوتابخانەی هۆمبۆدلی نوێ

قوتابخانەیەکی زمانەوانی تیۆر داهێنەنانەکانی ئەلمانیە لە نێوان هەردوو شەڕی جیهانی لە لایەن وێسگێربەر دامەزراوە.ئەو قوتابخانەیە کە چەمکی زمان وەك هێز پەرەی پێدرا. زمانەوانی نوێ

بزاڤێکی زمانەوانی بوو لە ئیتالیا .لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە لایەن بارتۆلی سەرکردایەتی دەکرا هەروەها لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی گرۆسەوە دەربارەی زمان هاتۆتە کایەوە.

## Neroliguistics

### دەمارە زمانەوانی

نیرۆلینگویستیکس-زمانەوانی دەماری مێشك

**دەروازە**

دەربارەی هەڵبژاردنی بابەتی پەیوەندی ئۆرگانی نێوان دەمار و زمان یان مێشك و زمان ، دوو هۆی بنەڕەتییە : یەکەمیان ، دەقێکی قورئانە کە خودا دەفەرموێت :" لە زاتی خۆتان ناڕوانن؟ " دووەمیان ، نەخۆشی خۆمە ، کە لە پاش نەزیفبوونی دەمارێکی مێشکم ، ناتوانم بە بەردەوامی بە ئینگلیزی بدوێم ، کەچی دەتوانم بە زمانی کوردی بدوێم . ئەو دوو هۆیە هۆکار بوون بۆ ئەوەی لە سەر دیاردەی نیرۆزمانەوانی بدوێم .

## مێشك و زمان

مێشك چەندەها دەماری دیار و نادیاری هەیە هەریەکەیان ئەرکێکی فسیۆلۆژی و زمانەوانی هەیە. ژمارەی ئەو دەمارانە لە ژماردن نایەت.لە لایەکی دی دەریای زمان زۆر قووڵە هەروەها وەك سۆسێر گوتەنی زمان خۆی سیستەمە وەك داشەکانی شەترەنج هەموو لە پەیوەندی دایەلێکتیکی دان لەگەڵ یەکتر .

لە زماندا شوێنی پیتەمرۆیەکانی ئاخاوتن ، خودی ئاخاوتن ، گۆکردنی ئاخاوتن ، بیستنی ئاخاوتن ، بەرهەمی ئاخاوتن لای قسەکەر و گوێگر بوونی غەیبی هەیە.شوێنێك لە مێشکی مرۆڤ بۆ بەرجەستەکردنی ئەو دیاردانە بوونی هەیە .کەواتە وەك گوتاری قورئان جەختی لە سەر دەکات لایەنی تویکاری جەستەی مرۆڤ ، جگە لەوەی موعجیزەیەکی تویکارییە ، موعجیزەیەکی زمانەوانییە لەمەڕ پەیوەندی زمان و مێشك.

### پێناسەی نیرۆزمانەوانی

نیرۆزمانەوانی وەك بەشێکی زمانەوانی لە زۆربەی کتێبە زمانەوانیەکان پێناسەکراوە .دەیڤید کریستال (١٩٩٢ ، ل ٢٦٥ ) بەم شێوەیە پێناسەی نێرۆزمانەوانی دەکات :" بریتیە لە لقێکی زمانەوانی کە بریتیە لە دیراسەکردنی بنەماکان لە سیستەمی دەماری مرۆڤ بۆ پەرەسەندن و بەکارهێنانی زمان . لە ئامانجە تایبەتیەکانی بریتیە لە فەراهەمهێنانی مۆدێلێك لەمەر کۆنترۆلی مێشك بە سەر پرۆسەکانی ئاخاوتن قسەکردن ، گوێگرتن ، خوێندنەوە ،نووسین ، گۆرانی وتن."ئەو پێناسەیە قسە لە سەر پەیوەندی زمان و سیستەمی دەمار دەکات ، ئەو پەیوەندیە تۆڕئامێزە

بەشداری دەکات لە پرۆسەکانی ئاخاوتن و گوێگرتن...چونکە ئیسپاتدەکات دەماری ناو مێشك ئەرکێکی زمانەوانی ڕادەپەڕێنێت . یەکێك لە کتێبەکانی کامبردیج بۆ زمانەوانی تەرخانکراوە بۆ کتێبێکی ئینگرام بە ناوی :" نیرۆزمانەوانی : دەروازەیەك بۆ پرۆسەی زمانی قسەکردن و لادانی " بەو قسەیە بێت لە ناو تۆڕی زمانەوانی دەمار ئاریشەی لادانی زمانیی بوونی هەیە بە تایبەتی لە ڕودانی سروشتی و ناسروشتیدا بەدەردەکەوێت.لە لاپەڕە (٤٠)ی کتێبەکەی ئینگرامدا مەبەستی بنەڕەتی نیرۆزمانەوانی ئاماژەی بۆ کراوە :" با مێشك بە پرۆسەی ئاخاوتن هەستێت " ماسیۆس ( ٢٠٠٧،ل ٢٦٢ ) پەیوەندی زمانەوانی دروونی و نیرۆزمانەوانی دەخاڕوو هەروەها دەربارەی ماهیەتی نیرۆزمانەوانی دەنووسێت :" نیرۆزمانەوانی لکێکە لە زمانەوانی گشتی لە بنەڕەتدا پەیوەستە بە دیراسەکردنی پرۆسێسەکان و پێکهاتەکانی لە مێشك کە پەیوەستن بە مەعریفە و بەکارهێنانی زمان ." ئەو خانە دەماریانە ئایچیسینی ( ١٩٩٢ ، ل ١٣٢و١٣٣و١٣٤) سەرەباسێك تایبەت بکات بە زمان و مێشك و لە کاریگەری دەماری مێشك لە سەر پرۆسەی ئاخاوتن بکات .لەو چەند لاپەڕەدا ئایچیسین هەندێ زانیاری بە نرخ لە سەر پەیوەندی مێشك و بیرکردنەوە و زمان دەخاتەڕوو.کەواتە نیرۆزمانەوانی بریتیە لە دراسەکردنی میکانیزمی دەماریی لە مێشکی مرۆڤ کە کۆنترۆلی تێگەیشتن و زمان گۆکردن وەك بەرهەمێکی ئۆرگانەکانی ئاخاوتن و زمان گرتنە.

بۆ دیارکردنی مێژووی سەرهەڵدانی نیرۆزمانەوانی لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوا وەك توێژینەوەی تایبەت بۆ دیاریکردنی پەیوەندی زمان و مێشك ، ناچارین

ئاراستەی هزرمان بۆ ئەوە ببەین کە ئەو جۆرە دیراسەیە تەنیا لە بواری زمانەوانی گشتی نادۆزرێتەوە ، بەڵکو لە بوارەکانی زمانەوانی دەدۆزرێتەوە . ئایچسین ( ١٩٩٢،ل٧ ) دەربارەی بواری زمانەوانی نوێ لە رۆژئاوا دەنووسێت ، کە زمانەوانی فەلسەفی و کۆمپیوتەری و ئەحصائی..بەشێکن لە زمانەوانی " بەلاّم لە بەر نوێیەتی نیرۆزمانەوانی لە بوارەکانی زمانەوانی ئاماژەی بە هەبوونی نەکردووە .سایتی ویکپیدیای ئەلێکترۆنی ، مێژووەك بۆ نیرۆزمانەوانی دادەنێت و دەنووسێت :" سازکردنی زاراوەی نیرۆزمانەوانی دەدرێتە پاڵ هاری ویتکار ، چونکە لە ساڵی ١٩٨٥ گۆڤارێکی بە ناوی نیرۆزمانەوانی دامەزراند.

## بەشەکانی مێشك و پرۆسەی قسەکردن و گوێگرتن و تێگەیشتن

هەرسێ پرۆسەی قسەکردن وگوێگرتن و تێگەیشتن پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە دەماری مێشکەوە هەیە ، چونکە وەك خۆیا بووە دەمارەکانی مێشك بارگاوی کراون بە هەندێ پرۆسەی زمانەوانییەوە .

لە خودی مێشکدا چەند دەڤەرێك هەن ، کە جگە لەوەی چەند پرۆسەیەکی تایبەت بە جەستەوە ئەنجام دەدەن هەروەها لە ڕێگای کەیسی هەندێ نەخۆشەوە دەرکەوتوون کە هەندێ پرۆسەی تایبەت بە زمانەوە ئەنجام دەدەن .

ئەو بەشانەی مێشك كە تایبەتن بە زمانەوە:

## یەكەم ، ناوچەی برۆكا

ئەو دەڤەرەی برۆكا لە مێشك لە ئاكامی توێژینەوەی پزیشكی بەرپا بووە ، نەك توێژینەوەی زمانەوانی . وەك ئینسكلۆپیدیای ویكپیدیا دەنووسێت :"دیاردەی پەیوەندی دەماری مێشك و زمان لە ڕووی مێژووەوە ڕەگداكوتوی پەرەسەندنەكانی بواری ئەفاسیۆلۆجیا (دیراسەكردنی خەوشی زمانەوانی ) كە لە ئاكامی زەرەری مێشك دروستدەبن. ئەفاسیا هەوڵدەدات پێكهاتە بە ئەرك دەبەستێتەوە بە شرۆڤەكردنی كاریگەری ڕوشانی مێشكی لە سەر پرۆسەی زمان."

زۆر زمانەوانی تایبەت بە نیرۆزمانەوانی لە بارەی ئەو شوێنەوە دواون دەیڤید كریستال (١٩٩٢،ل٥٠) دەنووسێت:"ئەو ناوچەیە بەو ناوە ناونراوە پاش ئەوەی پۆل برۆكا ١٨٢٤-١٨٨٠ ی نوژداری فەرەنسی لە ڕێگای نەخۆشەكانیەوە ئەو شوێنەی لە مێشك دیاریكرد.ئەو شوێنە تایبەتە بە كێشەكانی دۆزینەوەی وشە." ماسیۆس (٢٠٠٧ ، ل ٤٥ ) لە فەرهەنگە زمانەوانیەكەی ئاوا لە دەڤەری برۆكا دەدوێت :" بەشێكە لە مێشك لە لای نەخۆشێكی پۆل برۆكا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە كە ناوچەكەی لە مێشك دووچاری زیانێكی گەورە ببوو." ئایچسین(١٩٩٢،ل ١٣٣)وردتر لە كریستال و ماسیۆس ئەو شوێنەی مێشك وەسف دەكات و دەنووسێت:"ئەو گەنگەشەیە ئەو كاتە دروستبوو،كاتێك پۆل برۆكا وەك سەرەدەبووسێك ئەو شوێنەی لە مێشك دیاریكرد،" لەنەزەر ئایچیسین ئەو شوێنە دەكەوێتە نێوچەوانی مرۆڤ ، نەختێك سەرەوەی گوێی چەپە .ئەو شوێنەی دوو نەخۆش بریندار ببوو ، لە

ئاكامدا بە خورتی دەیانتوانی هیچ جۆرە ئاخاوتنێك بكەن.ئەمە لە سەدەی نۆزدە بوو ، هەتا ئەمرۆش هەر برینداریەك لە دەڤەری برۆكا روبدات ، كێشەیەكی توند لە ئاخاوتن بەرپا دەكات..."

لە دیراساتی زمانەوانی ئاماژە بەوە دەكرێت كە ئەو بەشە چەپەی مێشك ، تایبەتە بە پرۆسەی قسەكردن.هەركاتێك مرۆڤێك لە روداوێكی وەك لێكدانی دوو ئۆتۆمبیل ، ناوچەی برۆكای تووشی بریندار بووبێت ، ڕاستەوخۆ ئەو برینداره تووشی گیروگرفتی ئاخاوتن دەبێت.

**دووەم ، ناوچەی وێرنیكا**

ئەو ناوچەیەش لە ڕێگای توێژینەوە پزیشكیەكان هاتۆتە ناو جیهانی زمانەوانی دوای دۆزینەوە پزیشكیەكانی برۆكا ، هەر لە سەدەی نۆزدەدا پزیشكێكی ئەلمانی هەر لە ڕێگای نەخۆشیەكانیەوە بۆم دەركەوت شوێنێتر لە مێشكدا هەیە پەیوەندی بە قسەی نەخۆشەوە نییە و لە بوارێكی تر پەیوەندی بە زمانەوە هەیە . كریستال ( ١٩٩٢، ل ٤١٨ ) دەنووسێت :"كارل وێرنیكەی نیرۆلیجستی ئەلمانی ١٨٤٨-١٩٠٥ پاش دیراسەكردنی مێشكی نەخۆشێك دەركی بەوە كرد كە مێشك هەر تەنیا پەیوەندی بە قسەكردنەوە نییە ، بەڵكو پەیوەندی بە تێگەیشتنەوەش هەیە . ئەو شوێنەی ئەو دیراسەی كرد ، بەناوی خۆی ناسرا ". هەر كریستال لە هەمان كتێب و لاپەڕەدا دەربارەی دەڤەری وێرنیكا دەنووسێت :" ناوچەكە لە مێشكی مرۆڤ دەكەوێتە بەشی سەرەوەی نەرمەی گوێ-پەڕەی گوێی مێشك . ڕوشانی ئەو شوێنە دەبێتە هۆی دژوار حاڵیبوون یان هەر كەڕبوون."هەروەها فرانك پاركەر و

کاسرین ریلێی ( ۲۰۱۰ ، ل ۲۸۵ ) دەربارەی ئەو ناوچەیە دەنووسن :" ئەو نەخۆشانەی لای برۆکا توێژینەوەیان لە سەرکرا ، دەرکەوت ئەو نەخۆشانە دەتوانن گوێیان لە قسە بێت ، بەلاّم ناتوانن قسە بەرهەم بێنن ، بە پێچەوانەوە ئەو نەخۆشانەی لای وێرنیکا توێژینەوەیان لە سەرکرا ، دەرکەوت دەتوانن قسە بەرهەم بێنن ، بەلاّم ناتوانن گوێیان لە قسەی بەرامبەر ببێت..." لە لاپەڕە ۲۸٦ی هەمان کتێب دەنووسن :" ناوچەی وێرنیکا نزیکە لە بەرگی بیستنی سەرەکی لە لای چەپی سەرەوە..."




**کورتە**

لە نێو مێشکی مرۆڤدا ئاخێوەر و گوێگر بوونیان هەیە ، بەلاّم میکانیزمی ڕێکخستنی ئەو دووە لە شتە شاراوەکانە .دەماری مرۆڤ کە هۆکاری سەرەکی لە کارکەوتنی تەرەفێکی جەستەن ، بەلاّم وەك لەم وتارە خۆیا دەبێت ، ئەو دەمارانەی مێشك بارگاوی کراون بە ئەرکی زمانەوانی جودا لە یەکتر . ئەو دوو دەڤەرەی برۆکا و وێرنیکا دۆزیانەوە ، وەلاّمی هەندی هۆکاری جەستەیی و زمانی دەدەنەوە .

## NLP:Natural language Processing

**ئێن ئێل پی**

پێوەری-پرۆسێسینگ- سروشتی زمان ئەو پێوەرەیە لە لایەن پێوەری کۆمپیتەر بۆ رستەکان و تێکستەکانە.

## Node

**نۆد-هێڵ-تیر**

تیر و بیرۆکەی تیر زیاتر لە هێلکاری داری و زمانەوانی بەرهەمهێن هەیە .ئەو تیرە پەیوەندی ئەو خاڵە بە هێڵی هێڵکاری داری.

## Non-finite

**دیارنەکراو**

بریتیە لەو شێوەی کردار وەك ئینفینیڤ-چاووگ.

## Non-sentence

**نا-ڕستە**

ڕیزبوونی وشەکانی زمان بە شێوەیەك کە بە پێی پێکهاتەی زمانەکە نەبێت ، ئەو ڕیزبوونەی سەرەوە نا-ڕێزمانییە.

## Non-Standard

**نا-ستاندەر**

بریتیە لەو فۆرم و شێوانەی کە ستاندەر نیین.

## North American Languages
### زمانەکانی باکووری ئەمریکا

بریتیە لە زمانەکانی هاوولاتی ئەمریکی بەتایبەتی باکووری مەکسیکۆ ، کە بە جیادەکرێنەوە کە بە زمانی ئینگلیزی دەدوێن.

## Noun and Nounphrase
### ناو و گرێی ناوی

ناو بەشێکی سەرەکی بەشەکانی ئاخاوتنە .ناو زۆر ئەرکی هەیە وەك مۆدیفایەر وەك مۆزەخانەی شوێنەوار هەروەها بکەر وەك مامۆستا پیرۆزە ، بەرکار ئەو لە مامۆستای دا!!

هەرچی گرێی ناوییە لە ناو و ئامرازێك پێکدێت.

## Nynorsk
### نینۆرسك

زمانی نینۆرسك زمانی دووەمە لە نەرویژ هەروەها ئەو زمانە زمانی ناسیۆنالیزمی نەرویژییە.(بروانە زمان و ئایدیۆلۆژیا).

## پیتی O

### obelisk
### هێمای خاچ

هێمایەکی تایپۆگرافیە هەروەها خەنجەریشی پێدەگوترێ.ئەرکەکانی بریتیە لە دابڕینی سەرچاوە یان دەق وەك هەبوونی دەهمەن و بیبلۆگرافیا هەروەها بەرانبەر کەسێك بنووسرێ ئەوا ئەو کەسە مردووە.

### Object
### بەرکار

بەشێکی پێکهاتەی پێکهێاتەی رستەیە .ئەگەر لە رستەکەدا کردارێکی تێپەر هەبوو ئەوا بوونی بەرکار لە رستەدا پێویست دەبێ، بەڵام ئەگەر کردارەکە تێنەپەڕ بوو ئەوا نەبوونی بەرکار لە رستەدا پێویست دەبێ.

### Object language
### زمانی بەرکار

بریتیە لەو زمانەی بەیان دەربارەی زمانێك دەدات.ئەو زمانەیە کە لەو پرۆسەیە پێکدێت.لە تیۆری ١٩٥٧دا چۆمسکی لە ریزمانی بەرهەمهێن کە ئەو رێزمانە لە مێتالانگویج هەیە.

## Obsolescence
## ونبوونی ڕێژەیی لە زماندا

لە زمانەوانی مێژوویدا ،ئۆبسۆلێسێنس بریتیە لە ناوچوونی ڕێژەیی دەرەوددا دەرفەت و مۆتیڤ لە ئاخاوتن لادەبات.

## Ob-Ugric
## ئۆب-ئوگریك

جۆرێکی ترە لە زمانەکانی خێزانەزمانی فینۆ-ئوگریك کە لە باکوور و ناوەندی ڕووسیا هەروەها لە هەنگاریا و فینلەندە....

## Official language
## زمانی ڕەسمیی

بریتیە لەو زمانەی کە بە ڕەسمی (یاسایەکی حکومەت یا دەستوور) بۆتە زمانی کارگێڕی حکومەت.ئەو زمانەیە کە یەکەیەکی سیاسی هەیە وەك زمانی ڕەسمی یەکێتی ئەورووپی کە بریتین لە زمانی ئینگلیزی ، فەرەنسی ، ئەلمانیە.

## Old English
## زمانی ئینگلیزی کۆن

بریتیە لەو زمانە ئینگلیزیەی پێش ساڵی ١١٠٠ هەبوورهەرچی ماسیۆسە بریتیە لەو دەقەی لە مێژووی زمانی ئینگلیزی هاوکاتە بە کۆتاییهاتنی فەتحی نۆرمەندی لە ١٠٦٦

## Old Norse

### نەرویجی کۆن

ئەو ناوە –نەرویجی کۆن- ناو بوو بۆ زمانی ئایسلاندیك لەمە دەردەکەوێت کە دەق-نووسین بەو زمانە لە سەدەی یازدە هەبوو.

## One form one meaning

### یەك فۆرم یەك مانا

پرانسیپی یەك فۆرم یەك مانا لە یەك زماندا جەخت لە سەر ئەوە دەکات کە پەیوەندیەکی یەك بۆ یەکی لە نێوان فۆرم و واتا هەیە بە تایبەتی لە مۆرفۆلۆژی مێژوویدا.

## onomasiology

### ئۆنۆماسیۆلۆژی

بریتیە لە توێژینەوە لە دانەوشە لەو شت و چەمکانەی دەدالەتی لێدەکەن

## Onomastics

### ئۆنۆماستیکس

ئۆنۆماستیکس بریتیە لە لقێکی واتاسازی دەربارەی ئیتیمۆلۆژی ناوی کەسی هەروەها ناوی شوێن لەو حاڵەتەش پێیدەگوترێ تۆپۆنیمی.

# Ontogeny

## ئۆنتۆگینی

بریتیە لە زاراوەیەکی بایۆلۆژی کە لە دەربارەی بنەچە و پەرەسەندنی ئۆرگانیەتی تاکی ، کەواتە ئۆنتۆگینی زمان بریتیە لە پەرەسەندنی ئەو دیاردەیە لە منداڵدا چونکە بنەچەی ئەو پەرەسەندنە بایۆلۆژیەیە.

# Order

## ڕیز

ڕیزبوونی ڕەگەزەکانی ڕستە بریتیە لە واتایەکی دەقاودەقی ریزبوون هەروەها لە زمانەوانی بونیادگەری ئەوروپیدا بریتیە لە پەیوەندی هەندێ پێکهاتەی ئەبستراکت.

# Organs of speech

## ئۆرگانەکانی ئاخاوتن

بریتین لە پێکهاتەی فسیۆلۆژی چالاك لە پرۆسەی قسەکردندا .ئەو ئەندامانە بریتین لە :

١.هەردوو لێو

٢.دەم —زار

٣.قورگ-گەروو

٤.لووت

٥.ددان

........

## Origins of language

### بنەچەی زمان

بنەچەی زمان دوو دیدی لە یەك جیاواز دەخاتەڕوو.دیدی دین وە دیدی دەرەوەی دین. لە دیدی ئیسلامدا مرۆڤدا وا پرۆگرامكراوە كە هەڵگری ئامێری وەرگرتنی زمانە.بۆیە ئادەم ناوی هەموو شتەكانی زانیوە.هەرچی دیدی دەرەوەی دینە سەرەتا لە سەر گریمان و تیۆر دامەزراوە. كەواتە لە دیدی ئیسلام زمان خەڵاتی خودایە هەرچی دیدی ترە باوەڕی وایە زمان بەرهەمی مرۆڤ و بیركردنەوەی مرۆڤە لە شتەكانی دەوروبەر.

## orthography

### سیستەمی نووسین

ئۆرسۆگرافی سیستەمێكی بە ستاندەركراوە دەربارەی نووسین لە زمانێكی تایبەت.

## ossetic ئۆسێتیك

زمانی گروپێكی كەمی دانشتوانی زمانەكانی گروپی ئێرانی لە باكووری قەوقاز.

## oxford English

### زمانی ئۆكسفۆرد

زمانی ئۆكسفۆرد یا زمانی بیبی سی یا زمانی لەندەن زمانی ستاندەری ئینگلیزیە .ئەو شێوەی زمانی ئینگلیزین كە مۆركی ستاندەریان هەیە.

زمانی ستاندەری ئینگلیزی لە رێگای هەندی پریستیژی زمانی لەندەن وەك زمانی بازرگانی وە زمانی سیاسی –میدیا، دامودەزگای مەعریفی وەك زانکۆی ئۆکسفۆرد وە زمانی پایتەخت ..دروستبوو. ئەو هەژموونە مەعریفی و سیاسی و جیۆپۆلیتیکەی شێوەی ئاخاوتن و نووسینەی لەندەن ، شێوەی لەندەنی کردە زمانی ستاندەری ئینگلیزی.

## پیتی P

### Paedography
### پادۆگرافی

بریتیە لە سیستەمێکی نووسینی تایبەت بەوەی وا دروستکراوە بۆ ئەوەی یارمەتی منداڵان بدات بۆ ئەوەی فێربن چۆن بخوێننەوە.

### Palatography
### پەلەتۆگرافی

بریتیە لە هەر تەکنیکێك بۆ تۆمارکردنی پەیوەندی لە نێوان زبان و بانی دەم لە ئافراندنی دەنگەکانی ئاخاوتن.

### Pahlavi
### زمانی پەهلەوی

دەوترێت کە زمانی پەهلەوی زمانی فارسی ناوەڕاستە.دەپرسین ئاخۆ زمانی پەهلەوی کوردی یان فارسی بووە؟

د. جەمال نەبەز لە لاپەڕە (٩٢)ی کتێبی "بێدەسەڵاتە کوردەکان و برا موسڵمانەکانیان" دەنووسێ: "ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپییەکان زمانی پەهلەوی pehlevi بە زمانی فارسی ناوەڕاست ناوزەد دەکەن". بەڵام د. نەبەز خۆی زمانی پەهلەوی بە "زمانێکی سەربەخۆ" دادەنێ، بەوەی نزیکترە لە زمانی کوردی وەك لە فارسی. ئەو ڕایەی د. نەبەز لە سەر بنەما و شەنگست نییە، تەنیا نزیکی

وشەکانی زمانەکـە و شـوێنەکەی کردۆتـە مـەرج! سـەدیق بۆرەکـەیی لەبـەرگی یەکەمی مێژووی وێژەی کوردی لاپەڕە (٢٤-٢٥) دەڵێ: زمانی پەهلەوی لە زمانی کـوردی دەچـێ و نـزیکترین زاراوەی (زار)ی کوردی،کـە لەگـەڵ ئـەم زمانـەدا هاوچەشنە، زاراوەی گۆرانی و و لوڕیە. " بۆرەکەیی و زوبێر بیلال هەندێ "بەڵگە" دەهێننەوە بەوەی، کە زمانی پەهلەوی زمانی کوردییە، یان زارێکـی کـوردی یـە. گیو موکریانی بانگەشەی ئـەوە دەکـات، کـە کتێبـی (دیـن کـەرد) بـە زمـانی پەهلەوی نووسراوە، ئەو زمانەش زمانی لوڕ و کەلهوڕ و شوانانە. مەردۆخی مێژوو نووسی کوردیش دەڵێ: "زمانی پەهلەوی یەکێ لە (شێوەکانی کوردی) بـووە، کـە گەلێ لە زاراوەی لوڕی و گۆڕانیەوە نزیکە".

زوبێر بیلال دەڵێ:" دوو جۆر پەهلەوی هەیـە، پەهلـەوی سـەردەمی ئەشـکانی ٣٠٠٠پ. ز ٢٢٤ز ئەو شێوەیان لـە (هـەورامی) و (فـەیلی) دەکـات، پەهلـەوی ساسانی ٢٢٤-٦٣٠. "

لەلایەکی تر، (ئاریرکە) لە ئەتڵەسی زمانەکانی هیندۆ — ئێرانیدا، کـوردی و فارس بە دوو زمانی (ئێرانی) دادەنێ، بەڵام لەژێر فارسی کۆن، زمانی پەهلەوی و وەك بەشێك لە قۆناغی، یان قوناغێك لە زمانی فارس دا دەنێ، د. فرست مرعـی لە "کردستان فی القرن السابع المیلادی" لاپەڕە (٢٤) دەنووسـێ، کـە لەسەرچـاوە عەرەبیە موسڵمانەکانیش زمانی (فارسی) و (پەهلەوی) لەیـەك جیاکراونەتـەوە، بەتایبەتی لەسەردەمی ئیسلامیدا.

بەکورتی، پەهلەوی زمانێکی ڕێنووس ئاڵۆز و گـران بـووە، بۆیـە لەسـەردەمی ئەخمینیەکان لەلایەك و سەردەمی ئەشکانی و ساسانیەکان، ماوە ماوە تـەنها وەك (زمانێکی) ئاینی، یان ئاخاوتنی خەڵك مامەڵەی لەگەڵ کراوە.

لەو سەرچاوانە بیرۆکەی وا خراونەتە ڕوو، کە زۆربەیان هـەر دەقـی هورمزگـان هەڵدەوەشێننەوە . ئەو دەقەی هەندێ بـە یەکـەم دەقـی کـوردی دادەنـێن . لێـرەدا

جەخت لە سەر ئەو زمانە و ڕێنووسی ئەو زمانە دەکەین بۆ ئەوەی بسەلمێنین، کە هەندێ نووسەر و توێژەری کورد چەند بێ ئاگان هەتا لە ڕایەکانی خۆیان!!

دەقی هورمزگان، ئەگەر بە پەهلەوی نوسرابێ وەك بانگاشە دەکرێ ئەمە ئەو دەقە دەبێ هی سەردەمانی ئەشکانی بێ،نەك ساسانی، چونکە سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، پێکچوون لە نێوان پەهلەوی ئەشکانی ۳۰۰۰پ. ز-۲۲٤ز و هەورامی، فەیلی لوڕی هەیە!! نەك پەهلەوی ساسانی!!

سەرچاوەکان دەڵێن پێکچوون هەیە لە نێوان زمانی پەهلەوی و شێوە زاری هەورامی،نەك هەردووك یەك بن. ئەو نووسەرە کوردانەی، لەوانە د. سەعید کوردستانی، حوسێن حوزنی موکریانی، ڕەشید یاسەمی، سەرەتا دەقەکەیان بلاوکردۆتەوە، دەقەکەیان بە (شێوە زاری هەورامی) بلاو کردۆتەوە، نەك بە زمانی پەهلەوی!!! هەروەها **پەهلەوی هەرووك (زمان) یان (شێوە زمان variety) بووە، هەروەها (ڕێنووس)یش بووە، کەچی هەورامی تەنها شێوەزارە نەك (ڕێنووس)!!** صاح قەفتانی مێژوو نووسی کورد لەلاپەڕە (۱۰٥)ی کتێبی (مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ) دەربارەی "ڕێنووس"ی پەهلەوی دەنووسێ... ***ئەلف و بای پەهلەوی زۆر سەخت و گران بوو، چونکە وەها دەرکەوتووە، کە لە نووسینی پەهلەوی دا هەزار پیت (حەرف) زیاتر بەکارهێنراوە!!!***

هەروەها قەفتانی قسەی هەندێ زانا دەربارەی ئەلفبای پەهلەوی دەگوازێتەوە و دەڵێ: دەنگ وایە لەکاتی دوایی ساسانیەکان دا بەفەرمانی شای ئێران شێوەی (فارس) بووەتە زمانی ڕەسمی حکومەت، چونکە نووسین و خوێندنەوەی پەهلەوی زۆر گرانبووە!!!

ئەمەش بەڵگەیە، کە هیچ نووسەرێکی کورد "دەقی هورمزگانی" بەزمانی پەهلەوی نەبینیووە!! زمانە هەورامیەکەی دەقەکە قەناعەت بەهیچ کەسێ ناهێنێت،کە زمانی کوردی سەردەمی دەرکەوتنی ئیسلام -۱٦-ی کۆچی بی لە

کوردستان!! ئەو زمانە شێوەزاری هەورامی دەقەکە، هی سەرەتای سەدەی بیستەمە، نەك سەردەمی ئیسلامی، چونکە هیچ دەقێکی فارسیش ئەوها (ڕەوان) نییە!!.

## Pakistan
## پاکستان

پاکستان هەتا سەربەخۆیی هیندستان بەشێکی ئیسلامی بوو لە هیند.پاش ئەوەی پاکستان لە هیند جیابۆوە ، لە ژێرەوە ئیش دەکرا بەنگەلادیش لە پاکستان جیاببتەوە لە حەفتاکان.

زمانی ئوردو زمانی ڕەسمی پاکستانە کە لە لایەن یازدە ملیۆن کەسەوە وەك زمانی یەکەمە وە لە لایەن ئەوانیتر وەك زمانی دووەم و سێیەمە.دەسەلاتدارانی پاکستانی دەیانوویست زمانی ئوردو بە سەر گەلی بەنگالی و زمانی بەنگالی بسەپێنن ، بەلاّم زۆربەی مامۆستا و قوتابی زانکۆ بەمە ڕازی نەبوون .ئەو ڕۆژە بووە زمانی دایك(بڕوانە زمانی دایك لەم فەرهەنگە)بێجگە لە زمانی ئوردو زمانی وەك پەنجاب ، سیندهی ، پشتۆ...٦٠ زمانی تر هەن.

## Paleography
## پالیۆگرافی

بریتیە لە دیراسەکردنی هەلکۆلّین و نووسینی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست بۆ ئەوەی هەرێم و بەروار و شێوەی ڕاستی دەق دەربخات.

## Pali
## پالی

بریتیە لە دەقی پیرۆز هیندۆ-ئاریانی.پـالی ئەندامــە لــە خێزانــە زمــانی هیندۆ-ئاریانیە.

## Panini
## پانینی

ڕێزماننووسێکی هیندی بوو یەکەم کەس بوو کە دەقی دەسەلاٌتدار لە بارەی سروشتی سانسکریتی بێنێتەبەرهەم لە نێوان سەدەی ٧ و ٥ی پێش زایین ژیاوە.کتێبە بەناوبانگەکەی ناوی هەشت کتێب.

## Panjab or punjabi
## پەنجاب —پونجابی

زمانی پونجابی زمانێکە دەگەڕێتەوە بۆ گروپە زمانی باکووری رۆژئاوای زمانەکانی هیندۆ-ئاریانی کە لە لایەن ٨٠ ملیۆن کەسەوە لە پاکستان و هیند و دەرەوەی ئەو دوو ولاٌتەوە قسەی پێدەکرێت هەروەها ئەو زمانە زمانێکی رەسمی ناوچەیی لە هەردوو پونجابی پاکستان و هیند.ئەو زمانە بە ئەلفبای گورموخی کە لە سەدەی ١٦ بۆ هەلٌکۆلٌینی سیخی داهێنراوە هەروەها لە بەشی پاکستان بە ئەلفبای عەرەبی دەنووسرێ .پونجابی زمانی ئایینی سیخەکانە.

## paradox
### پارادۆکس-پێچەوانە-هەڤدژ

هەبوونی بەیانێکی پارادۆکسی لە دەقێکدا کە بە یەکتر هەڤدژ بن ، وەك بەیانکردنی مەلیك تاووس لە جیلوە و مەسحەفا ڕەش کە لە یەکێکیان بە فریشتە وێنا دەکرێ کەچی لەویدی بە خوا.لەڕووکەش و ڕواڵەتدا بێهودە پیشان دەدرێ ،بەلاّم وا لە مرۆ دەکات قوولتر بە دووی ئاستی مانا بگەڕێت.

## Paragraph
### پەرەگراف

بریتیە لە یەکەیەکی دیسکۆرسی-ئاخاوتنی-نووسراو کە لە نێوان ڕستەیەك و تەواوی دەق دایە.لەوەندە نووسینە ئایدیایەکی تەواو دەبەخشرێت.

## Paronymy
### پارۆنیمی

پارۆنیمی دیاردەیەکی نامۆ نییە و لە زۆربەی زمانەکان بوونی هەیە.بریتیە لە پەیوەندی سیمانتیکی کە لە نێوان ئەو وشانەی داڕێژراون لە هەمان ڕەگ.ئەو وشەیە کە لە وشەی زمانی دی ڕۆنان کراوە بە هەندێ گۆڕانی کەم:

١.پۆنت —فەرەنسی وەرگیراو پۆنسی لاتینی ( وشەکە بە واتای پرد دێت)

٢.وەخت کوردیە لە وقت —ی عەرەبی وەرگیراوە.

## Parsing
## پارسینگ-شیکردنەوە

لە ڕێزمانی تەقلیدیدا بریتیە لە ڕاهێنانێکی پێداگۆجی-پەروەردەیی-شیکردنەوە و ناونانی ڕەگەزە ڕێزمانییەکانی تاکە ڕستەیەك.لە ئەمریکا ئەو شیکردنەوەیە ناسراوە بە هێڵکاریی-دایەگرامی-.

## Part of speech
## بەشەکانی ئاخاوتن

بەشەکانی ئاخاوتن ناوێکی کۆنە بۆ ناو و کردار و ئاوەڵکردار و ئاوەڵناو و ئامراز و ....بەلاّم ئەو وشانە لە ڕێزمانی وەسفی و بونیادگەریدا پۆلە وشەیان پێدەگوترێ.

## Patient
## پەشینت -بەرکار

لە هەندێ شرۆڤەکردنی ڕێزمانی رستەدا بریتیە لەو یەکەیەی دەکەوێتە ژێر کاریگەری کردارەوە وەك :

-ئازاد ئۆتۆمبیلەکەی لێخوڕی.

بەلاّم لە هەندێ دەربڕیندا دەبێتە بکەر دەربڕینەکە ، وەك

-پشیلەکە لە لایەن سەگەکەوە ڕاوکرا. وادیارە لەو جۆرە دەربڕینەشدا بکەری ڕستەکە بکەری ڕێزمانیە ، کە لە ڕستەی بکەر نادیاردا دەردەکەوێ.

## pedagogical grammar
## ڕێزمانی پێداگۆجی

بریتیە لە لێکدانەوەی ڕێزمانی زمان کە مەبەست لێی ئاسانکردنی پرۆسەی فێرکردن و فێربوونی زمانەکەیە .ئەو ڕێزمانە بە تایبەتی لە ناو پرۆسەی فێربوونی زمانی بیانیدا بوونی هەیە ئەو جۆرە ڕێزمانە ناکۆکە بە ڕێزمانی وەسفی یا ڕێزمانی تیۆری.

## Peirce , Charles Sanders 1839-1914
## چارلز ساندەرز پێرس

پێرس فەیلەسوفێکی ئەمریکی بوو هەروەها قسەی خۆی دەربارەی خودی زمانەوانی .لە زمانەوانیدا ئاماژە بە زاراوەی ئەبدەکشن و سێ قەدی تایپۆلۆژی هێما دەکات بە گوێرەی ئەو پەیوەندیەی لە نێوان سیگنالی بارگەکراو بە( هێما ) و( شت).

## performance
## پیادەکردن

پیادەکردن یا بەجێگەیاندنی بیرۆکە و هزری ناو مێشکە.ئەو پیادەکردنە ملکەچ و بەزاندنی یاساکانی زمانە .چۆمسکی لە چاپی شەستەکانی ڕێزمانی بەرهەمهێنان ئەو بیرۆکەی وەك دژی بیرۆکەی توانست داهێنا.لە لای چۆمسکی ئەو زاراوەیە وا پێناسەکراوە :" پیادەکردن بریتیە لە بەکارهێنانی کردەیی زمان لە ڕەوشی کۆنکریتیدا." پیادەکردن لەتیۆری پرانسیپ و

پارامیتەر پیادەکراوە لە سیستەمەکانی مێنتەلی-هۆشەکی-.هەتا تیۆرێك هەیە بەناوی تیۆری پیادەکردن.

## Persian
## زمانی فارسی

زمانێکی ئیرانیە ناسراوە بە فارسی .نیوەی خەڵکی ئیران قسەی پێدەکات .ئەو زمانە لەگەڵ زمانی داری و زمانی تاجیکی کۆنتینیکۆمێك پێکدەهێنێت.پاش کودەتای کۆرش لە سەر ئەستیاگی میدی زمانی فارسی شێوەیەکی بەرایی لە نەخشاندنەکانی ئەخمینی دەردەکەوێت.

## Philology
## فیلۆلۆژی

فیلۆلۆژی ناو بوو بۆ بزاڤی زمانەوانی پێش سۆسێر.فیلۆلۆژی زۆر کاری لە سەر دەرەوەی زمان دەکرد .دوو جۆری فیلۆلۆژی هەیە فیلۆلۆژی کلاسیکی و فیلۆلۆژی نوێ.سەدەی نۆزدەهەم سەدەی زێڕینی فیلۆلۆژی ئەورووپیە هەروەها لەو سەدەیەدەدا لە ویلیەم جۆنزەوە کار کرا لە سەر بەراوردکردنی زمانی هیندۆئەورووپی و زمانی تر وەك سانسکریتی ، لاتینی بۆ دۆزینەوەی دایکە زمان.مەلا تەرەماخی لە پێش ئەو هەوڵە ئەورووپیە بە چەن سەدەیەکەوە کاری لە سەر بەراوردکردنی عەرەبی و فارسی و کوردی.لە ساڵی ١٨٤٢ دا کۆمەڵگای فیلۆلۆژی لە لەندەن دامەزرا.

# Political language

## زمانی سیاسی

لە دەسپێکدا دەمەوێ بڵێم ئەم بابەتە شرۆڤەی ڕەوشی سیاسی وڵات ناکات.هەروەها دوورە لە زمانی نووسەری ناو کۆشکی دەسەڵات کە هەرگیز زمانێکی دەسەڵاتدار نییە ، بەڵکو زمانێکی بێدەسەڵاتە هەر دەبێ بڵێ : گەورەم ، ئەز بەنی ، ئەز خولام....هتد.کەواتە ئەم نووسینە هەوڵدەدات لە زمانی سیاسی بدوێت.

لە مەسەلەی زمانی سیاسیدا ، بە ئایدیۆلۆژیکردنی دەق ئەدگارێکی گرینگ دەبێت.

نووسەرێکی بیانی دەنووسێت :"لە کۆمەڵگای دیموکراتیدا هەر کەسێك تەنیا هاوڵاتی نییە ، بەڵکو سیاسەتمەندار و وتاربێژە.-جۆزیف ٢٠٠٦ ل – ١٣٣

جەمال بۆتانی ٢٠١٠ :|٣٤ دەنووسێت :"بە ئەدگارکردنی دەقێك بۆ ئەوەی بە زمانی سیاسی بناسرێت پێویستە لە سەر دوو مەرجی سەرەکی دامەزرا بێت.دوو مەرج و حاڵەتەکە بریتین لە مەرجی ئەرکیی و مەرجی سیماتیکی.دەقی سیاسی بەشێکە لە ئاکامی سیاسەتناسی "لەوانەیە لە حوکمی ڕۆژهەڵاتی ناڤین زمانی سیاسی بە جۆرێکی تر پێناسە دەکرێت ، چونکە لە باشترین کۆمەڵگای دا غیابی کۆمەڵگایەکی دیموکراسی هەست و دەرکی پێ دەکرێت و هەردوو مەرجەکەی تێکستی سیاسی لە نێو ئارێشە ئابووری و سیاسەکان ونکراون.

لە لایەکی دی زمانی سیاسی یان ئاخاوتنی سیاسی وەك گوتارێکی سیاسی پەیوەندی بە ڕەفتاری سیاسیەوە هەیە!

لە کۆمەڵگای ئازاد و نیمچە ئازاد مومارەسەی سیاسی بە وەزیفەی تاکەوە نەبەستراوەتەوە ، هەر تاکێك ، هەر هاولاتیەك بۆی هەیە سیاسی بێت و کاری سیاسی بکات ، بەلام لە کۆمەڵگای ڕۆژهەلاتی لە سیستەمی کۆماریش ماف بە کەسانی مالبەتەکە دراوە وەك لە سوریا ڕوویدا هەتا تێکستی دەستور پێشێل بکەن و دوای مردنی حافز ، بەشار ئەسەد لە شوێنی دابنێن.دابڕینی سیاسەت لە چەند کەسێك خۆی لە خۆیدا کوشتنی سیاسەتە لە ژیانی هاولاتی ئاساییدا.

کەواتە چۆن هەر ئامێرێك زمانی هەیە وەك دەگوترێ زمانی مۆسیقا ، زمانی ترافیك لایت ، زمانی دڵ سیاسەتیش زمانی هەیە ، بەلام زمانی سیاسەت پەیوەندی بە جۆری قسەکردن هەیە هەروەها لە بەر ئەوەی ئەو جۆرە زمانە موتەلەقی –وەرگر- زۆرە و هەندێ جار چارەنووس سازە ، بۆیە هەندێ ئەدگاری هەیە لە گەڵ ئەوانی دی جیاوازە.وەرگر بە بێ گرێ لە زمانی سیاسی ئاخێوەر تێبگات.لە هەندێ ڕووەوە زمانی هەندێ قورئان سیاسیە و چارەنووس سازە.لە نێوان وەرگێر و ئاخێوەر ناوەندێك هەیە و نابێ مەسەلەی چینایەتی هەستی پێ بکرێ تا ململانێیەکی چینایەتی وەك چۆن لە ئاخاوتنی نێوان ئاغا و کرمانج هەیە لە ئاخاوتنی ئاخێوەر دەرکی پێ نەکرێت.

هەروەك گوتمان هەموو تاکێك دەکرێ سیاسی بێ یان زمانی ئالوودەی سیاسەت بێ ، بەلام ناکرێ نکوولی لەوەش بکەین کە هەندێ دەقی سیاسی وەرگرەکی سیاسی دەوێ ،چونکە هەر ئەو دەقەش وەرگرەکە بینا دەکات.بە روونتر دەقی یاسایی و دەستووریی وا دەکات جۆرێك لە وەرگرمان هەبێ هەروەك چۆن دەقی زانستی وەك کیمیا و بایەلۆژی وەرگری خۆی هەیە.

**کورتە**

هەموو تاکێك دەکرێ لە کۆمەڵگای دیموکراتیك ببتە سیاسەتمەداربابپیرە گەورەی سەرۆکی ئەمریکا ڕۆژەك لە ڕۆژان کۆیلە بووە و زمانێکی بێ دەسەلاتی هەبووە ، کەچی ئەمڕۆ ئۆباما یان زمانی ئۆباما زمانێکی پڕ دەسەلاتە بە واتای مۆرکی سیاسی لە زمانەکەی بە پێی پۆستەکەی هەیە.هەندێ دەق هەیە وەرگری وا دەخولقێنێت هەتا لە کۆمەڵگای دیموکراتیك کە سنووردار و تایبەت بێت.

## Polysemy

### فرەواتا

فرەواتا یان پۆلیسیمی بەوە لە هاودەنگ و هاوپیت و وەکیەکنووسی جیادەکرێتەوە ، کە تەنیا وشەیەك هەیە مانا پەیوەستەکانی وشەکە لە یەکنزیکن. جۆرێکە لە پەیوەندی واتایی.(بۆ زیاتر بڕوانە لێکۆڵینەوەی نووسەر لەمەڕ فرەواتا).

## Post-structuralism

### پاش-بونیادگەری

ئەوەی پێی دەگوترێ چەقبەستی کە زمان یان تێڕوانینی وشە چەقبەستی زمانە بۆ ئەدەب و رەفتاری تر .لە شێوازگەری ئەدەبیدا بیرۆکەکەی سەرەوە پەیوەستە بە بۆچوونی بونیادگەری بۆ شیکاری کە جەخت لە سەر دیراسەکردنی زمانی دەق دەکات بۆ بەدەرەوەخستنی تاکایەتی نووسەر، کۆنتێکستی کۆمەلایەتی هەروەها رەوشی مێژوویی.

پاشبونیادگەری زمان وەك سیستەمێك دەبینێت كە بەهاكانی بە وەلآمی فاكتەری نا زمانەوانی دەگۆڕێت.ئەو زنجیرە تێرامان و ڕایانە سرنج ڕادەكێشن بۆ فرە واتایی وشەكان كە جەخت لە سەر پرۆسەكانی هۆشەكی دەكەن لە شرۆڤەكردنی پەیوەندیە زمانەوانیەكان هەروەها نكۆلی لە مومكنبوونی بابەتیەتی لە تەفسیری دەقێتی دەكەن.

بیرۆكەی پاش-بونیادگەری یان دژە-بونیادگەری لە كۆتایی شەستەكاندا سەریهەڵدا ، ئەو میتۆدە لە لایەن جاك دریدا ١٩٣٠-؟ پەرەی پێدرا و دەیگوت كە بۆچوونەكانی لۆگۆسێنتەری-بە مەركەزیبوونی وشە پڕیەتی لە ئایدیای نكۆك بەیەك و هەڤدژ.

## Pragmalinguistics
## زمانەوانی پراگماتیكی

بریتیە لە دیراسەكردنی بەكارهێنانی زمان لە ڕوانگەی ژێدەرەكانی سترەكچەرەكانی زمان .ئەو دیتنەش ناكۆكە بە دیراساتی پراگماتیكی كە دیراسەی ڕەوشەكانی بەكارهێنانی زمان لە ڕەوشە كۆمەلآیەتیەكان.بۆچوونی زمانەوانی پراگما لەوانەیە بە سیستەمی ڕاناوی زمان هەرچی دیراساتی پراگماتیكیە بە باكگراوەندی كۆمەلآیەتی بەشداربووان دەستپێدەكات هەروەها لەو ڕێگایانە دەكۆڵێتەوە كە فاكتەرە جیاوازەكان وەك سێكس و تەمەن و چین خەڵك ئاراستە دەكەن كە چ راناوێكی تایبەت هەڵبژێرن.

# Pragmatics
## پراگماتیکس

پراگماتیکس وەك واتاسازی دیراسەی واتای خودی وشە ناکات ، بەڵکو دیراسەی زمان لە روانگەی بەکارهێنانەکانیەوە دەکات .ئەو جیاوازیە خاڵی لەیەکجیاکرنەوەی هەر دوو زاراوەیە.

### پوختەیەك لەبارەی پراگماتیکس – ەوە

پراگماتیکس بەشێکە لە زمانناسی و لە ڕۆڵی دەوروبەر لە دیارکردنی واتای ئاخاوتن دەکۆڵێتەوە. ئەم بەشەی زمانناسی تا سییەکانی سەدەی بیستەم وەك بابەتێکی زمانناسی دیراسە نەدەکرا. لەپاشان بەهۆی گرنگیی زمانی ئاخاوتن گرنگییەکی زۆر بە پراگماتیکس درا.

ئەم کورتە نووسینە هەوڵدانێکە بۆ ڕوناهی خستنە سەر چەمکی پراگماتیکس لە ئاخاوتنی کوردیدا. لە بەرایی بۆ ئەوەی تەواو لە پراگماتیکس بگەین هەوڵدراوە ڕای هەندێ زمانەوان لەبارەی ئەم چەمکەوە بخرێتە ڕوو.

لەسەر باسەکانی دی وەك بەشەکانی پراگماتیکس ئەوا بە کورتی و پوختی لە هەریەك جێناو و هۆنریفکس و گریمانی پێشینەو کردەکانی ئاخاوتن و جۆرەکانیان کۆڵدراوەتەوە.

چاوەڕێ دەکرێ ئەم کورتە نووسینە دەروازەیەك لەبارەی پراگماتیکس لە زمانی کوردیدا بکاتەوە، خۆیشی تەنیا هەنگاوێك بێ بۆ زیاتر نزیکبوونەوە لەم بابەتە.

## چەمکی پراگماتیکس

پراگماتیکس لە پەیڤی پراگمای یۆنانی-ەوە هاتووە کە لە ڕەسەندا بە واتای کارکردن، یان پراکتیك دێ.(۱) ئەم زاراوەیە لە زمانەوانیی دێریندا ناوێك بوو بۆ هەرسێ جۆری، یان بەشی سەرەکیی سێمیۆتیکس(۲) سیمانتیکس (واتاسازی) و سینتاکس (ڕستەسازی) دووبەشە سەرەکییەکەی تری زمانناسین. دەوترێ کە چارلس مۆریس لە ساڵی (۸۳۹۱) بۆ یەکەمجار زاراوەی پراگماتیکسی بەکارهێناوە.(۳) پراگماتیکس لە زۆر بواردا بەکاردێ فەلسەفە، سیاسەت، زمانناسی. ئەم کورتە نووسینە تەنیا لە بواری زمانناسی-دا لەم چەمکە دەکۆڵێتەوە.

زۆر زمانناس لەبارەی پراگماتیکسەوە دوواون زۆربەیان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە پراگماتیکس زیاتر پەیوەستە بە دەوروبەرەوە **Context**. پراگماتیکس بریتییە لە بەکارهێنانی زمان لەدەوروبەردا(٤) هەروەها دەیڤد کریستال دەنووسێ کە لەزمانناسیی نوێدا پراگماتیکس بە واتای دیراسەکردنی زمان دێ لە ڕوانگەی بەکارهێنەرانی زمانەوە - زمانی خەڵکەوە(٥) لەمەش زیاتر دیراسەکردنی بەکارهێنانی زمان لە ئاخاوتن و بەتایبەتی پێوەندیی نێوان ڕستە و دەوروبەر و ئەو ڕەوشانەی کە زمانی تێدا بەکاردێ بنەماو شەنگستی پراگماتیکس دەنوێنێ(٦) وێڕای ئەوەی ئابچسن جەخت لەسەر بەکارهێنانی زمان دەکاتەوە، زیاتر دەنووسێ: »پراگماتیکس بریتییە لە لقێکی زمانناسی کە دیراسەی ئەو لایەنانەی واتا دەکات کە تیۆریی واتا نایگاتێ، یان ناتوانێ دیراسەی بکات.«(۷) ئەوەی لە پراگماتیکس دەفامرێتەوە، ئەوەیە زانیاریی زمانەوانیی بەس نییە بۆ گەیشتن

بە چەمکی واتا،چونکە ئەو واتایەی پراگماتیکس مەبەستێتی لە خودی وشە و فرێز و ڕستەکاندا بەدی ناکرێ، بەڵکو زیاتر پەیوەستە بە شوێن و ڕەوشی وشەکان، نۆوم چۆمسکی لە دیراسەکردنی زماندا دوو چەمکی نوێی داهێنا ئەویش توانا، یان زانیاریی زهنی Competence و بەکارهێنانی زمانە Performance ئەوەی یەکەم دەکرێ لە بواری زمانناسیی ڕووتدا دیراسەی زمانیی پێ بکرێ هەرچی هی دووەمە ئەوا پەیوەستە بە ڕەوشی بەکارهێنانی زمان لە هەندێ شوێندا(٨) بێگومان، ئەم جۆرە بەکارهێنانە زیاتر پەیوەستە بە ئاخاوتن Utterance. هەر لەم ڕوانگەیەوە فینچ واتای ئاخاوتن و واتای ڕستە لەیەك جودا دەکاتەوە و دەنووسێ: پراگماتیکس دیراسەی واتای ئاخاوتن دەکات هەرچی سیمانتیکسە دیراسەی واتای ڕستە دەکات(٩) لێرە هەر فینچ دوو پرسیار دروست دەکات بۆ ئەوەی زیاتر ئەم دوو چەمکە لە یەك جودا بکاتەوە. پرسیاری: واتای چ دەگەیەنێ؟ پەیوەیستە بە سیمانتیکسەوە، چونکە پرسیارەکە ئاراستەی واتای پەیڤەکە، فرێزەکە، یان ڕستەکە دەکرێ، هەرچی پرساری: مەبەستت چییە؟ ئەوا پرسیارەکە ئارستەی شوێنی پەیڤەکە، یان ڕستەکە لە ڕەوشێکی تایبەت دەکرێ، یان هەر پرسیارەکە ئاراستە کەسەکە دەکرێ. ئەمەش خاڵێکی سەرەکیی لە یەك جیاکردنەوەی پراگماتیکسە لە سیمانتیکس(١٠) لەلایەکی ترەوە پراگماتیکس بە واتای ڕاڤەکردنی، یان تەئویل دێ. لەم ڕوانگەیەوە لە کتێبی Languageدا پراگماتیکس بەواتای دیراسەکردنی کاریگەرییەکانی دەوروبەر، یان دەق بەسەر واتا دێ، یان پراگماتیکس بریتییە لە ڕاڤەکردنی ڕستە بەپێی دەق(١١) هەر لە شەستەکانیش کاتز و فوودەر لەو باوەڕەدابوونە

کە جەوهەری تیۆریی پراگماتیکس بریتییە لە لابردنی لێڵیی ڕستە بەهۆی دەقەوە ،یان دەوروبەرەوە(١٢) لە حەفتاکانیش گرنگیی کاریگەریی دەوروبەر لە ڕاڤەکردنی واتای ویستراو زیاتر گەشەی کرد.(١٣)

**مەودای پراگماتیکس**

لە دیدی زۆر زمانناس، فەیلەسووفی ئەمریکی پاول گرایس باوکی پراگماتیکسە. بەلای گرایس-ەوە ئەم چوار یاسایەی خوارەوە کە هەر خۆی دایڕشتوون(١٤)، بنەماو شەنگستە بنەڕەتییەکانی پرەنسیپی هاریکار پێکدێنن(١٥). چوار یاساکەش ئەمانەی خوارەوەن:

١- یاسای چەندێتی.

٢- یاسای چۆنیەتی.

٣- یاسای پێوەندی.

٤- یاسای ڕێککاری.

یاسای یەکەم بریتییە لە بری ئەو زانیارییەی کە چاوەڕێ دەکرێ لە ئاخاوتن بە دەست بێ. بۆ نموونە لەم ئاخاوتنانە وردبەوە ئەو کەسە کێیە لەگەڵ هیوا؟

ئەو بڕە زانیارییەی وەڵامی خوارەوە، زانیارییەکی بەسە بۆ وەڵامی پرسیارەکە، نەك وەڵامی دی:

هاوژینی تی - دەسگیرانی تی

بەڵام ئەگەر بڵێین..- ژنێکە، یان کچێکە

یان- ئەمە خاتوون کەژاڵی کچی وەستا عومەری دراوسێمانە کە لە (٥٢/٩/١٩٧٧) لەدایك بووە.

گوێگر پێویستی بەم جۆرە وەڵامانـە نییـە، بـەڵکو تـەنیا چـاوەڕێی بـڕێ زانیاری دەکا، ئەم بڕە زانیارییەش پرەنسـیپێکی بنـەڕەتی یاسـای هاوکـاری کردنە Coop erativeprinciple.(١٦)

هەروەها وەڵامی پرسیاری خوارەوە، بڕێك زانیاری دەبەخشێ.

- کێ کێکەکەی خواردووە؟

- من هەندێکم خواردووە.

وشەی ((هەندێك)) ئـەو بـڕە زانیارییـە پێویسـتەت پـێ دەبەخشـێ کـە پێویستە.

**یاسای چۆنیەتی**

ئـەم پرەنسـیپە زیـاتر پەیوەسـتە بـە ((ڕاسـتی گـوتن)) و ((ڕاسـتی نەگوتن))، یان ئەم یاسایە لەسەر بنەمای وەڵامی ڕاسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ دامەزراوە. گرایس وئایچسن و فینچ پێشنیاز دەکەن کە وەڵامی پرسیار ڕاسـت و دروست بدرێتەوە، چونکە بەم جۆرە هاریکاریی گوێگر ،یان قسە بـۆ کـراو دەکەی، بۆ نموونە ئەگەریەکێ بپرسێ:

وانەکەی مامۆستا دلێر چۆنە؟

هەیە جورئەتی ئەوە ناکات وەڵامی دروسـت بداتـەوە، بۆیـە وەڵامێکـی وا دەداتەوە کە هیچ پێوەندیی بە پرسیارەکەوە نییە وەك بڵێ:

- وانەکەی مامۆستا دڵشاد خۆش نییەیان

- با هەندێ باسی ئەورووپات بۆ بکەم.یاسای پێوەندیئایچسـن دەنووسـێ: ئەگەر یەکێ پرسیاری لێ کردی و وتی:- چمان هەیە بۆ نانی ئێوارێ؟

- ماسی و پەتاتەی سوورکراوە.

ئەم جۆرە وەڵامە پێوەندیی بە پرسیارەکەوە هەیە نەك بڵێی: کورسی و مێز(١٧).هەروەها فینچ بۆ ئەم بابەتە ئەم پرسیارو وەڵامە دەهێنێ(١٨).

- چوکلێتەکانم لەکوێن؟
- منداڵەکان ئەم بەیانییە لە ژوورەکەت بوون.

ئەم وەڵامەش پێوەندیی بە پرسیارەکەوە هەیە، چونکە لە (چوکلێتەکان) دیار دەبن، کەوا گومانی ئەوە دەبرێ کە منداڵەکان خواردبێتیان.

**یاسای ڕێککاری**

ئەم پرەنسیپە هاریکاریی گوێگر دەکا کە بە دروستی لە ئاخاوتنەکە بگات، یەك لەدوایەك هاتن، یان بوونی جۆرە هارمۆنییەك لەنێوان ڕووداوەکانی ئاخاوتندا شەنگستی سەرەکیی ئەم یاسایەیە(١٩).

لە خەو هەستام و چاوی خۆم شوشت و تێشتی خۆم خوارد. ڕستەیەکە ڕووداوەکان یەك لەدوایەك دێن هەر گۆڕانێك لەو ڕێککارییە واتای بنەڕەتیی ئاخاوتنەکە دەشێوێنێ.وێڕای ئەم چوار یاسایەی گرایس، پراگماتیکس سێ بابەتی سەرەکی لەخۆ دەگرێ ئەویش بریتین لە ئاماژە کاری **deixis**، گریمانی پێشینە **Presupposition** هەروەها کردەی قسە، یان ئاخاوتن **Spech act**.

یەکەم: ئامرازەکانی ئاماژە کردن

وشەی »**deixis**« لە ڕەسەندا وشەیەکی یۆنانییە بە واتای »ئاماژە کردن« یان »دیارکردن« دێ.(٠٢)

زمانناسان لەسەر ئەم ڕایەن کە زاراوەی **deixis** بۆ وشەیەك، یان گرێیەك بەکاردی کە ڕاستەوخۆ ئاخاوتن بە »کات« و »شوێن« و »کەس«

دەبەستێتەوە(١٢) لەمەش زیاتر کریستال دەڵێ دەکرێ هەروەها بۆ ئەو وشانەش بەکاربێ کە ئاماژە بۆ ئاراستەی بەرەو پێشەوە، یان دواوە لە ئاخاوتن دەکەن بەکاربێ(٢٢).

لە deixis چوار ئامرازی سەرەکی هەن کە هەموو کاری ئاماژە کردن دەردەبڕن.(٣٢)

١- جێناوی کەسی

(أ) جێناو: جێناوی کەسی دەکرێ وەك ئاماژە بەکاربێ. جێناوی وەك تۆ - هی تۆ" من - هی من" ئەو - هی ئەو. لە زماندا جێناو لە بریتیی ناو بەکاردێ، بەڵام ناسینەوەی جێناو پەیوەستە بەو کەسە ناسراوەی کە جێناوەکە ئاماژەی بۆ دەکات. لە خۆمانەوە ناتوانین بڵێین: ئەو کوژرا. ئەگەر پێشتر نەزانین ژێدەری »ئەو« کەسێکی دیاری کراوە. ئەمە و جۆرە جێناوێك هەیە کە ((نزیکی)) و((دووری)) نیشان دەدەن. لە کوردیدا

- ئەم (بۆ نزیکییە)
- ئەو (بۆ دوورییە) ※

کە دەڵێین: ئەو هات نەك ئەم

خوێنەری کورد دەزانێ مەبەستی قسەکەر لەم ڕستەیەدا چییە.

سەبارەت بە نزیکی و دووری ئەوا هەندێ ئاوەڵکاریش هەن کە دەلالەت لە نزیکی و دووری دەکەن وەك:

- ئێرە (نزیك)
- ئەوێ (دوور)

(ب) جێناو و ئەوەڵناوی ئاماژەیی

ئەم کۆمەڵەیە ژمارەیان چوارە:

ئەم (this) نزیك و تاك

ئەو (that) دوور و تاك

ئەمانە (these) نزیك و کۆ

ئەوانە (those ئەوانێهیَ) دوورو کۆ

ئەگەر هەریەك لەمانە بە تەنیا هاتن، ئەوا جێناون وەك:

- ئەمە هی منە.

- ئەوێهیَ برامە.

بەلاّم، ئەگەر لەپاش هەریەك لەمانە ناوێك هات، دەبنە ئاوەڵناوی نیشانە، یان ئاماژە، وەك:

ئەم کتێبە هی منە.

- ئەو کوڕێهیَ برامە.

لە هەردوو باردا دیاردەی ئاماژە هەیە و هەریەکەیان ئاماژەیە بۆ ژێدەرێك کە لە ئاخاوتنەکەدا هیچ لێڵێیەك لەنێوان قسەکەر و گوێگر دروست ناکات.

(جـ) ناوی کەسی

لە ئاخاوتن کە ئاماژە بۆ هەر ناوێـك دەکـریَ ناوەکـە ناسـراوە قسـەکەرو گوێگر دەزانن کێیە. بۆ نموونە کە دەڵێین هیوا، دکتۆر ڕێبوار، ڕێزدار عەلی، کوێخا مەجید، سوارە ئاغا هەریەك لەم ناوانە کە لە ئاخاوتن دێن نیشانەن، یان ئاماژەن بۆ کەسێکی دیارکراو.

٢- نیشانەی کات

دوێنێ - ئەوسا" ئێستا - هەنووکە - هەر ئێستا" سبەی - تاوێکی تر دەستەواژەی نیشانەن ئاماژە بەکاتی دەربڕینی ئاخاوتن دەکەن. هەریەك لەمانە لە کوردیدا دەگەڵ کردار لە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆو هارمۆنیدان، بۆ نموونە کە دەڵێین

- دوێنێ ئازاد هات.

- ئەوسا هەموو شتێ هەرزان بوو.

((دوێنێ - هات)) و((ئەوسا - بوو)) دەبێ پێکەوە بێن بۆ ئەوەی ئاماژە بۆ ((خاوتن)) و((کارێکی)) ڕابردوو بکرێ هەمان شتیش سەبارەت بە ((ئێستا - دێ)) و((کەمێکی تر، دێتەوە)) دروستە بۆ کاتی ئێستا و داهاتوو یەك لەدوای یەك. لەمەش زیاتر زۆر گرنگە کاتی ئاخاوتنەکە دیاری بکرێ کە دەڵێین:(٢٤)

سەعاتێکی تر دێینەوە.

دەبێ لەژێر ئەم ئاخاوتنەدا کاتی نووسینی ئاخاوتنەکە بنووسرێ ئەگەرنا گوێگر، یان خوێنەر نازانێ ((سەعاتێکی تر)) ((کەنگییە)) کە دەڵێین:

سبەی کۆبوونەوەمان هەیە.دەبێ ئەم ((سبەیە)) دیاربکرێ. ئەگەر ئەم ((سبەیە)) دووشەممە بێ، ئەوا دەبێ ئاخاوتنەکە ڕۆژی یەك شەممە بگوترێ، چونکە ئەگەر شەممە- بۆ نموونە- بگوترێ ئوا دەبێ بگوترێ ((دووسبە، یان دوزبە))

٣- نیشانەی شوێن

لەبەشی جێناودا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە هەریەك لە ((ئێرە)) و((ئەوێ)) دوو ئامرازی نیشانەن ئاماژە بۆ شوێنی نزیکی و دووری دەکەن. لێرەش دەبێ شوێنی قسەکەرەکە دیاربکرێ کە یەکێ لە هەولێر دەڵێ:

- ئێرە خۆشەو ئەوێ ناخۆشە.

((ئێرە)) دیارە مەبەست هەولێرە، بەڵام هەرچی ((ئەوێ)) یە جۆرە لێڵییەك لە ئاخاوتنەکە دروست دەکات، بەڵام هەرکە زانرا پێشتر قسەکەر و گوێگر باسی شارێکی دیی دیارکراویان کردووە،((ئەوێ)) یە کە لێڵییەکەی نامێنێ لێرەش دەوروبەر ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ لە لێڵی لابردنی ئاخاوتنەکە و ڕاڤەکردنی واتای ((ئەوێ))

٤- هۆنریفکس

تراسك لە پێناسەی چەمکی هۆنریفکس -دا دەنووسێ هۆنریفکس شێوازێکی لێکسیکی، یان ڕێزمانیی دیارە کە وەك شێوەیەکی باو بەکاردێ بۆ دەربڕینی ڕێز بەرامبەر قسە بۆ کراو یان گوێگر. بە زۆری ئەم دیاردەیە لە هەندێ دەقدا کارێکی ناچاری و پێویستە))(٢٥)

کریستال دەنووسێ هۆنریفکس زاراوەیەکە لە شرۆڤەکردنی ڕێزمانیی هەندێ زمان بەکاردێ(٢٦) لەنێوەندی ئاخاوتنەکەدا ئاستەکانی ڕێز و خۆشەویستی بەرامبەر کەسی قسە بۆ کراو، دەردەکەوێ. تەهرانی دەنووسێ هۆنریفکس فۆرمۆلەیەکی ڕێز دەربڕینە لە هەندێ زماندا ئەمەش بەهۆی چەند پاشگرو پێشگرێکی دیارو هەندێ وشەو پێکهاتەی هەندێ ڕستەوە دەردەبڕێ(٢٧) زمانی ژاپۆنی بەوە ناسراوە کە سیستەمێکی ئاڵۆزی هەیە بۆ دەربڕینی ڕێز بەجۆرێ ئاوەڵناو، ناو، فرمان. هەریەکێ لەوانەبەهۆی پاشگرو

پێشگرەوە ڕێز دەردەبڕن پێشگری (-ه) لە ژاپۆنیدا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لەدەربڕینی ڕێزدا بەبێ بەکارهێنانی ئەم پێشگرە وشەکە هیچ ئاماژەیەکی ڕێزی تێدا نییە.(٢٨)

لە زمانی ئینگلیزی هەندێ دەستەواژەی وەك:

- خاوەن شکۆ" گەورەم" ڕێزدار" خاتوون بۆ دەربڕینی ڕێز بەکاردێن. لە کوردیش هەندێ دەربڕینی وەك:گەورەم، ئەزبەنی، ئەزخولام، خاتوون... نەك هەر ئاماژە بۆ ڕێزو حورمەت دەکەن، بەڵکو لە هەمان کاتیش ئاماژەن بۆ هەبوونی دیاردەی چینایەتی. لە کولتووری کۆنی کوردیدا بەتایبەتی لە کۆمەڵگای دەربەگیدا دەبوو کرمانج بەرامبەر ئاغا بڵێ:گەورەم -ئەزبەنی - ئاغام - بەگم، میرم بە ژنەکانی چینی دەسەڵاتداریش بڵێ:

ئاغا ژن، خاتوون

ئێستاش لە هەندێ شوێنی کوردستان ئەم دیاردەیە هەر هەیە.

لە هەندێ زماندا وەك فەرەنسی و ئیسپانی سیستەمی جێناو ئاماژە بە دیاردەی نیشاندانی ڕێز دەکەن.(٢٩) لە کوردیش کە قسەکەر لە ئاخاوتنەکەیدا بەگوێگر دەڵێ:

- ئێوە

- جەنابی ئەو

- جەنابی سەرۆك

هەریەك لەمانە ڕادەی ڕێز بەرامبەر قسە بۆ کراو، یان لە بارەکراو نیشاندەدەن، بەڵام ئەگەر لە بریتی ((ئێوە)) ((تۆ)) بەکاربێ لە بریتی

((جەنابی ((ئەو)) ((ئەو)) بەکاربێ ئەوا ڕادەی ڕێزەکە نامێنێ ،یان کـەمتر دەبێ.

ئەمە و ناکرێ نکوولّی لەو ڕاستییە بکرێ کە دەوروبەر ڕۆڵێکی سـەرەکی دەبینێ لـە نیشـاندانی ئاسـتی ڕۆشـنبیری و ڕەوشـی کۆمەڵایـەتی و بـاری چینایەتی.

لـە بـواری مۆرفۆلـۆژیش، دیـاردەی هـۆنریفکس هەیـە. جیاوازییـەکی چینایەتی و کۆمەڵایەتی لەم وشانە هەیە ((مردن)) و ((کۆچی دوایی کردن - چوونە بەر دلۆڤانیی خودێ)) هـەروەها وشـەی ڕەحمـەتی لەگـەڵ وشـەی ((نەفرەتی - لەعنەتی)) بەراورد ناکرێ. کە دەڵێین:

- سەرۆك کۆچی دوایی کرد،

یان سەرۆك چووە بەر دلۆڤانیی خودێ .

یان- ڕەحمەتی - بەهەشتی مرۆڤەکی چاك بووە.

ئەم ئاخاوتنانە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئاخاوتنکەر ڕێزێکـی زۆر لـە قسـە لەسەر کراو دەگرێ. بە پێچەوانەش هیچ ڕێزێك لەم ئاخاوتنانەدا نییە.

سەرۆك مرد، یان

سەرۆك ئاو ئاو چوو.

یان سەرۆك گۆڕ بەگۆڕ بێ، یان

لەعنەتی مرۆڤەکی دڕندە بوو.

دووەم: گریمانی پێشینە

چەمکی گریمانی پێشینە لەبواری فەلسەفی و زمانەوانیدا بەکاردێ. ئەوەی پێوەندیی بەزمانەوە هەیە بریتییە لەو پرۆسە لۆجیکییەی کە ئاخاوتن لەخۆی

دەگرێ. قسەکەران بە زۆرەی هەندێ گریمانی شاراوە، یان ناڕاستەوخۆ لەبارەی جیهانی واقیعیدا دروست دەکەن هەروەها واتای ئاخاوتنێك دەکرێ لەسەر ئەو گریمانانە بونیاد بنرێ. لە نەزەری فارۆخپی ئەم جۆرە گریمانانە لە پراگماتیکس پێیان دەوترێ گریمانی پێشینە(٣٠). هەروەها دەکرێ گریمانی پێشینە بەجۆرێکی تایبەتی، ئەوەی پێی دەوترێ ئاکامی پراگماتیکی ناوزەد بکەین(٣١)

ئەمەش هەر پەیوەستە بە دەقەوە، یان ئەو چوارچێوەیەی کە ئاخاوتنەکەی تێدا بەرپا دەکرێ. هەر لە ڕێگای دەقی ئاخاوتنەکە هەندێ زانیاری بەشێوەی ڕاستەوخۆ ڕانەگەیەنراو ڕادەگەیەنرێ. ئەگەر یەکێ بلّێ:

ئازاد بۆ ئەوەندە لە ژنەکەت دەدەی

ئەم ئاخاوتنە دوو زانیاریی ناڕاستەوخۆ ڕادەگەیەنێ:

١- ئازاد ژنی هێناوە.

٢- ئازاد تووڕە و توندە هەر لە ژنەکەی دەدا(٣٢).

هەروەها کە دەگوترێ:- پاشای بەریتانیا ژیرە.

ئەوا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بەریتانیا سیستەمی ((مەلەکییە)) و هێشتا پاشای ناوبراو لە ژیاندایە. ئەم ڕستەیەی خوارەوەش زیاتر دیاردەی گریمانی پێشینە ڕوون دەکاتەوە:

- دایکی ڕێبوار، کەی باوکی ڕێبوار دەگەڕێتەوە؟

لێرەدا پێشبینی ئەم شتانەی خوارەوە دەکرێ:

١- ژن و مێردێك هەن قسەکەر ڕێزیان دەگرێ و بەناوی خۆیان بانگیان ناکات.

٢- هەر چ نەبێ کوڕێکیان هەیە نـاوی ڕێبـوارە هـەروەها دەکـرێ ڕێبـوار نۆبەرە بێ.

٣- باوکی ڕێبوار لەکاتی ئەنجامـدانی ئاخاوتنەکـە لـەماڵ نییـە، بـەڵام دەکرێ زوو بگەڕێتەوە ماڵ.

فینچ لەلای خۆیەوە هەندێ نموونە دێنێتەوە وا پیشان دەدا کە گوێگر دەبێ زانیارییەکی زمانەوانی زۆری هەبێ هەتا لەمەبەسـتی قسـەکەر بگـات، بـۆ نموونە کە دەڵێ:ژوورەکەت لانەی بەرازە.

لێرەدا دەبێ گوێگر لە ((لانەی بەراز)) بگاو بزانێ ئەم وشـانە لێـرەدا بـە واتای پیسوپۆخڵ دێ(٣٣). بە شێوازێکی تر فینچ پێشبینی ئـەوە دەکـا کـە جۆرە پێوەندییەکی دیالیکتیکی لەنێوان قسەکەر و گوێگر هەیە. ئـەم جـۆرە لە یەکگەیشتنە لێڵی لە ئاوخاتنەکە ناهێڵێ هەروەها هەڵوێسـتی قسـەکەر لەبەرامبەر قسە بۆ کراو نیشان دەدا.

**سێیەم: کردەکانی ئاخاوتن**

زاراوەی کردەکانی ئاخاوتن تیـۆرێکی نوێیـە بـۆ یەکـەمجار فەیلەسـووفی بەریتانی ج. ل. ئۆستن(١٩١١ - ١٩٦٠) ساڵی (١٩٥٥) لە زانکۆی هـارڤرد بڵاوی کـردەوە(٣٤). بـە گـوێرەی تیـۆریی کردەکـانی ئاخـاوتن، یـان کـردە قسەییەکان زمان هەر تەنیا ئاخاوتن - قسە نییە، بەڵکو کردەشە، چونکە لە هەر گوتنێکدا کردەیەك هەیە. تۆ کە دەڵێی ئەوا کچەی خـۆم ناونـا سـیدرا" ئەوا هەر لەگەڵ قسەکەدا کردارێك ئەنجام دەدەی ئەویش بریتییـە لـەناونانی منداڵەکەت(٣٥). لەزمانناسی نوێدا کردەکانی ئاخاوتن ڕووبەرێکی فـراوان داگیردەکەن بە بەشێك لـە بابـەتی پراگمـاتیکس و شـرۆڤەکردنی ئاخـاوتن

Disrourse Analysis دێت. کریستال باوەڕی وایە کە ئەم تیۆرییە شرۆڤەی ڕۆڵی ئاوخاوتن دەکا لە دەربڕینی پێوەندیی ڕەفتاری قسەکەرو گوێگر لە دەمەتەقێیە ناوخۆییەکاندا(٣٦). کەوابێ وەك ئۆستن دەڵێ: ئێمە کە شتێ لە ڕێی زمانەوە دەکەین ئەوا کردەیەکی قسە ڕادەپەڕێنین. فارۆخپی دەڵێ ژمارەی ئەو کردە قسەییانەی کە تاکێك لە ڕۆژێکدا ڕایدەپەڕێنێ دەگاتە هەزارەها(٣٧). ئەمانەی خوارەوەش تەنیا هەندێ لەو کردە قسەییانەن کە ڕۆژانە مرۆڤ لە ژیانی ئاسایی خۆیدا بەکاری دێنێ: پرسیار دەکا، ڕەت دەکاتەوە، ستایشی دەکا، ئامۆژگاری دەکا، دڵنیا دەکاتەوە" دووپات دەکاتەوە" بە وەسف دەکا، دەبووریێ، ڕوون دەکاتەوە، نەفرەتی لێ دەکا، ئاگاداری دەکاتەوە....تەهرانی لەلای خۆیەوە دەنووسێ ئاخاوتن یەکەیەکی ئەرکییە لە پێوەندی کردندا(٣٨). لە تیۆریی کردەی ئاخاوتندا، ئاخاوتنەکان دوو جۆر واتا دەخۆ دەگرن:

یەکەم: واتای گشتی - واتای ڕەسەنی وشەکان Locutionary Meaning

دووەم: واتای شاراوە - واتای کاریگەری دەق لەسەر گوێگر illocutionary meaning(٣٩). واتای یەکەم لە بواری سیمانتیکس دەردەکەوێ هەرچی جۆری دووەمە ئەوا پەیوەست نییە بەواتای یەکە بەیەکەی وشەکانەوە، بەڵکو ڕەوشە کۆمەڵایەتییەکە، یان خودی دەقەکە واتاکە دەبەخشێ ئەمەش تەنیا لە پراگماتیکس ئاشکرا دەبێ.

لەڕستەی: من تینووم

واتای یەکەمی ئاخاوتنەکە لە خودی وشەکاندایە، وشەکانی ئاخاوتنەکە حاڵەتی فیزیکیی قسەکەر پیشان دەدەن هەرچی واتای دووەمە ئەوا

کاریگەریی قسەکەرە کە دەیەوێ ئاخاوتنەکە هەیبێ بەسەر گوێگرەوە. تەهرانی لەو باوەڕەدایە کە کردەکانی ئاخاوتن ئەو ڕستەیەن، یان ئەو ئاخاوتنەن کە هەردوو واتا لەخۆ دەگرن(٤٠). لەلای ئایچسن -یش دەکرێ بگوترێ کە هەموو ئاخاوتنەکان بریتین لە چەند جۆرێکی کرداردا(٤١). هەر ئایچسن دەنووسێ: کە قازی پێت دەڵێ:

ئەوا پێنج ساڵ زیندانیم بۆ بڕییەوە

ئەم ئاخاوتنە هەر تەنیا چەند وشەیەکی یەك لەدوایەك نین، بەلاّم لە هەمان کاتیش هەروەك بڵێی قازی خۆی بەرەو زیندان ڕاتبکێشێ وایە(٤٢). بۆیە دەکرێ بڵێین لە تیۆریی کردە قسەییەکاندا دەفامرێتەوە کە ئاخاوتن و کردار لە زۆر باردا هەمان کاریگەرییان بەسەر گوێگر هەبێ.

## جۆرەکانی کردەکانی ئاخاوتن

ئۆستین و کریستال و ئایچسن و فینچ کردەکانی ئاخاوتن بۆ دوو جۆری سەرەکیی دابەش دەکەن ئەویش کردەی ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ و کردەی ئاخاوتنی ناڕاستەوخۆ.

بەشێوەیەکی گشتی کردەکانی ئاخاوتن چەندین کردە لەخۆ دەگرێ کە قسەکەر دەیەوێ ڕایانپەڕێنێ وەك ڕاگەیاندن، داواکردن، داخوازیکردن، بەڵێندان، پرسیارکردن. ئایچسن دەنووسێ ڕاگەیاندن و پرسیار کردن و داخوازی لە بنەما بنەڕەتییەکانی کردەکانی ئاخاوتنن(٤٣).کردەی ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ، ڕاستەوخۆ پێوەندیی ئاخاوتنەکەو دەقەکە و کردارەکە دەخاتە ڕوو. فینچ ئەم ئاخاوتنانە بە ڕاستەوخۆ دادەنێ:

- کردەی هاوسەری: بڕیارم دا کە ئێوە ئێستا ژن و مێردن.
- کردەی ناونان: ئەم کچەی خۆم ناودەنێم سۆما.
- کردەی داخستنی کۆڕ کۆبوونەوە: ڕادەگەیەنم کە کۆبوونەوەکەمان تەواو (٤٤)ڕاپەڕاندنی ئەم ئاخاوتنانە خۆی لەخۆیدا لەیەك کاتدا ئاخاوتن و کردەکە دەگەیەنێ. ئایچسن ئەم سێ جۆرە ڕستەیە بە کردەی ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ دادەنێ:(٤٥)

- دنیا ساردە
- سەعات چەندە؟
- بڕۆ دەرێ!

چونکە هەرسێکیان ئاخاوتن و کردە بە یەك دەبەستنەوە.لە زمانی ئینگلیزیی بەریتانیدا بە دەگمەن ((داخوازی بەڕێز)) بە کردەی ڕاستەوخۆ تەعبیری لێ دەکرێ. ڕستەی داخوازی: دەرگاکە دابخە ئەوا تەنیا بە منداڵێکی بچووك دەگوترێ(٤٦). لە کوردییش ڕستەی ئەم جۆرە تەنیا بە منداڵ و خۆڵام و بەردەست دەگوترێ. فارۆخپی ڕستەی:

- ئامۆژگاریت دەکەم بچییە لای دکتۆر. بە کردەیەکی ڕاستەوخۆ دادەنێ، چونکە خودی ڕستەکە لە ڕووی لێکسیکییەوە ڕوون و ئاشکرایە و قسەکەرو گوێگر هەردوو ناسراون(٤٧).هەرچی کردەی ئاخاوتنی ناڕاستەوخۆیە زۆربەی زۆری کردەکانی ئاخاوتن پێکدێنێ. لە دیدی فینچ کردەی ناڕاستەوخۆ ئەو جۆرە کردەیەیە کە ئێمە ڕایدەپەڕێنین لەکاتێکدا کردەیەکی ڕاستەوخۆ ئەنجام دەدەین(٤٨). لە زۆربەی کردە ڕاستەوخۆکاندا ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆش لەنێو وشەکانی ئاخاوتنەکە بە گوێرەی ڕەوشە کۆمەڵایەتییەکە، یان دەقەکە

لە ئارادایە.هەریەك لەم ئاخاوتنانەی خوارەوە لە ڕواڵەت کردەیەکی ڕاستەوخۆن، بەڵام هەریەکێکیانیش کردەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبەخشێ:

- تۆ هەمووت خوارد

- پێڵاوەکانت لەکوێن؟

- من لە جێی تۆ بام دەچوومە لای دکتۆر.

ڕستەی یەکەم: ڕستەیەکی ڕاگەیاندنی ڕاستەوخۆیە هەندێ زانیاریی دەبەخشێ، لە هەمان کاتیش ڕستەکە دەکرێ وەك گلەییەك - بێزارییەك بەکاربێ و مەبەستی قسەکەر ئەوە بێ کە گوێگر:

- هیچی بۆ ئەو نەهێشتبێتەوە. بێگومان کە ئەو هەمووی خواردبێ - هیچی بۆ ئەوی تر نەهێشتۆتەوە.

ڕستەی دووەم: ڕستەکە لە ڕواڵەتدا تەعبیر لە پرسیاری باوك - دایك دەکا لە کوڕ، یان کچەکەیان. بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ واتای - پێڵاوەکانت لەپێ کە. دەگەیەنێ. ڕستەی سێیەمیش وەڵام و ئامۆژگارییەکە بۆ گوێگرە کە بۆچی نەچۆتە لای دکتۆر، چونکە بە گوێرەی دەقەکە قسەکەر لەجێی گوێگر بووایە دەچووە لای دکتۆر.ئایچسن دەنووسێ کە کردەی ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، ئەگەر لە زۆر باردا هەمان پێکهاتەی ڕێزمانییان هەبێ، ئەوا لە ڕێگای دەقەوە، یان ڕەوشی کۆمەڵایەتی دەوروبەردکە دەکرێ لەیەك جیا بکرێنەوە(٤٩). لە زۆرکاتدا کردەی ڕاستەوخۆ کاریگەری پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی لەسەر گوێگر هەیە، بۆیە لە زۆر کۆمەڵگادا کردەی ناڕاستەوخۆ زیاتر بەکاردێ.

لەگەڵ ئەوەی تیۆریی کردەکانی ئاخاوتن، ئاخاوتن شی دەکاتەوە و هەندێ ئارێشە چارەسەر دەکات، بەڵام لە هەمان کاتیش ئەم تیۆرییە ناتوانێ هەموو ئارێشەکانی ئاخاوتن چارەسەر بکات. وەك لە بەشی کردەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ئاماژەمان پێ دا لە زۆربـاردا ئاخاوتنێك زیاتر لە واتەیەك دەبەخشێ. ئەو کەموکورتییە لە دەقێکی ڕووتدا هەردەمێنێ. ئەمە و وتنی ئاخاوتنێك بەشێوەی ئاواز ئارێشەیەکی دیبە. هەروەها زۆر چالاکیی نا زمانی وەك بێدەنگی و بزاوتنی چاو و دەمو لێو و جووڵاندنەوەی دەست و سەرو کە لەزۆر باردا دەبنە وەڵام بۆ هەندێ پرسیار، بەڵام ئەم تیۆرییە لەخۆیان ناگرێ(٥٠).

**کورتەی باسەکە**

زمانناسیی نوێ زۆر لق لە خۆ دەگرێ. تا سییەکانی سەدەی بیستەم تەنیا گرنگی بەواتای وشە دەدرا لە ڕستەدا، بەڵام دەرکەوت واتای ڕستە هەموو شتێ لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ چارەسەر ناکات وەك واتای ئاخاوتن. پراگماتیکس ئەو تیۆرییە گرنگ بوو کە توانی چارەسەری هەندێ ئارێشەی ئاخاوتن بکات و دەریخست کە واتای ئاوخاتن لە زۆر باردا هیچ پێوەندیی بە واتای ڕەسەنی وشەکانی ڕستە نییە، بەڵکو دەوروبەر ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە دیارخستنی واتای ئاخاوتنەکە.لە پراگماتیکس چەند ئامرازێك هەن کە هەریەکەیان بە جۆرێك لە ئارێشەکانی ئاخاوتن دەدوێن لەشرۆڤەکردنی ئاخاوتن و کردەی ئاخاوتن دەفامرێتەوە کە پراگماتیکس هەر پەیوەست نییە بە دەقی ڕووتی ئاخاوتن، بەڵکو هەر لە ڕێگای پراگماتیکسەوە لە بەشێکی

تری زمانەوانی بدوێن ئەویش زمانەوانیی کۆمەڵایەتییە. هەروەها لە ڕێگای کردەکانی ئاخاوتن دەکرێ پلەی کۆمەڵایەتی و چینایەتی و ئاستی ڕۆشنبیریی قسەکەر دیاری بکرێ...※

## Prague school

### قوتابخانەی زمانەوانی پراگ

بریتیە لەو قوتابخانە زمانەوانیەی پراگ.ئەو بازنە زمانەوانیە ساڵی ١٩٢٦ لە لایەن ڤیلێم ماسیوس ١٨٨٢-١٩٤٦ دامەزرا.جەختی سەرەکی ئەو بازنەیە بریتی بوو لەوەی زمان وەك سیستەمێکی ئەرکیی یەکە پەیوەستەکان شرۆڤە بکەن، ئێستاشی لەگەڵ دابێ ئایدیەکانی پراگ لە لایەن زمانەوانانی چیکی پراکتیزە دەکرێ.ئەو قوتابخانەیە لە ژێر کاریگەری هزرەکانی سۆسێر دابوو.

## Predicate

### گوزارە

بریتیە لە بەشی سەرەکی سترەکچەری ڕستە ، بریتیە لە پەیوەندی سەرەکی لەگەڵ بەشی نیهادی ڕستە.

## Prelinguistics

### پێش-زمانەوانیی

ئەو وشەیە لە سێ ڕوانگەوە شرۆڤەی بۆ کراوە:

یەکەم ، قۆناغی پێش دەرکەوتنی کتێبی سۆسێر کە ناسرابوو بە فیلۆلۆژی و فیلۆلۆژی بەراورد ،

دووەم ،بریتیە لە وەسفکردنی قۆناغەکانی گریمانەیی ئافراندنی ناخاوتن کە پێش ئەو قۆناغانە دەکەوێت کە پەیوەستن بە ڕێکخستنی ستەکچەریی زمان.

سێیەم ، لە پرۆسەی زمان وەرگرتندا بریتیە لە وەسفکردنی ئەو ماوەیەی ڕاستەوخۆ پێش دەرکەوتنی پاتەرنی زمانەوانیە لە دەنگی منداڵ بەرەو کۆتایی ساڵی یەکەم.

## Primitive

### بەرایی –سەرەتایی

یەکێ لە واتاکانی بەرایی بریتیە لەو یەکانەی دارێژێراوی هەڵناگرن ، بەڵام وشەی دی لەو وشانە دروستدەکرێن وەك وشەی بەرایی مان و فیش،بەڵام وشەی وەك فیشی و مانلینس وشەی دارێژڕاون.لە لایەکی دی ،بەراییبوون بە سادەبوون شرۆڤە دەکرێت وەك زمانی مرۆڤی بەرایی ...لە ڕوانگەی بونیادگەریەوە هەموو زمانەکان وەك یەك لە فۆنیم و مۆرفیم و وشە دروستبوون ، کەواتە بەراییبوون جۆرێکە لە بە کەمدیتنی مرۆی بەرایی.

## Productivity

### بەبەرهەمیی

بریتیە لە توانای بەکارهێنەری زمان لە ئافراندن و تێگەیشتنی ژمارەیەکی بێکۆتا لە وشەی نوێی زمان.ئەو ئەدگارە تایبەتە بە زمانی

مرۆڤ.ئەو ئەدگارە وشەی نویّ بە پیّوەریّکی ڕێپیّدراوی سترەکچەری زمانی دەبیّت.هەروەها وشە نوێیەکان کەس پیّشتر نەیوتون وە کەس گویّ بیستی نەبوون.

## Pronoun

## ڕاناو-جیّناو

ڕاناو ڕووی دووەمی ناوە و گوزارشت لە دووبارەنەکردنەوەی هەمان ناو دەکات .ڕاناو بەشیّکی ئاخاوتن و شیّوە نەگۆڕن جگە لە پاشگری کۆ هەروەها هەڵگری ژمارە و سیّکس و کۆ و تاك و حاڵەتی دۆخی وشەبن لە ڕستەدا:

ئازاد :ئەو ، نیّر ، بکەر و بەرکار

نەسرین:ئەو ،میّ ، بکەر و بەرکار

## Prose poem

## پەخشانە شیعر

دەقی پەخشانە شیعر هەردوو ئەدگاری پەخشان و شیعری لە خۆوە گرتووە.سترەکچەری پەخشانە شیعرلە لایەك دەلالەت لە نەفسکورتی هۆزانڤان دەگەیەنیّت و لە لایەکی دی تەئویل جیهانبینی هۆزانڤان لە وشە دەگەیەنیّت سنوورەکانی یاسای شیعریی ڕێگرە لە دەربڕینی و ویستی شاعیر.بۆیە یەکەیەکی ئەدەبی دی بەدیلی شیعر دەبیّ و ئەو بەدیلەش پەخشانە شیعرە کە خۆی لە شکاندن و بەزاندنی یاساکانی شیعر دەگەیەنیّت.

## Proverb
## پەند

پەند بریتیە لە وتەیەکی کورتی ریزمیکی و کرۆکدار و مەغزادار ئەو وتەیە باوەڕ و ڕاستی دەردەبڕێت.

## Psycholinguistics
## زمانەوانی دەروونی

سایکۆزمانەوانی لقێکە لە زمانەوانی کە دیراسەی پەیوەنـدی دوو قـوڵی نێوان ڕەفتاری زمانەوانی و پرۆسەی و بـەهرەی هۆشـەکی بـۆ جـەختکردن و دیارکردنی ئەو ڕەفتارە.کاتێ جەخت لە سەر بەکارهێنانی زمان وەك هۆکارێك بۆ رۆشنکردنەوەی تیۆر و پرۆسەی سایکۆلۆجی لەو کاتـە زاراوەی زمانـەوانی سایکۆلۆجی بەکاردێت.

لە لایەکی دی زمانەوانی دەروونی یان سایکۆلۆجی بریتیە لە توێژینەوەی زمان لە ڕوانگـەی سـایکۆلیجیەوە.لە شەسـتەکانەوە بـواری زمانـەوانی دوو بواری لاوەکی سایکۆلۆجی خراونەتە ناو ئەو بوارەوە:یەك توێژینـەوەی بـواریی یان ئەزموونی لە پەرەسەندنی زبانەوە لای منداڵدوو، ئەو لێکۆڵینـەوەی لـە خیلالی ئەزموونەکانی میکانیزمی سایکۆلۆجی بۆ ئافرانـدن و تێگەیشـتنی ئاخاوتن.

# Pun

## وشەبازی

وشەبازی زیاتر لە دەقی بوونی هەیە.وشەبازی یاریکردنە بە واتای جیاوازی وشە هەروەها بریتیە لە نزیککردنەوەی دوو وشەی وەك ، بەلاّم ئەو دوو وشەیە واتا جیاوازن.

# Punctuation

## خالّبەندی

خالّبەندی دەق دەق پتەو دەکات.هەبوونی نوختە و وێرگول..واتای دەقەکە دەگۆڕێت.

# Pure language
## -زمانی پەتی

### پەتیەتی لە زماندا و دووری لە شارستانیەت
### بە وەلەدبوونی زمانی شارستانیەت

مەسەلەی " پەتییەتی لە زماندا " لە باشووری کوردستان زۆر قسەی لە سەر دەکرێ. بۆچی باشووری کوردستمان کردۆتە نموونە؟؟ باشووری کوردستان جارێکی تر لە لایەن دەسەلاتی کوردەوە دووچاری سایکس_بیکۆیەکی کوردی بۆتەوە ، نەوەك دوو دەڤەری لە یەك جیایان بۆ خۆیان پاوان کردووە ، بەلکو ناوێکی تریان بۆ باشووری کوردستان داتاشیووە بە ناوی " هەرێمی کوردستان " کە لە بنەڕەتدا لە ئۆتۆنۆمیەکەی مستەفا بارزانی زیاتر نییە ، بە واتای ئەوەی لە ١٩٧٥ مەلا مستەفا پێی ڕازی نەبوو ، دەسەلاتی کوردی لە ٢٠٠٣ بەو حوکمیزاتیە بە ناوی فیدرالی ڕازی بووە.هەموو حیزبەکانی کوردی لە قۆناغی "ڕزگاری نیشتمانی " دەرباز بوونە و ئێستا لە قۆناغی " حکومەتکاری " دەژین ، بۆیە لەو قۆناغە خەریکی بیناکردنی کەسێتی کوردین. زمانی کوردی یەکێ لەو شتانەیە دەبێ زۆر ئیشی لە سەر بکرێ ، خاوێنکردنەوەی زمانی کوردی لە وشەی عەرەبی یەکێك لە ستراتیژیەتی دووری دەسەلاتی ناسیۆلیزمی کوردیە!

جارێ با ئاماژەیەك بە دیاردەی پەتییەتی لە زماندا بکەین. خاوێنکردنەوە و پاککردنەوەی زمان لە وشەی زمانی بێگانە تەواو واتای ناوبراو ناگەیەنێت

، بەلکو داتاشینی وشەی نویّ بۆ دیاردەیەک.دیاردەی داتاشینی وشەی نویّ سەرەپای میدیای باشووری لە کۆن و نویّ گرتۆتەوە.

هیچ زمانیّك لە سەر گۆی زەوی نییە ، وشەکانی زمانەکەی تەنها وشەی رەسەنی خۆی بن! هەر زمانیّك بۆ هەموو بواریّك :فەلسەفە ، یاساناسی ، کیمیا ، ئاین...هتد وشەی هەبیّت! پەتیەتی لە زماندا نییە یان دیاردەیەکە ناسیۆنالیزمی دەیەویّت بیسەپیّنیّت. وشە وەرگرتن عەیبە نییە ،شورەیی نییە! هیچ زمانیّك نییە لە هەموو بواریّك وشەی خۆی هەبیّت.ئەم پرۆسەیە پەیوەندی بە گۆڕانی زمانەوە وە نییە ، بەلکو ئەو دیاردەیە —نەبوونی وشە بۆ هەموو بواریّك-دیاردەیەکی سروشتی زمانە.نە زمانی ئینگلیزی هەموو وشەکانی بواری فەلسەفە و یاسا و بایۆلۆجی ئینگلیزین وە نە زمانی عەرەبی دەتوانیّ دیاردەیەکی نەبووی نیّوخۆی بە زمانی عەرەبی لە کەسی بەرامبەر بگەیەنیّت! پرۆفیسۆری جووتستاندەر زۆر رەخنە لە ناسیۆنالیستی کوردی دەگریّت بەوەی لە میّژووی نویّی خۆیدا زۆر گرنگی بە دیاردەی پەتی یەتی زمانی کوردی داوە. ئیّمەش چۆن باوەڕمان بە تاکستاندەری زمانی کوردی هەیە بە هەمان شیّوە باوەڕمان بە هەولّ و پیّکۆلی ناسیۆنالیستی کوردی نییە! زمانی کوردی بەوە دەبیّتە زمانیّکی سەرانسەری ، کە لە زمان و شارستانیەکان نزیك ببیّتەوە. زمانیّکی وەك ئینگلیزی بە یاریدەی زمان و شارستانی ترەوە بۆتە ئەو زمانە!

هەر زمانیّك دەربڕی شارستانیەکە هەروەها هەر شارستانیەك وشەی خۆی هەیە لەوانەیە لە زمانی بەرامبەر بوونی نەبیّت.وشەی " فیرعەون " کە لە شارستانی مسریە دیّرینەکان هەبووە و پەیدابووە لە زۆربەی زمانەکان رەگی

میسریەکەی کەم و زۆر هەر پاراستووە!یان وشەی وەك ماڵپەڕ ، ڕووماڵ ، ئینتەرنێت..وشەی ئەم شارستانیە نوێیەن.هەندێ لەو وشانە کە بەرامبەرەکەی لە کوردی هەیە ، ئەوانی تر بە سپێلی خۆیان بە ناچاری دێنە ناو زمانی کوردی!

کەواتە هەندێ وشە بە پرس و بە بێپرس دێنە ناو زمانەکەتەوە و هەندێ وشە تەرجومە ناکرێن -وەرناگێردرێن وەك لیلە القدر ، ژکاە ،رمچان ، جا با لە هەموو زمانەکان وشە وەرگرین تاکو زمانی شارستانی دروستبکەین وەك زمانی ئینگلیزی کە لە سەرەتا زمانی چەند عەشیرەتێك بوو ،ئێستا بە هۆی زمانەکانی ترەوە ملیۆن وشەی هەیە!

# پیتی Q

## Qatar

### قەتەر

ولاَتێکی دانیشتوان کەمە، بەلاَم کاریگەری سیاسی فرەیە.دانیشتوانی قەتەر لە ملیۆنەك زیاترە ، لە سەدا شەستی بە عەرەبی دەدوێن ، لە سەدا بیست و پێنجی بە فارسی یان ئوردو قسەدەکەن . زمانی ئینگلیزی لە نێوەندە نێودەوڵەتیەکان بەکاردێت.

## Quantitative linguistics

### زمانەوانی بڕی

لکێکە لە زمانەوانی گشتی ، دیراسەی دیاردەی چەندجاری و دابەشکردنی یەکە زمانەوانیەکانە بە بەکارهێنانی تەکنیکە ستاتیستیەکانە.

## Quantitative method

### میتۆدی بڕ

ئەو میتۆدە کار لە سەر داتەکانی بەردەست دەکات بە تەکنیکی ستاتیستیکی، نەك وەسفی .

## Q-principle

### پرانسیپی کوانتیتی

بریتیە لە پرانسیپێکی پراگماتیکی نیۆ-گریسیەن کە تێیدا چاوەڕێ دەکرێ ئاخێوەران چەندی دەکرێ زانیاری ببەخشن.هەموو ئەوانی تر یەکسانن .ئەو پرینسیپە ناسراوە بە کیو-پرانسیپ.

## Quantifier

### بڕ—–چەند

بریتیە لە هەر وشەیەك و دەستەواژەیەك پەیوەست یان دیارنەکراوی نیشانەی بڕ وەك زۆر ، کەم .

## Quirk

### سێر چارلز ڕاندۆلف کوێرك

کوێرك ڕێزمانووسێکی بەریتانیایە هەروەها نووسەرێکی ناودار و ناسراوە لەمەڕ دیراسات لە سەر زمان و ڕێزمانی ئینگلیزی. نووسینەکانی لە شەستەکانی سەدەی بیست شوێن پەنجە و ئاسەواری لە سەر زمانی ئینگلیزی هەیە. لەگەڵ گرین بۆم لە کەسە ناودارەکانن لە جیهان . لە ساڵی ١٩٨٥ گەورە ڕێزمانی ئینگلیزی بلاَوکردەوە .ئەو ڕێزمانە هێندە شامیل و فرە لایەنە هەروەها چۆن کاهینەکان ڕێزمانی سانسکریتیان بە پیرۆز تەماشادەکرد ، ئێستاش هەندێك ڕێزمانووس کتێبە قەبەکەی کوێرك بە ئینجیلی ڕێزمانی ناودەبەن.

# Quotation marks

## ئاماژەی وەرگیراو

بوونی دوو کۆما لە ناوەڕاستی دەقدا، دەقی نووسەر لە دەقی ڕاستەوخۆ وەرگیراو جیادەکاتەوە.ئەو دوو کۆما هەڵگەڕاوەیە ئاماژەیە کە دەقی نێوان دوو کۆما هەڵگەڕاوەکە ڕاستەوخۆ لە ژێدەر وەرگیراوە.

# پیتی R

## Rajasthani

### ڕاجاستانی

بریتیە لە چەندەها شێوەی جیاوازی گروپە زمانی میدلاندی هیندۆ ئاریانی کە لە لای هەندێك کەسەوە بە زمانی سەربەخۆ و جیا دادەنرێن .ئەو زمانانە نزیکەی ٣٠ ملیۆن ئاخێویان لە هندستان و پاکستان هەیە.

## Rapid reading or speed reading

### خوێندنەوەی خێرا

ئەوە تەکنیکێکە لە بواری خوێندنەوە و وتنەوە هەیە .ئەو تەکنیکە قوتابی ڕادەهێنێت کە بلەز بخوێنێتەوە کاتێك مژۆڵی تێگەیشتن وە بیر خۆی دەهێنێتەوە.

## Rate of speech

### ڕێژەی ئاخاوتن

بریتیە لەو خێراییەی ئاخێو کاتێك دەقێك دەخوێنێتەوە .ئەو خوێندنەوە بە ژمارەی بڕگەکانی وشەیەك لە خولێکێکدا دەپیورێ.

## Readability

### شیانی خوێندنەوە

بریتیە لەو ئاسوودەیی و ڕەحەتی دەروونیەی دەقێکی نووسراو کە مرۆ بەدەستی دەهێنێت لە کاتی خوێندنەوە بە تێگەیشتنەوە.

## Reduplication

### دووبارەیی

بریتیە لە چەندەها جۆری دووبارەیی لە پێکهاتەی وشەیەکدا ، ئەو دووبارەییە ئاماژە بەو ڕێیانە دەکات کە پێشگر و پاشگری وشەکە لە چەند ئەدگارێکی فۆنۆلۆژی رەگەکە ڕەنگدەداتەوە. دووبارەیی بریتیە لە دووبارەی پێشگر و پاشگرەکانی رەگەکە.

## Refrence

### سەرچاوە —چاووگ

بریتیە لەو پەیوەندیەی لە نێوان دەستەواژەیەکی زمانەوانی و ئەو شتەی یا بوونەی لە جیهانی دەرەوەدا ئاماژەی پێدەکات، بۆ نموونە چاووگی وشەی مێز بریتیە لە شتی مێز کەواتە ژێدەر-چاووگ بیرۆکەیەکی لە سەروو زمانەوانیە کە هەندێ لایەنەکانی جیهان دەرێکی بەشەکی یاری تێدا دەکەن.

## Refrential language

## زمانی سەرچاوەیی

ئەو زمانەیە کە ئەرکی بنەڕەتی بریتیە لە ئالوگۆڕ و گواستنەوەی هزر و فاکت و ڕا و بیرۆکەی دی جۆری رۆشنبیرییە. ڕیچیستەر

ئەو زاراوەیە لە دوو بوار قسەی لە سەر دەکرێت:

یەکەم ، لە فونێتیکسدا

لەو بەشەدا بریتیە لە کوالیتی دەنگییەی بە هۆی پێکهێنەری فسیۆلۆژی قورگ دروستدەبێت هەروەها دەنگی لەرزۆك یەکێ لەو دەنگانەیە.

دووەم لە شێوازگەری و کۆزمانەوانیدا

لەو دوو بەشەدا ڕیچیستەر شێوەیەکی زمانە، کە بە پێی بەکارهێنانی لە ڕەوشی کۆمەلآیەتیدا پێناسەدەکرێت وەك تۆمارکردنی زانستی وە تۆمارکردنی فۆرمالی.

## Relational grammar

## ڕێزمانی پەیوەندی

مۆدێلێکە لە ڕێزمان کە وەك بیرۆکەیەکی ناوەندی پەیوەندی ڕێزمانی وەردەگرێت وەك بکەر و بەرکار.

## Repertoire

## ڕیپێرتوا

بریتیە لە زنجیرەی زمانەکان یان شێوەی زمان کە هەن و حازرن بۆ بەکارهێنانی کەسی .هەر یەکەیان وا لە مرۆ دەکەن کە رۆڵێکی کۆمەلآیەتی

تایبەت ڕاپەڕێنێت هەروەها زاراوەکە بریتیە لە زنجیرە ی یان پلەی شێوەی زمانەوانی لە ناو کۆمەڵگەی ئاخاوتن.

## Research
## لێکۆڵینەوە-توێژینەوە

لێکۆڵینەوە یان نزیکبوونەوە لە بابەتێك بە پێوەری ئەکادیمی کرۆکی لێکۆڵینەوەکاریە . لێکۆڵینەوە بە سێ جۆر هەیە وەك :

یەکەم ، لێکۆڵینەوەی بابەت یان ڕێبازی لێکۆڵینەوە

لەو شێوەیەدا باس لە پرانسیپەکانی ڕێبازی لێکۆڵینەوە دەکرێت هەروەها پێیدەگوترێ سیستەمی سەرچاوەگێڕی وەك سیستەمی هارڤارد یا سیستەمی شیکاگۆ.

دووەم ، میتۆد یا مۆدێل

نزیکبوونە لە بابەت بە پێوەری ئەکادیمی دەبێت وەك بونیادگەری ، هەڵوەشاندنەوە.

سێیەم ، پرۆسیجەری بابەت

لەو بەشەدا قسە لە سەر ئۆرگانیەتی بابەتەکە و پاش و پێشکردنی چاپتەرەکان دەدوێت.

## Reported speech

### ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ

ئەو ئاخاوتنە دوورە لە وەسفکردنی ڕێزمانی کەواتە لە بەکارهێنانی ئاخاوتنی کردەیی بەبێ وەسفکردنی ڕێزمانی ئاخاوتنەکە وەك بەشێك لە گێڕانەوەیە.

## Rhetoric

### ڕەوانبێژی

بریتیە لە دیراسەکردنی لایەنی کاریگەر و قەناعەت پێهێنانی ئاخاوتن و نووسین لە وتاری گشتیدا.

## rhyme

### قافیە

بریتیە لە دەنگی کۆتایی هێڵ .قافیە زیاتر لە شیعردا هەیە بە تایبەتی شیعری کلاسیکی .

## rhythm

### ڕەزم-کێش

کێش وەك قافیە ئەدگارێکی شیعرەزمانەکان لە جۆری ڕەزمی سەرەکی دەگۆردرێن و دەناسرێنەوە .بە برگەی سترێسدار و بێسترێس سکانی شیعر دەردەبرن.

## Roman alphabet

### ئەلفبێی ڕۆمانی

سیستەمێکی ئەبجەدیە لە ڕۆمای کۆنی لاتینی هاتووە.زۆربەی زمانە هیندوئەوروپیەکان سیستەمی ڕۆمانی بەکاردێنن .ئەو سیستەمە بە ئەلفبای لاتینی ناسراون.

## Romance

### ڕۆمانس

گروپە زمانێکن لە خێزانە زمانی هیندۆئەوروپی، ئەو گروپە لە شێوەی ئاخاوتنی لاتینی هاتوون کاتی خۆی لە سەراپای ئەمپراتۆری رۆمانی بەکارهاتوون.

## Root

### ڕەگ

شێوەی بەیسی وشەیە کە ناتوانرێت بە بێ ونکردنی شوناسی وشەکە شرۆڤە بکرێت. ڕەگ ئەو وشەیەیە کە پێشگر و پاشگری پێوەنییە.ڕەگ لەوانەیە مۆرفیمی سەربەخۆ بێ یا مۆرفیمی بەند.

## Russia

### ڕووسی

لە ڕووسیا زمانی ڕووسی ٨٠٪ دانیشتوان پێکدێنێ.لە سەردەمی کۆمۆنیستی زمانی ڕووسی و ئەلفبای سلاڤی چەتری شیوعیەت بوو.لە

کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت و ڕووسیای قەیسەری زمانی دی وەك تورکمانی ،ئەرمەنی ، ئازەری و یۆنانی ... هەتا زمانی کوردیش هەبوو.

## Rwanda

### ڕوەندە

ڕوەندە ناوی وڵات و زمانە لە ٨٠٪ خەڵکی روەندە زمانی ڕوەندی بەکاردێنن. زمانی فەرەنسی وەك زمانێکی پەیوەندی ئەنتەرناسیۆنال بەکاردێت.

# پیتی S

## Saharan
## سەحران

سەحران گروپێکی بچووکی گروپە زمانی نیلۆ-سەحرانە لە چاد و ولاّتانی دەوروبەری وەك نیجریا ، نێجەر ، لیبیا ، سودان قسەی پێدەکرێت.

## Salish
## سالّیش

ئەو بیست زمانەی ئەمریکی -هیندیە کە پەیوەندیان بە گروپە زمانەکانی ئەمریکای باکوور ساغنەبۆتەوە . ئەو زمانانە لە ئەمریکا و کەنەدا و زەریای هێمن قسەیان پێدەکرێت.

## Sanskrit
## سانسکریت

ئەندامێکە لە گروپە زمانی هیندۆ-ئاریانە. زمانی کلاسیکی هیندۆسەکانی هیند بووە. هیندۆسەکانی هیند ئەوەندە بە پیرۆزی تەماشای زمانی سانسکریتیان دەکرد هەتا نەیاندەهێشت هیچ گۆڕانکاری لە زمانەکە بکرێت. لە سەدەی حەڤدە هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدە فیلۆلۆجیستەکان دیراسەیان لە سەر پێکچوون و جیاوازی زمانەکان دەکرد ، بۆیان خۆیا بوو کە زمانی سانسکریتی دایکە زمانی هیندۆ-ئەوروپیە.

## Sapir , Edward 1884-1939
## ئیدوارد ساپیر

ساپیر زمانەوانێکی ئەمریکی بوو ، کە بیرکردنەوەکانی کاریگەری فۆرمەتیڤی هەبوو لە سەر پەرەسەندنی زمانەوانی لە ئەمریکا. ساپیر وەك بلۆمفیلد بە هۆی کتێبەکەی کە ناوی زمان بوو ، ناسرا.ساپیر بە زمانەوانی بەر لە چۆمسکی ناسراوە.

## Sapir-whorf hypothesis
## گریمانی ساپیر و ۆرف

گریمانەکە قسە لە سەر پەیوەندی نێوان زمان و هزر دەکات|. سەرەتا بیرۆکەکە هی ساپیر بوو ، بەلاّم لەگەلّ قوتابی خۆی بنیامین لی ۆرف ١٨٩٧-١٩٤١ پەرەی پێدراو بە گریمانی هەردووکیان ناسراوە. هەردووك دەلّێن کە زمان کاریگەری هەیە لەو ڕێگەیەی بیر دەکەینەوە هەروەها گریمانی ئەوە دەکەن کە جیاوازیانەی لە زمانێکدا بالاّ دەستن لە زمانی دی هەبن.گریمانی ۆرف و ساپیر جەخت لە سەر پێکهاتەی واتایی ئەو زمانەیە کە ئاخێو قسەی پێدەکا بۆ ئەوەی بریار لە سەر سنووری ئەو ڕێگایە بدەن کە تێیدا دەتوانن فۆڕمی ئەو تێگەیشتنەی جیهان بکەن کە تێیدەژین.هەروەها ئەو گریمانە پێیدەوترێت پەیوەندی زمانەوانی یان بڕیاردەری زمانەوانی .مێژووی ئەمە و ئەو پەیوەندیە ئایدیایە زۆر لەمە درێژترە و درێژدەبێتەوە بۆ هومبۆلدت و لایەنگرانی لە سەدەی هەژدەهەم.

## Saudi Arabia

### سعودیا

پازدە تا شازدە ملیۆن دەبن ، زۆربەی هەرە زۆری بە عەرەبی دەدوێن . زمانی ڕەسمی عەرەبیە هەرچی زمانی ئینگلیزیە لە مەبەستە نێودەوڵەتیەکان بەکاردێت . دوو شوێنی پیرۆز –مەکە و مەدینە- لە سعودیا هەن .

## Saussure , Ferdinand de

### فێردیناند دی سۆسێر ١٨٥٧-١٩١٣

سۆسیر ڕوەتی زمانناسی گۆڕی.پیشتر ئەوەی هەبوو بریتی بوو لە فیلۆلۆژی بەراوردی نیوان زمانەکان .کاری ئەو فیلۆلۆژیانە لە سەر دەرەوەی زمان بوو.بەلام سۆسیر کاری لە سەر خودی زمان کرد ، ئەو وتی زمان سیستەمیکی وردی هەیە ، هەروەها بەراوردیکی لە نیوان زمان و دەرەوەی زمان کرد .زمان یەکەیەکە هەموو ڕەگەزەکانی لەگەل یەك لە پەیوەندی دان وەك ڕەگەزەکانی یاری شەترەنج : بە جۆریك جوولەی هەر یاریکەریك ، سەرباز ، قەلا ، شا...، کار لەوی تر دەکات . گۆڕەپانی شەترەنجەکە زیر-ئالتوون یا دار بیت هیچ لە جوولەی یاریکەرەکان ناکات.

لە لایەکی تر سۆسیر چەند دووەکی پیچەوانەی لە نیو زماندا داهینا ، پاش سەدەیەك لە مەرگی خۆی ئامادەکیان لە بواری زمان هەیە.

ئەوەی سۆسێر لە کتێبی کۆرسێك لە زمانەوەی گشتی لە ١٩١٦ پاش سێ ساڵ لە مەرگی خۆی دەڵێت بریتیە لەو تێبینیانەی سۆسێر کە لە لایەن دوو لە قوتابیانی خۆی کۆکراونراونەتەوە.

## Scale and category grammar
### پێوەر و ڕێزمانی کاتیگۆری

بریتیە لە ڕێزمانی سیستەمی ، بۆیەش پێیدەگوترێ پێوەر چونکە پێوەرە بۆ لەدوایەکهاتنی پایەکان تا سیستەمەکان بە گەڕ بکەون وەك مۆرفیم و وشە و گرێ.....

## Scandinavian
### سکەندیناڤی

زمانی باکووری گێرمەنییە هەروەها زمانەکانی فینی —ئوگریك و سامی (نەرویج ) پێکدەهێنێت . زمانی سکەندیڤانی هەڵگری دیاردەی سەیرن ، وەك زارەکان تێگەیشتن لە نێوان زمانی سویدی و نەرویجی و دانیمارکیدا هەیە ، هەرسێکیش زمانی سەربەخۆن.

## Schleicher ,August
### ئۆگست شلێخەر

شلێخەر ١٨٢١-١٨٦٨ فیلۆلیستێکی هیندۆئەورووپیە هەروەها یەکێکە لەوانەی تیۆری بۆ زمان داناوەشلێخەر رۆڵێکی سەرەکی هەبووە لە دەیەی پێش ڕێزمانووسانی گەنج لە دیارخستنی لایەنەکانی میتۆدی فیلۆلۆژی بەراورد.

## Schuchardt , Hugo

### هوگۆ شوخارد ١٨٤٢-١٩٢٧

لە بنەچەدا هۆگۆ زمانەوانێکی ڕۆمانسە نووسینەکەی بە زمانی باسك و زمانی دی بلاوکردەوە.هۆگۆ لە نەیارە سەرسەختەکانی ڕێزمانووسی گەنج و سۆسێر بوو.لە ڕەخنەکانیدا زۆر زەختی لە سەر ئاخاوتنی تاك و بەردەوامی نووسین دەکرد بەتایبەتی ئەو ڕایانەی قسە لە سەر جیاوازی زمان و دایەلێکت دەکەن.

## Second language

### زمانی دووەم

زمانی دووەم لە کۆمەڵگەی زمانەوانی چەند زمانی بوونی . لە باشووری کوردستاندا زمانی عەرەبی زمانی ڕەسمی دووەمە هەروەها ئەو جۆرە زمانە لە ڕێگای قوتابخانە و ( کۆمەڵگا ) تاکی کورد بە دەستیدەهێنێت.

## Semantic feature

### ئەدگاری واتایی

ئەدگاری واتایی بریتیە لەو ئەدگارەی واتای وشە لە ئەدگاری وشەی تر جیادەکاتەوە .هەندێ تایبەتمەندی واتایی وەك نێر+ ، مێ + ، هەراش +، زیندوو+.........لە زماندا هەیە.

## Semantic field theory

## تیۆری بواری واتایی

ئەو تیۆرە قسە لە سەر دیاردە وەك یەكەكانی بوارەكە دەكات.كەواتە بواری واتایی بریتیە لەو بەشەی دیاری لێكسیكۆن .لە كوردیدا بواری واتایی ڕەنگ وشەی وەك ڕەش و سوور دەگرێتەوە كە ڕەنگەكان جیادەكاتەوە یان ئەو دوو ڕەنگە بریتین لە هاییپۆنیمی وشەی باوی ڕەنگ.

## Semantics

## واتاسازی

واتاسازی بریتیە لە واتای وشە.

## Semantic triangle

## سێگۆشەی واتایی

سێگۆشەی واتایی مۆدێلەكە لە واتا . سێ شت لەو پرۆسەیەدا بەشدارن : هێما ، شت ، هزر-چەمك. مۆدێلەكە لە واتادا كە تێیدا هێما و شت بە شێوەیەكی ناراستەوخۆ لە ڕێگای هزرەوە بەیەك پەیوەستن. وشەی ئەسپ لە یەك لاوە لە سێگۆشەكە پەیوەستە بە چەمكی ئەسپ ئەویش لە لای دووەمی لایەكەی سێگۆشەكە پەیوەستە بە گیانەوەرەوە.هێڵە شكاوەكە كە لایەنی سێیەمی سێگۆشەكە پێكدێنێت تەنیا حاڵەتی پەیوەندی دارِژتن لە نێوان گیانەوەر و وشەكە پیشاندەدات.لە بیستەكاندا ریچاردز و ئۆجین ئەو هێڵكاریەیان داهێناوە.

## Semeiology
## سیمیۆلۆی –نیشانەسازی

بریتیە لە سیمیۆتیکس –نیشانەکاری ( بروانە سیمیۆتیکس).

## Semiotics سیمیۆتیکس

بریتیە لە توێژینەوەی هێماکان و بەکارهێنانەکانیان کە جەخت لە سەر میکانیزم و پاترنی پەیوەندیە مرۆییەکان و لەسەر سروشت و وەرگرتنی مەعریفە ، شێوەی دی سیمیۆتیکس ، سیمیۆلۆژیە.

## Sense and sense relation
## سێنس و پەیوەندی سێنسی

سێنس بریتیە لە واتای یەکەیەکی لێکسیکی کە جیاوازە لە واتای فەرهەنگیی.کورسی یەك واتای –سێنسی_هەیە کە ئاماژە وەك بەشێك لە ناومالّ بەکاردێت.واتای دووەم هێمایە بۆ ئەو کەسەی سەرکردایەتی کۆبونەوەیەك دەکات. ئەو دوو واتایە وەك واتایەك بەکاردێن کە جیاوازن لە رێزمان.واتایەکی دی سێنس بریتیە لە شوێنی یەکەیەکی لێکسیکی لە ناو سیستەمی سیمانتیکی زمان کەواتە کورسی وا پێناسە دەکرێ بەو پەیوەندیانەی کە جیای دەکاتەوە لە کەرەستەی ناومالّ.

پەیوەندی سێنسی بریتیە لە هەر پەیوەندیەك لە نێوان یەکە لێکسیەکان لە ناو سیستەمی سیمانتیکی زمان.

# Sentence

## رستە

رستە بریتیە لە مەزنترین یەکەی ڕێزمان هەروەها بە گـوێرەی چۆمسـکی رستە بریتیە لە چەند یاسایەکی بەرهەمهێنەری سنووردار کە ئەوەندە یاسایە ژمارەیەکی بێکۆتا ڕستە پێکدەهێنن.

# Serbo-Croatian

## صربۆکروات

بریتیە لە ئەندامی گروپە زمانی سلاڤی باشوور .ئەو زمانە لە زۆر شـوێن وەك بۆسنا ، کرواتیا ، مەکدۆنیا ، مۆنتینگرۆ ، صـربی ، سلۆڤانیا...قسـەی پێ دەکرێ .ئەو زمانە بووە قوربانی دینی ، ئیسلامی-مەسیحی ، مەزهـەبی کاسۆلیك و ئەرسەدۆکس.زمانەکە بۆتە سێ بەش و سێ ئـەلفبێ:کرواتی کـە لە لایەن کاسۆلیکەکان بەکاردێت و بە ئەلفبێی رۆمانی-لاتـینی دەنووسـرێ هەرچی چربۆیە لە لایەن ئەرسەدۆکسەکان قسەی پێ دەکـرێ و بـە ئـەلفبێی سلاڤی دەنووسرێ هەروەها لە شێوەی بۆسنایی کە لـە لایـەن موسـلمانەکان بەکاردێت ئەلفبای عەرەبی بۆ خوێندنەوەی قورئان بەکار دێت.

# Sexiest language

## زمانی سێکسی

پرسی جێندەر لە زماندا تەواو مەسـەلەیەکی زمانـەوانی نییـە ، بـەڵکو مەسـەلەیەکی ئایدۆلۆژیـە.زمانی سێکسـی وەك مەسـەلەیەکی زمانـەوانی بریتیە لەو زمانەی کـە هەڵوێسـتی ڕەنگدەداتـەوە بەرانبـەر هـەردوو ڕەگـەز

.خـودی مەسـەلەکە بریتیـە لـە لـە لایـەنگری زمانـەوانی کـە دەگـوترێ ئاراستەیەکی نێرئامێزی لە کۆمەڵگا دروستدەکات .باشترین نموونە ، ڕانـاوی ئەو ـه لە ئینگلیزیدا ، کە هەڵگری هەردوو ڕەگەزە ، بەڵام لە بەشی زمـانی مێ ئەوەمان ڕوونکردەوە کە سێکسی بایۆلۆژی هیچ پەیوەنـدی بـە سێکسـی گرامەری وە نییە.

## Shortening or shorthand

## کورتنووسی

دیاردەی کورتدەربرین یان کورتکردنەوە لە هەموو زمانەکان بوونی هەیە.

## کورتنووسی لە زمانی کوردیدا

دەروازە

کورتنووسی دیاردەیەکی شارستانیە .ئەو کورتنووسیە زۆر جیاوازە لە دیاردەی هێماناسی و کرتاندن و لە جیاتیدانان.ئەوەی دەگوترێ کورتنووسی زیاتر بۆ نووسینی نێو ئیدارە دەستدەدات ، نەك دەقێکی ئالۆز .

ئەم نووسینەی ئێمە تەنها ئاماژەیەك بۆ دیاردەی کورتنووسی یاخود نووسینی بە خەت دەکات زیاتر جەخت لە سەر دیاردەی کورتنووسی بە زمانی پیت دەکات .ئەو جۆرە نووسینە قسە لە سەر زۆر دیاردە دەکات وەك:

١. زمانی ئەنتەرنێت
٢. زمانی قسەکردن و تێچوونی ماددی و کاریگەری ماددی لە سەر کۆمپانیا
٣. زمانی دایەلۆگ

لەم نووسینە هەوڵدەدەین کورتنووسین لەو دیاردانە دەربخەین .

## هێما لە بریتی پیت دەربرین

لە سەردەمی نەخوێندەواریدا مرۆڤ ناچار بوو بە هێما نووسین گوزارشت لە پێویستیەکانی خۆی بکات .ئەو وێنانەی لە ئەشکەوتەکان هەن دەلالەت لەو جۆرە خەتە دەکەن .گەلی سۆمەری ، کە وا گومان دەبردرێ یەکێك لە نەتەوەکانی چیاکانی کوردستان بن . سۆمەرییەکان بە دروستکەری نووسین دادەنرێن . جگە لە هێمانووسین ، هێما گووتنیش یەکێك بووە لە سیستەمی لە یەك گەیشتنی ئەوسا . پیت لەو دوو شێوەیە ئامادە نەبوو ، حزووری پیت لە گەڵ دابەزینی کتێبە ئاسمانیەکانی وەك زبوور و صحف و تەورات و ئینجیل و قورئان پەیدا بوو ، بەرە بەرە مرۆڤ ڕووی کردە نووسین بە پیت .

لە نێو ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا دیاردەیەك هەیە ، بەوەی بە پێچەوانەی بابەتەکەوە پیت ، ژمارەی لە ناخەوە هەڵگرتووە ، ئەو دیاردەش بە زۆری مێژووی مردنی یان لە دایکبوونی کەسێك یان ڕوداوێك دەردەخات.

ئەوانەی لاڵن —ناتوانن قسە بکەن — زمانی هێما بە کاردەهێنن . زمانی هێما لە لای ئەوان سنووری نەتەوە دەبەزێنێت . هەرچەندە زمانی هێما لای کەلتوری هەموو نەتەوەکان دەقا و دەق وەك یەك نییە ، بەڵام لینگوافراکایەك لە نێوانیان هەیە.

کەواتە زمانی هێما مێژووی بە قەد هەبوونی مرۆڤە لە سەر زەوی ، چونکە لاڵی دیاردەیەکی جیهانییە .لە لایەکی تر زمانی هێما چ لە نووسین و چ لە ئاخافتن زمانی کەسانێکە دوورن لە زمانی پیت . لە هەندێ وڵاتی باشووری ئاسیا وەك چین و ژاپۆن و هەردوو کۆریا ...کار لە سەر زمانی هێما یان وێنە دەکەن . زمانیان هیچ کورتنووسی وەك دیاردە تێدا نییە !

## نووسینەوەی کۆنووس بە زمانی خەت

هەندێ باوەڕیان وایە کە دەکرێ کۆنووس بە زمانی خەت لە بریتی زمانی پیت دەرببڕێت بەوەش کورتنووسی مەیسەر دەبێت .دەقێکی وەك ڕۆمان ، شانۆگەریی ، شیعر بە زمانی خەت-هێڵ گوزارشتی لێناکرێت .ئەو کورتنووسینە تەنیا لە ئیشە ئیداریەکان –کارگێڕیەکاندا سوودی دەبێت . بەڵام ناکرێ ببێتە زمانی دەقێکی ئاڵۆز .

## قورئان و زمانی خەت

قورئان بە زمانی پیت لە لای خوداوە هاتووە و هەر بەو زمانەش نووسراوەتەوە . ناوی قورئان هەر خۆی لە " خوێندنەوە " ی کوردی دێت . گوتاری قورئان ئەوهایە ، کە تاکەکانی کۆمەڵگا لە نەخوێندەوار بکاتە کۆمەڵگایەکی خوێندەوار .شیکردنەوە و تەفسیری قورئان بە زمانی خەت هەڵاتنە لە گوتاری قورئان ، کە بریتیە لە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی ئیمانی و خوێندەوار.

## کورتنووسی کوردی

ئەو کورتنووسیەی ئێمە مەبەستمانە ، زمانی ئاخاوتنە بە پیت .ئەو جۆرە ئاخاوتنـــە نــە هەڤــدژە لەگـەڵ گوتــاری قورئــانی نــە بانگەشــەکردنە بــۆ نەخوێندەواری ، چونکە زمانی خەت پەیوەنــدی بــە چــەمکی خوێندەواریــەوە نییە .کورتنووسی بە پیت دیاردەیــەکی زمانــەوانی هاوچــەرخە .بێجگــە لــە پەیوەندی بە زمانەوە ، پەیوەندی بە ڕێژەی دارایی تــاك و کۆمپانیــاوە هەیــە. دەکرێ لەم حاڵەتانەدا ببینرێن:

**ئەنتەرنێت**

زمانی ئینگلیزی لەو زمانانەیە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ئەنتەرنێت بەکاردێت . بۆ نموونە لە بریتی :How are you? دەکرێ بنووسین hau?: یان لە بریتی .....age , person single , male تەنیا پیتی یەکەم لە وشەکان بەکار بێن وەك a,p,s,m.

لە زمانی کوردیدا دەکرێ زمانی کوردی وەك زمانی ئینگلیزی ، پیتەکانی زمانی کوردی لە زمانی ئەنتەرنێتی بەکار بێت . ئەو جۆرە زمانەش لە زمانی چات یاخود ئاخاوتنی چات بە کار بێت و کاتێکی زۆر بۆ ئاخێوەر یان چاتکەر بگەڕێنێتەوە .

گەڕانەوەی پیت و کات دوو دیاردەی مرۆڤی سەردەمن .

ئەو زمانەش کێماسی هەیە بەوەی زیاتر بۆ چاتکردن دەستدەدات نەك نووسینەوەی دەقێکی ئاڵۆز .

**زمانی کۆمپانیا**

کۆمپانیا بە واتای بە دەستهێنانی پارە . کۆمپانیا بۆ پارە پەیداکردن دروست دەکرێت .ئەم ئاخاوتنەی کۆمپانیاکان بەکاریدەهێنن دیاردەی کرتاندن = Ellipsis یان لە بریتی دانان- Substitution نییە .بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر هەردوو دیاردە دەرك پێ بکات ، ئەوا بە نموونە هەردووك ڕووندەکەینەوە :

-ئەو زمانی فەرەنسی دەزانێ .

-ئەو زمانی ئینگلیزی دەزانێ.

کە ئەو دوو ڕستەیە لە یەك دەدەین هەتا ڕستەیەکی لێکدراو دروستبکەین ، بکەر و کرداری دووەم ، چونکە وەك هی یەکەمن ئەوا هەردووکیان-بکەر و کرداری ڕستەی دووەم — ڕەشدەکەینەوە:

ئەو فەرەنسی (دەزانێ )و (ئەو ) ئینگلیزی دەزانێ .

ئەگەر ئاوەڵکردار و ئاوەڵناو لە هەردوو ڕستە وەك یەك بن ، ئەوا ئەوەی دووەم ڕستە ژێ دەبەین.

دەبینین لەو دیاردە زمانەوانیە هیچ وشەیەك بۆ وشە ڕەشکراوەکە دانانێین ، بەڵام لە حاڵەتی "لەبریتی دانان "دا ، وشەیەك لەبریتی وشە ڕەشکراوەکە دانەنێین :

کراسێکی ڕەشم دەوێ .

- <u>***یەکی***</u> ڕەشم دەوێ.

بێ دانانی وشەکە ، ڕستەکە واتای تەواو نابێت .

ئاخاوتنی کۆمپانیای ئوتێل و سەیارە بە کرێدان و شت فرۆشتن...کرتاندنی وشەی وەك یەکی تێدا نییە ، بەڵام کرتاندنی هەندێ وشەی تێدایە، وەك :

-من ناوم نەرمینە ، فەرموو بێ زەحمەت چۆن یارمەتیت بدەم ؟.

ئەو ڕستەیە دەبێتە :

چۆن یارمەتیت بدەم ؟

کرتاندنی ئەو هەموو وشەیە سوودێکی ماددی زۆری هەیە! کۆمپانیاش لە سەر قازانج دامەزراوە.کەواتە ئاخاوتنی کورتنووسی ، ئەگەر لە دوو دیاردەی کرتاندن و لە بریتی دانان نزیکە ، بەڵام هیچ کامێکیان نییە .ڕێکتر

بلّێین ئەو دووە کار لە سەر زمان دەکەن و بە پێی ڕێسا ڕێزمانییەکان دەبن ، بەلاّم کرتاندنی کورتنووسی لە سەر پارە دروست دەبێ ، نەك ڕێزمانی .

**زمانی دایەلۆگ و ئاخاوتن**

ئاخاوتن لە سەر کورتبیێژی نەك درێژدادڕی فۆرمەلە کراوە .هەر دایەلۆگێك بۆ ئەوەی خوێنەر بێزار نەکات دروستکراوە .بە واتای ئامانجی سەرەکی دایەلۆك کار لە سەر لایەنی سایکۆلۆژی خوێنەر دەکات . ڕۆمان بە شانۆگەری کردن لە سەر کوشتنی وەسفی نێو ڕۆمان دامەزراوە .

**کورتە**

ئەوەی ئێمە کاری لە سەر دەکەین زمانی پیتە-ئەوەی بە پیت دەردەبڕێت- نەك زمانی خەت ، چونکە بە دیدی ئێمە زمانی خەت هەم کێشەیەکی ئایینی دروست دەکات ، هەم بەرتەسکە تەنیا لە کۆنووس و هێلّکاری دلّ..بەکار دێت ناتوانێ وەك زمانی پیت دەربڕی هزری ئالّۆز بێت.وێڕای ئەوانەش ، زمانی خەت یان هێلّکاری بانگەشە بۆ نەخوێندەواری دەکات ، بەلاّم لە زمانی پیت نەخوێندەواری شوێنی نابێتەوە. زمانی خەت یەك قازانجی بۆ کورد هەیە دەکرێ ببێتە زمانی بادینی و سۆرانی ، چونکە زمانناسێکی کورد دەیەوێ لە ڕێگای زمانەوە ، سایکس-بیکۆیەکی کوردی بهێنێتەکایەوە!!

## Sign
### هێما –ئاماژە

هێما لە زمانەوانی هێمایی و زمانی جەستە و زمانی هێما و سیمیۆتیکس هەیە .لەو هەموو بارانەدا هێما جودایە ، بەلاّم ئەوەی لە هەموو بارەکان هاوبەشە ئەوەیە خوێندەواری پەیوەندی بە خوێندنەوەی هێما نییە.

## Sign language
### زمانی هێما

زمانی هێما تایبەتە بە زمانی ئاماژە. بە دەست و بەشەکانی جەستە بەکاردێن بۆ جێگرتنەوەی ئاخاوتن.ئەو زمانە لە نێوان خەڵکە کەڕەکان و مرۆی گوێ لێبوو.

## Sino-Tibetan
### سینۆ تیبتان

سینۆ تیبتان خێزانە زمانێکە کە پۆلێن و ئەندامێتی جێگای مشتومڕە .ئەو خێزانە زمانە زۆر زمان دەگرێتەوە لە زمانی تیبتی ، زمانی چینی ، زمانی بۆرمایی هەندێ سکۆلەر زمانی دی بە ئەندامی ئەو خێزانەزمانە ، بۆیە دیارکردنی ناسنامەی ئەو زمانە دژوارە.

## Slavic
### سلاڤی

لقێکە لە خێزانە زمانی هیندۆئەورووپی بەدرێژایی ئەورووپای ناوەند بەرەو رۆژهەلاّتەوە قسەی پێدەکرێ.سلاڤی دابەش دەکرێ بۆ سێ لق : سلاڤی

رۆژهەلاتی،رووسی و ئۆکرانی دووەم .سلاڤی رۆژئاوایی ،پۆلەنـدی و چـیکی و سلۆڤاکی و صربی .سلاڤی باشووری ، بولگاری و مەکەدۆنی و صرب-کرواتی و سلۆڤانی .زمانی سلاڤی نزیکترە لە نێو هیندۆئەورووپی لـە بـەلتیکی لـە هەر لقێکی تر بۆیە بە بەلتۆ-سلاڤی ئاماژەی پێدەکرێ.

لە سەردەمی زێرینی کۆمۆنیستی وەك زمانێکی چەتری ئاماژەی پێ دەکرا ، چونکە چەترێك بوو بۆ کۆکردنەوەی کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت و بەلقان.

## Slip of the tongue
## خلیسانی زمان

خلیسکانی زبان بۆ درکانـدنی راسـتیەکان ئـەو دیاردەیـەکی هەڵەیـەکی ئاخاوتنە ئەوجا چ دەنگێك یا وشەیەك لە شوێنێکی هەڵە بەکاربێت.

## Slovak
## سلۆڤاك

بەشێك لە لقی سلاڤی رۆژئاوایی پێکـدەهێنێ .زمانێکـە زۆر نزیکـە لـە زمانی چیکی .زمانی رەسمیە لە کۆماری سلۆڤاك. زمانی چیك و سلۆڤاك لـە لایەك هەروەها سویدی-نەرویجی-دانیمارکی لە لایەکی تر هـەردوو کۆمەڵـە زمان زۆر نیزیکن لە نێوخۆیان لە یەکەوە،بەلاّم زمانی سەربەخۆن.

## Social dialect
### دایەلێکتی کۆمەڵایەتی

ئاخاوتنێك پێکدەهێنێ کە پەیوەستە بە چینێکی کۆمەڵایەتی لە نێو کۆمەڵگادا کە جیاواز و پێچەوانە بێ بە چەمکی دایەلێکت بە مانای ئاسایی.

## Social diactology
### دایەکتەلۆژی کۆمەڵایەتی

بریتیە لە پیادەکردنی میتۆدەکانی دایەکتەلۆژی لە سەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بە تایبەتی لە سەر پەیوەندی نێوان ئەدگارە کۆمەڵایەتیەکان و فاکتەری وەك چین ، سێکس ، تەمەن ، پیشە ، ئەتنیك.جەختکردن لەو مەسەلەیەدا بریتیە لە ئەندامێتی گروپی وەك بریادەری شیانی دایەکتۆلۆژی.

## Socio-historical linguistics
### زمانەوانی کۆمڕ

لقێکە لە زمانەوانی کە لێکۆڵینەوە لە سەر فۆرم و بەکارهێنە جیاوازەکانی زمان لە کۆمەڵگادا هەروەها دیراسەی ئەوە دەکات کە چۆن ئەرکێکی زمانەوانی تایبەت و جۆرە جیاوازەکانی پەرەدەسێنن لە نێو زمانێکی تایبەت و کۆمەڵگایەکی ئاخاوتن و گروپە کۆمەڵایەتیەکان و تاکەکان.

## Sociolect
## سۆسیۆلێکت

شێوەیەکی زمانەوانیە کە لە سەر بونیادی کۆمەڵایەتی وەك چینی کۆمەڵایەتی یان گروپی پیشەیی، نەك دەڤەریی، پێناسە دەکرێت.لەو روانگەوە بە دایەلێکتی چین یا دایەلێکتی کۆمەڵایەتی ناودەبرێت.

## Sociolinguistics
## کۆزمانەوانی

کۆزمانەوانی لە چاو چەمکی زمانەوانی نوێیە .کۆزمانەوانی بوارێك لە بوارە جیاوازەکانی زمانەوانی نویێ پێکدەهێنێت .ئەو لقەی زمانەوانی لەو رێگایانە دەدوێت کە زمان دەبەستێتەوە بە کۆمەڵگای مرۆیی وەك رەگەز ، ئەتنیکی |، چینی کۆمەڵایەتی و سێکس و دامودەزگای کۆمەڵایەتی .بابەتی کۆزمانەوانی لە سۆسیۆلۆژیای زمان جیاوازە کە ئەوەی دوایی هەوڵدەدات خاڵێك یا مەسەلەیەك لە روانگەی سۆسیۆلۆژی بەگەڕبخات .لە ئەوروپادا ئەو دیتنە پێیدەڵێن زمانەوانی سۆسیۆلۆژی کە ئامانجیتی زمان وەك بەشێکی جیانەکراوەی تیۆری سۆسیۆلۆژی ببینێت.

کۆزمانەوانی بریتیە لە دیراسەکردنی زمان پەیوەند بە کۆمەڵگاوە، ئەو دیتنە لە کۆتایی شەستەکان لای لابۆڤ و لایەنگرانی دروستبوو.

## Somalia
## سۆماليا

دانیشتوانی سۆمالیا زیاتر لە هەشت ملیۆن کەس دەبن، زۆربەی تاکەکان زمانی سۆمالی بە ڕێژەی ٩٥٪ بە کاردەهێنن .ئیتالی لە بەشی باشوور بەکاردێ و زمانی عەرەبی و ئینگلیزی وەك دوو زمانی جیهانی لە پەیوەندیە جیهانیەکان بەکاردێن.

## Sound change
## گۆڕانی دەنگیی

ئەو گۆڕانە تایبەتە بە گۆڕان لە سیستەمی فۆنۆلۆژی زمان لە ماوەیەکی دیارکراو.کەواتە پرۆسەکە بریتیە لە گۆڕانی دەنگیی چەند دەنگێکی پەیوەست بە یەکەوە لە قۆناغێکی دیاری مێژووی زماندا.

## Spanish
## ئیسپانیا

زمانی ئیسپانی ئەندامە لە خێزانە زمانی ڕۆمانس کە نزیکەی ٣٠٠ ملیۆن کەس لە مەکسیکۆ و ئیسپانیا و کۆلۆمبیا و ئەرجەنتین و فەنزوێلا و ئەمریکا و پیرو و کوبا و زۆربەی وڵاتانی ئەمریکای لاتینی بێجگە لە بەرازیل بە ڕێژەی جیاواز قسەی پێدەکرێ .کەواتە خێزانە زمانی ڕۆمانس ئەو خێزانە زمانەیە کە سنووری کێشوورەکان دەبڕێت.

## Speaker's recognition
### ناسینەوەی قسەکەر

لقێکە لە فۆنێتیکس کە لە دەنگی ئاخێو دەکۆڵێتەوە بە نیازی ناسینەوە.

## Speech act
### کردە قسە

لە پرۆسەی کردە قسەیدا سێ فاکتەر ئامادەگیان هەیە : قسەکەر –گوێگر –کۆنتێکست.ئەو گواستنەوەیە گواستنەوەیەکی مێشکیە لە نێوان ئاخێوی بەرهەمهێنی ئاخاوتن و وەرگری ئاخاوتن.لە نێو کۆنتێکستی ئەو چالاکیە گەیاندنەدا ژمارەیەکی بەرفرەه لە ئاخاوتن وەك ئاراستەکردن ، داخوازی ، بەڵێن ..پێشنیاز دەکرێت.

## Speech community
### کۆمەڵگای زمانەوانی

بریتیە لە پێناسەیەکی دەڤەریی یان کۆمەڵایەتی گروپە مرۆییەکان کە بەوە دەناسرێنەوە کە زمان یان شێوەیەکی هاوبەش بەکاردێنن.

## Sri lanka
### سریلانکا

وڵاتێکی فرەنەتەوەییە زمانی سیهالا زمانی لە ٧٢٪ خەڵکە و زمانی تامیل زمانی لە ٢٠٪ تامیلیەکانە.زمانی سینهالا زمانی رەسمیە هەرچی زمانی تامیلە زمانی ناوچەییە.

## Standard

### ستاندەر

پرۆسەی ستاندەربوون لە رۆژئاوا لە روانگەی دایەلێکتی زمانێکەوە بریاری لە سەر دەدرێت هەروەها لای عەرەبەکان هەژموونی رۆحی قورئان کۆکەرەوەی عەرەبە هەروەها لای فارسەکان فاکتەری حەزارییبوون هۆیەکە بـۆ سـەپاندنی فاریسی کەچی لای کورد دەڤەر و مێژوو و ژمارە فاکتەری ستاندەربوونن.

## Structure

### پێکهاتە

پێکهاتەی زمان ناسنامەی نەتەوەیی زمانە.پێکهاتەی هەرشتێك گرینگـە .شتراوس باوەڕی وایە کە هەموو ئەفسانەکان لە بنەڕەتدا وەك یەکن .بـەر لـە سۆسێر قسە لە سـەر دەرەوەی زمـان دەکـرا ، بـەڵام ئـەو هـات وتـی زمـان سیستەمە.لە نێوەدا بونیادگەری دروستبوو، کەواتە پێکهاتەی هـەر زمانێـك بریتیە لە تۆڕێك لە یەکەی پێکەوەگرێدراوی ناوەکیی.

## Stylistics

### ستالیستیکس-شێوازگەریی

لـە ڕوانگـەی دیـتنی کلاسـیکی زاراوەکـە ، شـێوازگەریی بریتیـە لـە لێکۆڵینەوەی شێواز لە زماندا لە نووسینی جیایی لە نێوان دەقـی ئـەدەبی و دەقی تر کەچی لە نوێدا شێوازگەریی بریتیە لە جیـایی سیسـتیماتیکی لـە نووسین و ئاخاوتندا کە پەیوەستن بە جۆری دیسکۆرس و کۆنتێکسدا.

## Subjacency

### هاوسێیی

هاوسێیی پرانسیپێکی رستەسازیە لە لایەن چۆمسکیەوە لە کۆتایی حەفتاکان فۆرمەلەکرا .بیرۆکەکە بریتیە لە جولاندن و بزاوتنی یەکەیەك بلۆك دەکریٚ گەر هەردوو یان زیاتر سنووری کاتیگۆری پێکهێنەری ببەزێنێت.

## Subordination

### پارستە

هەبوونی پارستەیی ئەو مانایە دەبەخشەیت کە لە یەکێك لە رستەکاندا بیرۆکەی پاشکۆیی هەیە.بیرۆکەی سەبۆردیشن پێچەوانەی کۆئۆردیشنە لە یەکەمدا تەنیا رستەیەك سەربەخۆیە کەچی لە دووەمدا هەموو رستەکان سەربەخۆن.

## Sudan

### سودان

ولأتێکی ئەفریقیە کە تێیدا زمانی عەرەبی لە لایەن نیوەی دانیشتوانی زمانی رەسمیە یان هەرچ نەبێت زمانی عەرەبی بەشێوەیەکی بەرفرەە لینگوا فرانکایەکە .لەو ولأتەدا موسلمان و مەسیحی و وەسەنی...هەیە .لە سالّی ۲۰۱۱ پاش شەرِ و ئاشتیەکی زۆر سودانی باکوور –دەسەلأتی خەرتوومی نیوە ئیسلامی- رازی زۆربەی مەسیحی و وەسەنیەکانی باشوور دەولّەتێك بۆخۆیان دامەزرێنن.

## Sumerian

سۆمەری زمانێکی کۆنی باشووری میسۆپۆتامیایە بەلاّم پەیوەندی ئۆرگانی بە هیچ زمانێکی باشوورەوە وە نییە . زمانی سۆمەری بە شێوەی مێخەکی –کیونیفۆرم دەنووسرێت.هەندێ پیکتۆگرام لەو زمانەدا هەیە کە ئەکەدیەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زایین بەکاریان هێناوە .کردەوەی ئەو سۆمەریانە کە لە باکوور کۆچیان کردووە بۆ باشوور بە شارستانی دۆڵی رافدین دەناسرێ بۆیە تورکە قەومیەکان لە ڕێگای تیۆری زمانی رۆژەوە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو سۆمەریانە تورك بوونە هەرچی کوردەکانیشن دەڵێن ئەگەر ئەو سۆمەریانە کورد نەبن ئەدی چین ؟ ناسیۆنالیستی عەرەبیش بانگەشەی ئەوە دەکات کە عەرەبن ، بەلاّم لە راستیدا زمانیان ناگەڕێتەوە سەر خێزانە زمانی سامی!

## Surface structure

### پێکهاتەی سەرەوە

بریتیە لە نواندنی لایەنی سینتاکسی ڕستە کە وەك دارێژراو دەبیندرێت بە هۆی هەندێ یاسای گوازتنەوە کە بە سەر پێکهاتەی ژێرەوە پیادە دەکرێت..چۆمسکی زمانەوان لە ناوەراستی شەستەکانی سەدەی بیستەم ئەوها پێناسەی پێکهاتەی سەرەوە دەکات :"بەشێك لە وەسفی سینتاکسی ڕستە پێکدەهێنێ کە بریار لە سەر نواندنی فۆنەتیکی رستە دەدات، بەو پێیە پێکهاتەیەکی ئەوتۆ وا دەکات هەموو یەکە سینتاکسیەکان لە ریزبوونێکی فۆنەتیکی دابن کە دایاندەهێنن .هەر چۆمسکی لە ناوەڕاستی حەفتاکان کە پێکهاتەی سەرەوە نواندنی سیمانتیکیش بنوێنێ .لە مۆدێلی کۆتایی

حەفتاکاندا ناوی ئەو پێکهاتەی نا ئێس-پێکهاتە هەروەها لە مینیمالیست پرۆگرامدا چی تر گرینگی بە پێکهاتەی سەرەوە نەدا.

## Sweet,Henry
## هێنری سویت ١٨٤٥-١٩١٢

هێنری ڕێزمانووس و دەنگساز و ئەنجیلناسی بەریتانییە، کە بەشدارییەکانی لە بواری فۆنەتیك و دەسپێکی مێژوویی زمانی ئینگلیزی بنەچیین.فۆنەتیك لە ڕوانگەی سویتەوە بنەچەیەکی جیانەکراوەیە لە توێژینەوەی هەموو زمانەکان.لە وەسفکردنی ڤاولەکانی زمانی ئینگلیزی دەردەکەوێ سویت چەند بلیمەتە.لەو پرۆسەیەشدا بیرۆکەی ئینجیلی تێکەڵ بە بواری زمانەوانی دەکات.

## Syllable
## بڕگە

بڕگە بەهۆی هەبوونی ڤاولەوە دروستدەبێت.بڕگە دوو جۆری هەیە: بڕگەی کراوە و بڕگەی داخراو. لە لایەکی دی ، چەمکی بڕگە لە بواری هونەری ئەدەب بە تایبەتی شیعر بەکاردێت: بە ژمارەی بڕگەکان وەزنی شیعرەکە دیاری دەکرێت.

بڕگە یەکەیەکی فۆنۆلۆژیە کە پێکدێت لە ڤاول یا یەکەی تر کە دەکرێ بە تەنیا بەرهەمبهێنرێت.ئەو یەکەیە بە تەنیا بێت یا لە دوای یەکەیەکەوە بێت کە کەم و زۆر یەکەی دەنگدار بێت.

## Symbol
## هێما

بەپێی تیۆری پێرسی ئاماژە تایبەت کراوە بەو ئاماژانە کە پەیوەندیان بە شتەکانەوە شتێکی تەواو ئاساییە، ئەو ئەدگارە لە زۆربەی وشەکانی هەر زمانێکدا هەیە.

## Syncategorematic
## سینکاتێگۆرماتی

وشە وەك یەکەیەکی واتادار دەبینێت بە تایبەتی پەیوەندی هەبێت بە وشەی ترەوە.

## Synonym
## هاوواتا

وەکیەکی لە واتادا زۆر دەگمەن لە زماندا دروستدەبێت ، بۆیە سینۆنیمی بەشەکی لە سینۆنیمی ڕەها زۆرترە.خودی سینۆنیمی بە هۆی هەبوونی چەند زاراوەیەك بەرپایە: ئاروو —خەیار ، زار-دەو و دەم ، چۆن —کوو، دەڤەر-ناوچە...

## Syntax
## سینتاکس

سینتاکس بریتیە لە دیراسەکردنی پەیوەندیە ڕێزمانییەکانی نێوان وشەکان و ڕەگەزەکانی دی ناو ڕستەیەك.هەرچەندە مۆرفۆلۆژی خوشکی

سینتاکسە لە ڕێزماندا ، بەلاّم هەردوو وشە تـەواو لـە یـەك جـودا و ئـەرك جودان: مۆرفۆلۆژی لە پێکهاتەی ناوەوە و دەرەکی و تاکی وشە و گرێ دەدوێت هەرچی سینتاکسە لە سەر ڕیزبوونی ئەو وشانە بـە پێـی سیسـتەمێکە لـە ڕستەدا، کەواتە ئاستی مۆرفۆلۆژی وشەیە وە ئاستی سینتاکس ڕستە .

## Systemic grammar
## ڕێزمانی سیستیماتیکی

شێوازێکە لـە سینتاکسـی ئەرکیە.ئـەو ڕێزمانـە هالیـدەی لـە کۆتـایی پەنجاکان پەرەیپێدا.ئایدیای بنەڕەتی ئـەو ڕێزمانـە ئەوەیـە هـەر کردەیـەکی پەیوەندیکردن کۆمەڵێك هەڵبژاردە دەهێنێتەدی.

هەر کۆمەڵە هەڵبژاردەیەك سیستەمێك پێکـدەهێنێت ، وەك جەمسـەری پرس و پرسی دەبلیۆئێچ یەك سیستەم پێکدەهێنن.بەو پێیە ڕێزمانەکە وەسفی سیستەمەکانی زمان دەکات هـەروەها پەیوەنـدی نێوانیـان و ئـەو ڕێیانـەی دەهێنەدی.

## پیتی T

## Taboo language
### زمانی تابوو

زمانی تابوو زمانێکە تژیە لە وشەی تابوو.هەر بەو وشانەش ئەو ئەدگارە وەردەگرێت.

## Taboo words
### وشەکانی تابوو

بریتیە لەو وشانەی ناسراون لە لای ئاخێوەر ، بەلاّم لە هەندێ فۆرم و کۆنتێکستی ئاخاوتنی خۆی خۆیان لێ دوور دەگرێ بە هۆی گەلەهۆیەکی دینی و مەزهەبی و پۆلاینس--ڕێز .لە کۆمەڵگای ئێزیدی ئاخێوەر دەبێ وریا بێ پیتی –ش- بەکارنەهێنێت هەروەها لە هەندێ کۆمەڵگادا وشەی مردن تابۆیە

## Tacit knowledge
### زانیاری ناخی

ئەو فرێزە دەرهاوێشتەی عەقڵی چۆمسکی-یە .لە نەزەر ئەو ، زانیاری ڕەگداکووتووی ناخی دروستە ئەو زانیاریە دروستە ، بەلاّم لە واقیعدا بەو دروستیە جێ بە جێ ناکرێت.

## Tagmemics
## تاگمێمیکس

ئەو رێزمانە مۆدێلەکە لە سینتاکسی ئەرکیی لە لایەن پایکەوە لە ۱۹۵۰ کانەوە پەرەی پێدرا.چەمکی سەرەکی تاگمیم لە پەیوەندی نێوان خانەی سینتاکسی و ئەرکدا وەك بکەر و بەرکار و ناو.

## Tamilتامیل

زمانی تامیل کە پێیدەگوترێ دراڤیدی هیندیەکانی دەوڵەتی تامیل نادو لە باکور و رۆژهەلاتی سریلانکا قسەی پێدەکرێت

## Target languageزمانی ئامانج

زمانی ئامانج بریتیە لە زمانی بۆ وەرگێردراو.پیکهاتەی ئەو زمانە لەگەل زمانی سەرچاوە لە یەك جودان.

## Terror in language
## تیرۆر لە زماندا

لە ناونیشانەکە سێ چەمك قسەی لە سەرکراوە : تۆقاندن :ترساندن، ئیرهاب -تیرۆر، زمان :هەر زمانێك بە گشتی ، زمانی کوردی :دوور لە سیاسەت و لایەنگیری زارێك نووسەر باوەری بەوەیە زمانی کوردی بوونی هەیە و ئەگەر نزیك بێ لە زمانی ئاخاوتنی کرمانجی ناوەراست ئەوا کاریگەری یان مۆرکی زارێکی دیارکراوی بە سەر وە نییە.

چەمکی تۆقاندنی زمان هەرچەندە لە ڕووی کاتەوە لە ئەدەبیاتی کوردیەوە نوێیە ، بەڵام ڕەگی ئەو دیاردە زمانەوانیە بە قەد دروستبوونی کۆمەڵگای مرۆڤیەوە کۆنە! تۆقاندنی زمان زۆر نزیکە لە کوشتنی زمان.ئەو دیاردەیە لەگەڵ دروستبوونی دەمارگیری نەتەوەیی و پەڕگیری لە دین و کولتوردا پەیدابووە ، بە واتای دەمارگیری بە تایبەتی دەمارگیری مەسیحی و پەڕگیری دینی و کەلتوریی بنەما و شەنگستی تۆقاندنی زمان بوونە!

## تۆقاندنی زمانی عەرەبی

موسلمانە عەرەبەکان لە پێشەوەی ئەو نەتەوانەی ڕۆژهەڵات بوونە، کە لە پێناو پاراستنی دینەکەیان دووچاری تۆقاندنی زمان بوونە. ناسیۆنالیستی عەرەب بە هەمان سیاسەتەوە بوون بەرامبەر کەمینە و نەتەوەکانی جیهانی عەرەبی.بەرامبەری عەرەب — دژەکە- زەنی وا بووە کە زمانی عەرەبی زمانی دەقی قورئانە بۆیە گرنگە لە ڕێگای ئەو زمانەوە قسەی لە سەر بکرێ! ستراتیژیەتی لە مەڕ قەڵاچۆکردنی بخرێتە چوارچیوەی کار. دژەکانی موسلمانە عەرەبەکان دەیانزانی عەرەب پێش موسلمانبوونی بە چەندەها زار و بنزار قسەی کردووە ، بەڵام ئێستا هەموو ملکەچی زمانێکی ئیلاهین و بە هیچ زارێکی عەرەبی ناچێت و ئەو زمانە دەقی قورئانی پێ نووسراوەتەوە و وشەکانی لە نێو سیستەمێکی موتلەق جێ خۆی گرتووە.ئەو هارمۆنیەتە تەنها لە زمانی قورئان هەیە هەتا خوێندنەوەی وشە و ڕستەکانی لە خوێندنەوەی دەقێکی عەرەبی مرۆڤکردە ناچێت.هەر دەقێکی عەرەبی :ڕۆمان ، شانۆگەری ، شیعر ، لێکۆڵینەوە بە شێوەی تەجوید و تەرتیل ناخوێندرێوەتەوە ، بەڵام دەقی قورئان ئەو خەسڵەتەی هەیە.

قسەکردنی عەرەب جۆرێکە لە زمانی دایك و دایەلێکتێکە لە زارە جیاوازەکانی عەرەبی ، زمانی دەقی قورئان هەم پاراوە هەم زمانێکی ئیلاهیە و گەیشتۆتە ئاستێك پێیبگوترێ زمانی باڵا.ئەو زمانەش تەواو جودایە لە هەر زارێك یان بنزارێکی عەرەبی.لە ڕووی زمانەوانیش ناکرێ " زمانێکی ئیلاهی " بە " زارێکی ناوخۆیی " بەراورد بکرێت.هەر زارێك بە چەند قۆناغێك دادەچێت و دەبێ چەند ئەدگارێکی هەبێ و لە هەمووی گرنگتر دەبێ لە ئەدگاری هەرێمیی یان ناوچەیی ڕزگار بیێ تا دەبێتە زمان!!ئەوە وەیکردووە زمانی قورئان لە دایەلێکتەکانی عەرەبی جودا بێ.

ئەورووپیەکان ، هەرچەندە لە چەمکی دین هەڵدێن ، بەڵام هەر کە دینێکی تر وەك ئیسلام بۆ نموونە لە ئەورووپا دەسەڵاتی پەیدا کرد، دەسەڵاتدارانی وڵات ستراتیژیەکی تر پیادە دەکەن و ئەو یەکتر قەبووڵکردنەی ئەویتر چوارچێوەیەکی تر وەردەگرێ! ئەوەتە وڵاتێکی وەك سوێد بانگەشەی ئەوە دەکات کە تاکەکانی لە سەدا هەشتا و پێنجی ٨٥٪ لە سەر هیچ دینێك نین، بەڵام بەرامبەر دەرکەوتنی ئیسلام لە هەناوی ئەورووپا هەمان هەڵوێستیان دەبێت؟ئەی ئەوەی لە بۆسنە و ئەلبانیا ڕوویدا زۆربەی ئایدۆلۆژیەکانی یەکتر قەبووڵکردن کەوتە ژێر پرسیار بەتایبەتی بەرامبەر ئەو قەسابخانانەی لە وڵاتێکی وەك یۆگسلافیا ڕوویدا! لەو پرۆسەیە دین و کەلتور و زمان کەوتنە ژێر رەحمی تۆقاندن!

بۆیە ئەو نموونەم هێنایەوە ، چونکە ڕەگی تۆقاندنی زمان لە دەرکەوتنی ئیسلام لە ئەسپانیا سەریهەڵدا.ئەورووپیەکان لە بەر دوو هۆی بنەڕەتی لە موسلمانەکانی ئەسپانیا نزیك بوونەوە : یەکەمیان دیاردەی زانستی: لەوێ بە

تایبەتی پزیشکی! وەرگرتنی پزیشکی لە موسلمانەکان.دووەمیان پرۆسەی فێربوونی زمانی عەرەبی بۆ ئەوەی لە ڕێگای زمانەوە تۆمەت بۆ ئیسلام بدۆزنەوە. گومان لە سەر دەقی قورئان دروست بکەن. لە بەر ئەوەی دەقی قورئان بە زمانی عەرەبییە ، هەوڵیانداوە لە ڕێگای زمانی ئەو دەقەوە ، پیرۆزی ئەو دەقە لە لای تاکی ئەوروپی بشێوێنن و گومانی بۆ دروست بکەن.هەر لە سەر ئەو بنیاتەش سەرەتا قورئان لە سەدەی پازدە بە غەڵەتی تەرجومەی زمانێك لە زمانی ئەوروپی کرا!

ئەو جۆرە ڕۆژهەڵاتناسیە لە دوای گرتنی غەرناتە دەرکەوت.ئەوسا تۆقاندنی زمانی عەرەبی ، بە تایبەتی زمانی قورئان کاری لە سەر کرا.ئەو تۆقاندنە و کوشتنە عەرەب و لە پاشان ئەو جولەکانەی ناسرابوون بە جولەکەی دۆنمە بەرەو دەوڵەتی عوسمانی کۆچیان پێکرا.هەرچەندە تۆقاندنی عەرەب و جولەکە لە دوو وەختی جودا و بە دوو سیاسەتی جودا کراوە ، بەڵام ئەوە گەلانی ئەورووپا بوون سیاسەتی تۆقاندنی زمانیان بە موسلمان و جولەکە پەیڕەوکرد.

## تۆقاندن و زمانی کوردی

کورد مێژوویەکی دوور و درێژی لە سەر نە خوێندنەوەی زمانەکەی لە تەرەف ئەوانی ترەوە، هەیە.تیرۆرزمی زمان پرۆسەیەکە کورد لە هەموو نەتەوەیەك زیاتر هەستی پێ دەکات ، چونکە خۆی لە هەناوی ئەو پرۆسەیە دەژیت.حاڵەتی داگیرکردنی کوردستان وەیکردووە گەلانی داگیرکەر تورك و عەرەب و فارس زمانی خۆی وەك ئەلتەرناتیڤێکی بکوژی زمانی کوردی لە پەروەردە هەتا لە پۆشاکیش بە خۆهێشتی بسەپێنێت. ئەو میللەتە

داگیرکەرانە هەوڵیانداوە بە توند و تیژی یان بە ئاشتی زمانی کوردی لە شارەکاندا تیرۆر بکەن. بۆیە دەڵێم شارەکان ، چونکە شارەکان بە ناوی شارستانیبوونەوە ژێدەرێکی باشن بۆ پیسبوونی زمان بە وشەی گەل و نەتەوەی ترەوە ، بەڵام زمانی کۆمەڵگای گوند پارۆیکی هێندە ئاسان نییە وەك ئەوەی شارسەرکەوتنی شۆرشی ئەتاتورك پاش لە سێ چارەگە سەدە نەیتوانیوە بە هەموو توند و تیژیەك تورکی بە سەر زمانی کوردی بسەپێنێت.

## جۆرەکانی تۆقاندنی زمان

### دوو جۆری سەرەکی تۆقاندنی زمان هەیە :

### یەکەم ،تۆقاندنی دەرەوە

ئەو جۆرە تۆقاندنە لە سەردەمی ئەستیاگ دەستیپێکردووە بە تایبەتی پاش ئەوەی کوڕی خوشکی لە گەڵ دەستوپێوەندەکانی کودەتایەکی سەربازیان لە سەر دەسەلاتی کرد و ئەستیاگیان زیندانی کرد.لە پاش ئەو کودەتایە زمان و زمانی ئایین –ئاڤێستا –ئەلفبێی کوردی ونکرا یاخود هەخامەنشینەکان –فارسەکان- خۆیان کردە خاوەنی.ئەو بێ ناسنامەیی و تۆقاندنەی زمانی کوردی هەتا دەرکەوتنی حوجرەی کوردی درێژەی هەبوو. جارێکی تر زمانی کوردی لە حوجرەی کوردی لە سەر دەستی مەلای کوردی ژیاوە و زمانێك دروستبوو بە ناوی زمانی مەلایی!هەر بەو زمانەش پێش هەموو گەلانی ئەوروپا ، مەلایەکی کورد زمانی بەراودی لە نێوان عەرەبی و کوردی و فارسی دانا! هەروەها بە زمانە بابە تاهیری هەمەدانی چەند سەدە بەر لە ئینگلیز شیعری پێهۆنیەوە!

پاش دابەشکردنی کوردستانیش بۆ پێنج بەش ، تەنیا لە باشوور نەبی، لە بەشەکانیدی زمانی کوردی لە پەروەردە قەدەغەکرا!بە کورتی سیاسەتی دەسەڵاتی تورك و فارس و عەرەب گەورەترین تۆقاندنی زمانیان دژ بە زمانی کوردی بەکارهێناوە!

## دووەم ، تۆقاندنی ناوەکی

کورد بە خۆی بێئەوەی هەست بکات تیرۆرزمی زمانی دژی زمانی کوردی بە کارهێناوەدەکریٚ ئەم تۆقاندنە لە چەند خاڵێك کورتبکەینەوە:

١. فەرامۆشکردنی زمانی ستاندەر و فەرمی لە دامودەزگا تایبەتەکان! خەڵك یان بە هەڵە لە زمانی ستاندەر و فەرمی-ڕەسمی- گەیشتووە یان نایەویٚ لە ڕاستی ئەو دووە بگات. زمانی ستاندەر زمانی خوێندنە ، زمانی نووسینە زمانی قسەکردن-ئاخاوتن- نییە.ئەو جۆرە زمانە تەنها لە پەروەردە نیشی لە سەر دەکریٚ.لە ماڵەوە ، لە میدیا خەڵك ئازادە بە چ زارێك و بنزارێك دەدویٚ.کە لە ڕێگای پلانی زمان زارێك یان بنزارێك هەڵدەبژرێدریٚ بە زمانی ستاندەر ، کورد لە نەتەوەبوون نزیك دەکاتەوە! کە د.ئەمیر پوور باس لەوە دەکا بە پەسندکردنی زارێك دوو نەتەوە لە نەتەوەیەك دروست دەبیٚ ، ئەمەشی پیٚ دیموکراسیە زۆر لە نەتەوەبوون لە ڕێگای زمانەوە دوورە. ئەگەر پێی دیموکراسیەت بیٚ کە( صرب و کروات ) و ( چیك و سلۆڤاك ) لە ڕێگای زمانەوە هەر یەکەی بوونە دوو نەتەوە ، کوردیش ئەوها ببێتە دوو نەتەوە ئەوا پرۆژەی داگیرکەران پیادە دەکات و هەر خۆی پەیرەوی تیرۆرزمی زمانی کوردی دەکات. ئەو ڕایە سایکس –بیکۆیەکی کوردیە! زمانی فەرمیش تەنیا زمانێکی کارگێریە مەبەست لێی فەرمانبەرانی حکومەتە لە

سەرانسەری وڵات. ئەو زمانەش لە ماڵەوە ، بازاڕ قسەی پێ ناکرێ.کەواتە جووتستاندەری پرۆژەیەکی پڕ تۆقاندنە دەرهەق بە زمانی کوردی!

٢. دایەسپۆرای کوردی

لە کۆمەڵگای نامۆ و دوور لە دەسەڵاتی زمانی کوردی پرۆسەی تۆقاندنی زمانی کوردی. پاش مانەوەی کورد لەو کۆمەڵگانە، خۆیان خزمەتی زمانی کوردیش بکەن ، نەوەکانیان لە بەر بەرژەوەندیەکانیان لە بیری دەکەن.

٣. ئەو کوردانەی بە هەر هۆیەکی سیاسی یان ئابووری چوونەتە بەغدا ، تەهران ، دیمەشق ، ئەستەمبۆل ، نەوەیەکی بێ ئاگا یان نەزان لە زمانی کوردیان لێدەردەچێ!

٤. فەرامۆشکردنی زمانی کوردی لە خوێندن یان ڕێزنەگرتنی زمانی کوردی لە لای کوردەکان یان نووسینەوەی یاساکانی پەرلەمانی کوردستان بە زمانی دی!!

## Test

## تێست

تێست تاقیکردنەوەیەکە بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکە.تێست جۆری سەبجەکتیڤ و ئۆبجێکتیڤی هەیە.هەروەها تێست قۆناغی هەیە وەك تێستی پایلۆت و فاینەل.

## Text

## دەق

دەق یان تێکست بوارێکی دی زمانەوانیە پێیدەوترێ دەقناسی یان زمانەوانی دەق.دەق شێوە و تیۆر و نموونەی خۆی هەیە.لە لایەکی دی ،دەق بنیات و سینتاکس و تێگەیشتنی خۆی هەیە.سێ جۆرە روانگە بۆ دەق هەیە:

١.دابەشکردنی سینتاکسی دەق،

٢.دەقی سینتاکسی لای فندایك،

٣.شرۆڤەی سینتاکسی-سیمانتیکی دەق یان دیتنی دەق لای زمانەوانی بەرهەمهێنان.لە لای کریستال دەق بریتیە لە پارچە ئاخاوتنێکی وتراو و نووسراو و ئیمزاکراو بە مەبەستی شرۆڤەکردن و وەسفکردن هەروەها دەق وەك یەکەیەکی زمانەوانی دامەزراوە لەگەڵ ئەرکی پەیوەندیکردن وەك کۆنڤەسێیشن.ئەو دیراسەیە لە ئەدگاری دەق دەکۆڵێتەوە پێیدەوترێ دەقکاری.

## Textlinguistics

## دەقناسی –زمانەوانی دەق

بڕوانە سەرەوە

## Torany

## تۆرانی

ڕەگەزی تۆرانی وەك کۆکەرەوەی تاکی تورك لە دوای کودەتای تەموزی ١٩٠٨ بۆ روخاندنی سیستەمی خەلافە بە پەنهانی دەرکەوت. گروپی ئیتحاد و تەرەقی لە ١٩٠٨دوە ئیشی لە سەر کۆکردنەوەی تاکی تورك

بە هۆی تۆرانیەتەوە کردووە .وەك لە پێناسەکردنەکەی کریستال دەردەکەوێ زمانی تورکی تەنها زمانێکی تورك-ی دەگرێتەوە خۆی ، نەك هەموو زمانەکانی تورك ، بەڵام ناسیۆنالیستی سیکیولەری تورك لە ڕێگای تۆرانیەت و زمانی خۆر کاری لە سەر ئەوە کردووە زمان و نەتەوەی خۆی بە سەر کورد بسەپێنێت.تۆرانیەت ستراتیژیەك بوو ناسیۆنالیستی تورك لە ١٩٠٨ەوە تا هەڵوەشاندنەوەی تەیار و سیستەمی کۆمۆنیستی کاری لە سەر دەکرد بۆ کۆکردنەوەی تاکی تورك.نووسەرێکی وەك عەزیز نەسین لە سەر حاڵەتی تورکەکانی بولگاریا بە دەنگ هات.

## Tongue
## زبان

زبان ئەندامێکەری خولقێنەری دەنگە لە نێو دەمدا.هەموو ڤاوڵەکان لەگەڵ زۆربەی نابزوێنەکان قەرداری ئەو ئەندامەن .خوداش لە قورئاندا منەتی ئەوەی بە سەر بنیادەم دەکات کە زبان و دوو لێوی بەخشیوەتە مرۆڤ .ئەو دوو ئەندامە –زبان و لێو پێکهێنەری زۆربەی وشەی زمانن .هەروەها وەك کورد دەڵێت : زبان بەلای سەرە ، زبان سەرچاوەی ئافەتێکی مرۆیی ، کۆمەلایەتی ، سیاسین.

# Transformation
## ڕێزمانی گواستنەوە

ڕێزمانی گواستنەوە کە ناسراوە بە ڕێزمانی تی بریتییە لە زنجیرە هێمایەك کە ریزدەکرێن بە پێی دەستووری زمانەکە .ئەو گواستنەوەی ڕەگەزەکانی رستە ، بۆ نموونە لە رستەی پرسدا بە پێی ریسایەك مەیسەر دەبێت:

It is there___-----Is it there?

ڕێزمانی گوێزانەوە زیاتر بە ڕێزمانی چۆمسکی ناسراوە ، بە تایبەتی مۆدیلی یەکەم.

# Tree diagram
## هێڵکاری داری

قسە لە سەر پەیوەندیە ناوخۆکانی هێماکانی وشە دەکات، وەك پەیوەندی نێوان دایك ، خوشك ، کچ زیاتر ئەو هێڵکارییە لە ڕێزمانی بەهەمهێنان دەرکەوت،بیرۆکەکە بریتیە لە لقێکی دور ڕەهەندیی وەك هۆکارێك —ناوەندێك بەکاردەهێنری بۆ پیشاندانی پەیوەندی ناوەکی پێکهاتەی زنجیرەیی ڕەگەزەکانی رستە کە بە هۆی چەند یاسایەکی بەرهەمهێنان دروستدەبن.

## Turkic

### زمانی تورك ، زمانی توركی ، زمانی توركمانی

لە پێناسەكردنی ئەو تێرمانەی سەرەوە مەسەلەی نەتەوەیی تێكەڵ بە مەسەلەی زمان دەكرێت هەروەها هەردوو پایەی ڕاگرتنی زمانی توركی تۆرانیزم و زمانی خۆر لەو سێ تێرمە هەیە.

### زمانی تورك
### Turkic

زمانی تورك- وەك زمانی هیندۆئەورووپی و زمانی ئاری دایكە زمانێكە ژێدەری زمانی توركی و توركمانیە.دەیڤید كریستال (١٩٩٢، ل ٣٩٧) دەربارەی ئەو ژێدەرە زمانە دەنووسێت :" گروپە زمانێكە لە نێو ماڵباتە زمانی ئەتلەتیكی .بە پێی سەرژمێری ١٩٩٠ سەد ملیۆن خەڵك لە ئاسیای بچووك و باشووری ئاسیا قسەی پێدەكات . ئەو گروپە چەند زمانێك لە هەندێ دەڤەر لە خۆ دەگرێ ، لە باشووری رۆژئاوا ئەو زمانە لە خۆ دەگرێ : زمانی توركی ، ئازەربایجانی و زمانی توركمانی .لە باشووری رۆژهەلأت ئەو زمانانە دەگرێتەوە زمانی ئۆزبەگ ،زمانی ویغور ، وە لە باكووری رۆژئاوا زمانی تەتەر و زمانی كەزەخ و كیرغیز و زمانی باشكیر " ئەو زمانانە بە یەك ئەلفبا نووسینی پێكراوە ، بەلأم لە دوای كودەتای ئۆكتۆبەری ١٩١٧ ی ڕووسیا و كەمالیەكان لە توركیا ، زۆربەی

کۆمارە تورکیەکانی یەکێتی سۆڤیەت بووە ئەلفبای سلاڤی و لە تورکیاش لە ساڵی ١٩٢٩ بە رەسمی بووە ئەلفبای لاتینی.

گروپی ئیتحاد و تەرەقی لە ١٩٠٨ەوە ئیشی لە سەر کۆکردنەوەی تاکی تورك بە هۆی تۆرانیەتەوە کردووە .وەك لە پێناسەکردنەکەی کریستال دەردەکەوێ زمانی تورکی تەنها زمانێکی تورك-ی ، نەك هەموو زمانەکانی تورك ، بەڵام ناسیۆنالیستی سیکیولەری تورك لە رێگای تۆرانیەت و زمانی خۆر کاری لە سەر ئەوە کردووە زمان و نەتەوەی خۆی بە سەر کورد بسەپێنێت.

## زمانی تورکی
## Turkish language

زمانی تورکی —لەگەڵ عەلمانیەتی تورکی وەك زمانێکی نەتەوەیی لە تورکیای کەمالی دەرکەوت .بەر لە دروستبوونی بزاڤی ئیتحاد و تەرەقی و بزاڤی ئەتاتورك ، زمانی رەسمی دەوڵەتی عوسمانی زمانی عوسمانلی بوو .ئەو زمانەش بە ئەلفبای عەرەبی دەنووسرا ، بەڵام لە ١٩٢٩ پاش ئەوەی ئەتاتورك سیستەمی خەلافەی لە ١٩٢٤ هەڵوەشاندەوە هەروەها بە هێزی دەستور تورکیای کردە دەوڵەتی تورك و زمانی کوردی بە پێی یاسای ٨٨ دەستوری ١٩٢٧ یاساغ کرد.

دەیڤید کریستال لە هەمان سەرچاوەی پێشوو بە گوێرەی لۆژیکی ئەتاتورك ئەوها پێناسەی زمانی تورکی دەکات:" ئەو زمانە ئەندامە

زمانێکی سەرەکی ژێدەرەزمانی تورك-ە، کە ئەویش لە لای خۆیەوە ئەندامە لە ماڵباتە زمانی ئەلتیکی. بە گوێرەی سەرژمێری ساڵی ۱۹۹۰زمانی تورکی ئەو زمانەیە کە ٤٥ملیۆن تورکی لە تورکیا قسەی پێدەکات هەروەها ئەو زمانە بێجگە لە تورکیا لە هەندێ دەڤەری دەرەوەی تورکیا قسەی پێدەکرێ وەك

۱.تورکەکانی بولگاریا ،

۲. قبرسی تورکی کە لەوێ زمانی ڕەسمیە ،

۳.لە هەندێ وڵاتی ئەورووپی وەك زمانی کۆچەری "زمانی تورکی وەك زمانی ئینگلیزی و زمانی کوردی بە چەند قۆناغێك تێپەڕیوە،لەو بارەیەوە کریستاڵ ۱۹۹۲ ، ل ۳۹۷ دەنووسێت :" زمانی تورکی بە سێ قۆناغ تێپەڕیوە

۱. زمانی تورکی کۆن سەدەی ۱۳ -۱٥ زایینی ،

۲.تورکی ناوەند سەدەی ۱٦-۱۸ زایینی ،

۳. زمانی تورکی نوێ ".لە ڕوانگەوە نەتەوەوە دەتوانین ئەو سێ قۆناغە وا شرۆڤە بکەین :

۱. تورکی کۆن :دەرکەوتنی تورك لە ئەنادۆڵ،

۲. تورکی ناوەند : عوسمانیەتی ڕەسمی ،

٣.تورکی نویێ : تورکی تۆرانی و ئەتاتورك ، کەواتە تورکی ناسیۆنالیزمی سیکیولەری تورکی ١٩٢٩ هەتا هاتنی داد و گەشەپێدان.

## زمانی تورکمانی
## Turkmen

زمانی تورکمانی وەك کریستال لە سەرچاوەی سەرەوە لە بارەی دەنووسێت:" زمانی تورکمانی لقێکە لە گروپە زمانی تورك .ئەو زمانە بە پێی سەرژمێری ١٩٩٠ سێ ملیۆن ئاخێوەری هەیە بە شێوەیەکی لە تورکمانیا و بەشەکانی کازەخستان و ئۆزبکستان و ئیران و ئەفغانستان و پاکستان و عیراق و باشووری کوردستان ". ئەو زمانە پێشتر بە ئەلفبای عەرەبی دەنووسرا ، بەڵام دوای کودەتای ئۆکتۆبەر لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت بە ئەلفبای سلاڤی هەتا ١٩٩٠ دەنووسرا هەروەها تورکە قەومیەکان داوایان کرد کە وەك تورکەکانی تورکیا بە لاتینی بنووسن.

ئەو تورکمانانە لە ئازەربایجان بە ئازەری ناسراون ،بەڵام لە ئیران ناسراون بە عەجەم وە لە باشووری کوردستان بە تایبەتی لە شاری هەولێر هەتا ڕاپەرینی ١٩٩١ ناسرابوون بە هەولێریی ،بەڵام حیزبی قەومی تورکمان جارێکی تر بە تورکمان دەیانناسێنێت.بە حوکمی ئەوەی ئەو تورکمانانە لە ناو کۆمەڵگای کوردستانی دەژین ، بۆیە

هەردەم لە دامودەزگای هەرێم دووچاری دیاردەی زمان-گۆڕین دەبن . حکومەتی کوردی بە پێی پرۆژەی دەستوری کوردستان زمانی تورکمانی وەك زمانێکی رەسمی ناساندوە،بەلاّم قەومیەکانی ئەو زمانە ئامادە نین ئیعتراف بە دەسەلاتی کوردی و زاراوەی جیۆگرافی کوردستان بکەن .

**ڕەگەزی تۆرانی**

تورکەکانی تورکیا خۆیان بە تۆرانی دەدەنە قەلّەم . بانگاشەی تۆرانیبوون بەشێك لە ستراتیژیەتی تورکە قەومیەکانی ئیتحاد و تەرەقی پێکدەهێنا.

**تیۆری زمانی خۆر**

تیۆرێك بوو ئەتاتورك هێنایە ناو ئەدەبیاتی تورکی .بە پێی ئەو تیۆرە زمانی تورکی و رەگەزی تورکی براگەورەی هەموو زمانەکانی دنیایە چونکە هەموو لە زمانی تورکەوە سەرچاوەیان گرتووە هەروەها هەموو نەتەوەکان لە ڕەگەزی تورکیەوە پەیدابوون .کەواتە زمانی تورکی وەك خۆر وایە بۆ زمانەکانی تر.

## T/V forms

### فۆرمی تۆ و ئێوە

ئەو دوو فۆرمە فۆرمی کۆمەلآیەتی و سیاسین .تاکەکانی کۆمەڵگا لە هەندێ ڕەوشی زمانەوانیدا بە پێی تقووس و تێگەیشتنی چینەکان بەکاری دەهێنن( بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە فۆرمی ئێوە)

## Typology of language

### تایپۆلۆژی زمان

تایپۆلۆژی زمان خۆی لقێکە لە زمانەوانی.ئەو لقە زمانەوانییە توێژینەوە لە خالە لە یەکچووە ستراکتەری نێوان زمانەکان دەکات و بێگوێدانە فاکتەری مێژوو.تایپۆلۆژی بەراورد بەشێکە لە هەولێك بۆ دامەزراندنی پەیوەندی زمانی بە تایبەتی لەو دۆخانەی کە هیچ بەلگەیەکی مێژوویی نییە.بۆ جیاکردنەوەی زمانەکان لە یەکتر ، چەند ڕێگەیەك هەیە:

١. پێکهاتەی سینتاکسی
٢. پێکهاتەی مۆرفیمی

# پیتی U

## Uncountable noun
### ناوی نە ژمێردراو

ناوی نەژمێردراو لە هەموو زمانەکاندا وەك یەك نییە.لە زمانێکدا وشەی هەواڵ –خەبەر- وشەیەکی ژمێردراوە ، کەچی نیوز-هەواڵ-وشەیەکی نەژمێردراو.ناوە نەژمێردراوەکان بە زۆری پاشگری ئێس وەرناگرن. هەروەها کرداری ڕستەی ناوی نەژمێردراو تاکە کۆ نییە.

## United Arab Emirates
### ئیمارات

لە ئیماراتدا لە ساڵی ١٩٩٠ دا تەنیا یەك ملیۆن و نۆسەد و سێ هەزار کەس بوو .ئەو وڵاتە وڵاتێکی کەنداوییە ، زمانی رەسمی وڵات زمانی عەرەبییە.زیاتر لە ٢٠ زمانی کۆچبەر وەك هیندی ، بەلوچی ، بنگالی ، فارسی ، پشتۆیی.

## United kingdom
### مەملەکەتی یەکگرتوو

ئەو وڵاتە زیاتر لە شەست ملیۆن دەبێت .ئینگلیزی زمانی رەسمی وڵاتە.هەرچی لە وێلزدا وێلش و لە سکۆلاتندا گارلیکی سکۆتی زمانی

ڕەسمیە.لە ولاّتدا ١٠٠ زمانی کۆچبەری هەیە وەك هیندی ،ئۆردو ، چینی ، یۆنانی ، ئیتالی ، بەنگالی ، بینجابی ....

## United States of America
## ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

لە سەرژمێری ١٩٩٠دا ٢٥١کەس زیاتر بوو .ئینگلیزی بە ڕەسمی زمانێکی ڕەسمی نییە .ئینگلیزی ناسراوە کە زمانی یەکێتی ئەو ولاّتەیە . زمانی فەرەنسی کە ناسراوە بە کاژون پایەکی ڕەسمی هەیە لە لویزانیا ، کەچی لە ویلاّیەتی نیو مەکسیکۆ زمانی ئیسپانی زمانی ڕەسمی ویلاّیەتەکەیە.لە ئەمریکادا ١٦٠ زمان هەیە. زۆربەی زمانەکان بە ڕێژەی زۆر هەنە زمانی ئینگلیزی ٢٢٠ ملیۆن(بە پێی سەرژمێری ١٩٩٠)،ئیسپانی ١٧ ملیۆن ، ئیتالی نیو ملیۆن ، چینی و رووسی و فەرەنسی نزیکەی نیو ملیۆن،

## Universal
## یونیڤێرسەل

بیرۆکەی یونیڤێرسەل زیاتر زادەی بیرکردنەوەی چۆمسکیە لە زماندا.بانگەشە دەکرێ کە ئەدگاری یونیڤەرسەل ئەدگاری هەموو زمانەکانە.ڕێزمانی یونیڤێرسەل بەشێك لە دەرهاوێشتەی یونیڤێرسەلە ،ئەو ڕێزمانە هەوڵ دەدات فۆرمە مومکینەکانی ڕێزمانی مرۆڤ ئامێزی دنیا دیاربخات.جگە لە ڕێزمانی یونیڤێرسەل ، ئەو ڕێزمانانەش لە زماندا هەن :

١.یونیڤێرسەلی ستاتیستیکی-سەرژمێری

٢.یونیڤێرسەلی ئیمپلیکەشینی ، کە دەڵێت ئەگەر ئێکس لە زماندا هەبوو(دەرکەوت) ، ئەوا وای هەیە- نییە(دەردەکەویّ یان دەرناکەویّ)
٣.ئەبسولوت یونیڤێرسەل :ئەو ئەدگارانەی رەهان لە هەموو زمانێکدا هەن.
٤.یونیڤێرسەلی ڕیلەتیف.٥.یونیڤێرسەلی فۆرمی.

## Urdu

## ئۆردوو

زمانی ئوردو هەم زمانی نەتەوەیە ، هەم زمانی دینی هەم زمانی کێشوەریە.ئەو زمانە ئەندامە لە گروپی میدلاندی خێزانە زمانی هیندۆئاری-ە.ئەو زمانە زیاتر لە ٥٠ ملیۆن ئاخێوی هەیە لە پاکستان و هیندستان هەروەها لە بەریتانیا زمانی کۆچبەرانی پاکستان و هیندیەکانە.
لە پاکستاندا زمانی رەسمی وڵات و نەتەوەیە هەروەها لەویّ زمانی عەرەبی و فارسی هەن.لە هیندستاندا زمانی موسلمانەکانە.لە سەر ئاستی جیهانیشدا زمانی موسلمانانی کێشوەری هیندیە.

## Uzbek and Uzbekistan

## ئۆزبەك و ئۆزبەکستان

زمانی ئۆزبەك ئەندامە لە لقی تورك-ی خێزانە زمانی ئەتلەسی.ئۆزبەك زیاتر لە ١٧ ملیۆن ئاخێوی هەیە.ئەو زمانە لە ئۆزبەکستانی کۆماری سۆڤیەتی پێشوو زمانی رەسمیە.ئەو نەتەوەیە لە ئۆزبەکستان و تورکمستان و تاجیکستان وکازاخستان و ئەفغاستان و بەشێك لە چین هەن.

هەرچی ئۆزبەکستانە پێشتر کۆمارێك بوو لە سۆڤیەتی پێشوو.بە پێی سەرژمێری ۱۹۹۰ ڕێژەی دانیشتوانی ئۆزبەکستان ۱۹ ملیۆن و ۹۰۵ هەزار کەس بووە.ئەو وڵاتە وڵاتێکی فرەنەتەوەیە ، نەتەوەکان لەو وڵاتە بەو جۆرە بوو:

-٦٥٪ ئۆزبەکی،

١٢٪ رووسی،

١٠٪ی نەتەوەی هەڵگری زمانی تر.

## پیتی V

### Valency
### بەستنەوە

ژمارە و جۆری بۆندەکان کە ڕەگەزەکانی سیناتیکی لەوانەیە لەگەڵ یەکتر بسازێن.ڕێزمانی ڤالێنسی ئەو ڕێزمانەیە کە ڕەگەزە بنەڕەتیەکانی ڕستەی تێدایە وەك کردار هەروەها ژمارەیەك لە ڕەگەزی لاوەکی —ناسەربەخۆ وەك تەواوکەر و ئارگومێنت کە ژمارە و جۆریان لە لایەن کردارە بڕیاری لە سەر دەدرێت.کردار هەیە تەنیا بکەر وەردەگرێت هەیە بەرکار وەردەگرێت هەیە هیچیان وەرناگرێت.دەکرێ هەموو ئەو دیاردانە بە ژمارە ۱,۲,۳، گوزارشتی لێبکرێت.

### Variety
### شێوە

شێوە وەك ئەلتەرناتیڤێکە بۆ پۆلێنی زمان و زار ، چونکە ئەو پۆلێنە زیاتر سیاسیە لەوەی زمانەوانی بێت.لەلایەکی دی وشەی ڤەرایەتی لە زماندا واتای زمانی فەرمی و قانوونی و زانستی و ستاندەر دەگەیەنێت.ئەو پۆلێنە سیاسیەی زمان-دایەلێکت ، زمان بەرز دەکاتەوە و دایەلێکت بچووك دەکاتەوە ، بەلاّم وشەی شێوە ئەو ململانێیە دروست ناکات.زمان خۆی وەك

بوونێکی ئەزەلی وایە ، بەلاّم دایەلێکت لە ئەنجامی جوگرافیای و فاکتەری سیاسی و کۆمەلاّیەتی دروستدەبێت. بێگومان خودی مرۆڤە بریار لە سەر چارەنووسی زمانەکە دەدات، بۆ نموونە لە ئەورووپا لە بەرامبەر هەیبەت و دەسەلاّتی دینی و سیاسی و ئەدەبی لاتینیدا ، ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی ڤێرناکولەرێکی ناوچەیی بوون .بە هۆی رێنیسانس و ناسیۆنالیزم ئەو نەتەوانە گرینگیان بە زمانی نەتەوەیی خۆیاندا لە ئەنجامدا زمانی ناوچەیی خۆیان بووە زمانی رەسمی ولاّت و زمانی ستاندەری پەروەردە و زمانی لاتینیش لە کۆمەلّگادا مرد.کەواتە پرۆسەی مردنی زمان پەیوەستە بە بەکارهێنانی مرۆڤ بەو زمانەوە.

## Vatican city
## شاری ڤاتیکان

بە پێی سەرژمێری سالّی ١٩٩٠ دانیشتوانەکەی بە ١٠٠٠ کەس تەخمین دەکرا.زمانی فەرمی ئەو شارە بچووکە ئیتالی بوو.ئەو کیانە کیانێکی کاسۆلیکی مەسیحیە ، لەو ولاّتە لاتینی پایەکی رەسمی هەیە هەر ئەو زمانەش زمانی رەسمی کەنیسەی کاسۆلیکی رۆمانیە.

## Velar
## ڤیلار

دەنگی ڤیلار ئەو دەنگانەن کە بە هۆی سەری پشتەوەی زبان دژ بە مەلاشوو دروستدەبێت هەروەها دیاردەی ڤیلار هەر ئافراندنێکی لاوەکی

دەگەیەنێت بە جوولانی زبان بەرەو مەلاشوو لەو جۆرە ئافراندنە دەنگیە ، دەنگێکی قوولّ یان تاریك دروستدەبێت

## Verb
## کردار

کردار لە زمانێکی وەك زمانی ئینگلیزی و هەروەها کوردی زۆر گرینگە، بە جۆرێك دەتوانین بلّێین پێکهێنەری ڕستەیە لە ڕستەی کرداری ، چونکە لەو جۆرە زمانە بەبێ هەبوونی کردار رستە دروست نابێت ، بەلاّم لە زمانی عەرەبی مەرجی هەبوونی کردار ئەوەندە گرینگ نییە ، چونکە ڕستەی ناویی هەیە.کردار بە شێکی گرینگی بەشەکانی ئاخاوتنە هەروەها بەشێکی بنەڕەتی ڕستەی کوردی و ئینگلیزیە.لە زماندا گرێ ی کرداری ، کرداری سەرەکی ، نیمچە کردار....هەیە.

## Verbless clause
## کلۆزی بێ کردار

لەو جۆرە کلۆزەدا کردار هەروەها بکەرەکەی سڕاونەتەوە وەك
ئەگەر ئامادەبووی ، زەنگم بۆ لێبدە.
ئەگەر ژیای ، دەبیە پاشای ولاّت.

## Vernacular

### زمانی رەمەکی -ناوچەیی

ڤێرناکولەر زمانی هاولاّتی یان زمانی ئاخاوتنی کۆمەڵگایە. زمانی پچین زۆر جار بە زمانی پەیوەندی دادەنرێت.ئەو زمانە لە زمانەوانیدا پایەکی وەك زمانی ستاندەری نییە زیاتر زمانی دایکە ، مادەرزادەیە.

## Verner's law

### یاسای ڤێرنەر

کارل ڤێرنەر ١٨٤٦-١٨٩٦ ئەو زمانەوانەیە کە لە سەر یاسای رێزماننووسی لاو گریم رەخنەی نووسی .گۆڕانی دەنگی لای ئەو زمانەوانە دانمارکیە ئەوەیە ستریس-شەددە لە سەر بڕگەی کۆنسۆنەنت واتای کۆنسنۆنەنتەکە دەگۆڕێت .ئەمەی لە دیراسەکردنی یاسای گریم بۆ دەرکەوت .یاسای گریم لە زمانی سانسکریتدا کاتی ستریس -هێز دەکەوێتە سەر برگەی رەگ لە وشەی سانسکریتی دروستە،بەلاّم کە شەددە دەکەوێتە سەر برگەیەکی تر ، ئەوا نەبزوێنەکان بە شێوەیەکی جیاواز رەفتار دەکەن،کەواتە دەنگی پلۆسیڤی کپ وەك دەنگی فریکەتیڤی کپ نامێنن، بەڵکو دەبنە پلۆسیڤی دەنگدار .

## V-forms
### شێوازی ئێوە

لە زۆر زماندا دیاردەی سیستەمی تۆ-ئێوە هەیە .لە زمانی کوردی و فەرەنسی ئەو دوو شێوەیە لە ڕووی فۆرمەوە جیاوازن.ئەو دوو وشەیە لە رووی واتاوەش لە یەکتر جودان:

-تۆ :کە گوێگر بێت،

ئێوە : کە گوێگر بێت.

ئەو دوو حاڵەتە دیکتاتۆر دروستدەکەن.

تۆ: گوێگری قسەکەری ئێوە، بۆ بچووکردنی تۆیە وەك گوێگر.

کەواتە سیستەمی تۆ-ئێوە گوزارشت لە چینایەتی لە زمان دەکات:

-ئێوە پادشای وڵاتن !

-تۆی کرمانج هەر ئەوەندە مافت هەیە کە گوێڕایەڵ بی!

-ئێوەی ئاغا

-تۆی سەپان!

## Vibrato
### ڤیبراتۆ

بەرزی و نزمی قیرە و قەبارەی دەنگێکی بچووك و تیژ و کۆنترۆڵکراو بە زۆری ئەو دەنگە تەنیا لە گۆرانی دەبیسترا.ڤیبرۆتۆ گەرمی و چڕی بە دەنگ دەبەخشی.

## Vocabulary

### دانەوشە

سێتێك لە وشەی لێكسیكی زمان دەگەیەنێت ، ئەو دانە وشەیانە پێی دەوترێت لێكسیكۆن .زمان نییە بێوەری بێت بە لێكسكۆن ، بەڵكو خودی ڕستە لە چەند كەرەستەیەكی بنەڕەتی پێكدێت ، لەوانە وەك كردار ، ناو كە پێكهێنەری ڕستەن.

## Vocal folds or vocal cords or v. lips

### گوریسی دەنگیی

دوو پشتێنەی تیشووی ماسولكە لە قورگ-گەروودا لەرە لەر دەكات بە وەڵامی بۆڕی هەوا ، ئەو لەرەلەرە كپ و دەنگدار جیادەكاتەوە.

## Vocal organs

### ئەندامە دەنگیەكان

ئەو پێكهاتە فیزیۆلۆجیانەن كە چالاكانە دەوریان هەیە لە پرۆسەی قسەكردندا .بۆ سێ گروپ و سیستەم دابەشدەكرێن:

١.سیستەمی هەناسە :سیەكان و تراچیا ،

٢.سیستەمی سوپرالارینجین:زبان، لێو ، شەویلاك

٣.سیستەمی لووتی :لووت

## Vocal tract

### ڤۆکەل تراکت

بریتیە لە تەواوی هەوای دالآن سەرەوەی قورگ هەروەها شێوەی هەردووك کاریگەری لە سەر جۆری دەنگەکانی ئاخاوتن دەکەن ، ئەو ناوچەیە بۆ دوو ناوچەی لووتی و زاریی دابەشدەبێت.

## Voicing

### دەنگ –دەنگیی

بریتییە لە لەرەی ژێیە دەنگیەکان لە وەلآمی بۆری هەوا کە بە نێو ژێیەکان ڕەتدەبێت.ئەو دەنگانەی ژێیەکان بەکاردەهێنن و لەرە لەر دروستدەکەن ، پێیاندەوترێ ژێدار-دەنگدار ئەوانەی ژێیەکان بەکارناهێنن و لەرەلەر دروستناکەن پێیاندەگوترێ بێدەنگ-کپ .

ئەو دیاردەیە وشەی داك لە تاك ، سالّ لە زالّ جیادەکاتەوە.

## Vowel

### ڤاول -بزوێن

ژمارەی ڤاول ژمارەی برگە دیاریدەکات .بزوێن سێ جۆری هەیە تاکە بزوێن ، جووتە بزوێن ، سێبزوێنی .لە فونێتیکس دیاردەی هەبوونی ڤاول لە زماندا شتێکی حەتمیە.ئەو دەنگە ژێدارە ناسراوە بە دەنگی ئاخاوتن هەروەها لە فۆنۆلۆژیدا یەکەی سیستەمی ناوکی برگە دەگرێت .

## Vowel shift

### گۆڕانی بزوێنیی

بریتیە لە زنجیرە گۆڕانکاریەك لە بەهای ڤاول لە مێژووی زماندا.ناسراوترین نموونەی گۆرانی ڤاولی لە مێژووی گۆرانی ڤاولی ئینگلیزی لە ساڵی ١٤٠٠ ڕوویدا،کاتێك شەش ڤاولە درێژەکەی ئینگلیزی دەستیانکرد بە گۆرانی بەهایەکەیان بە شێوازێکی سیستیماتیکی .ئەو گۆڕانکاریە دەنگیەش قەرداری جیفری چۆسەری باوکی زمانی ئینگلیزین.بەلاّم ئەو گۆڕانکاریانە ئەوە لە بیر ناکەن کە زمان ملکەچی یاساکانی گۆرانی زمانن ، بۆیە هەندێ لەو وشانە (وشە نوێیانە ) لەگەڵ وشە کۆنەکان بوونەتە وشەی جیا.

## پیتی W

## Weak form

### فۆرمی لاواز

لە ڕستەدا دوو جۆری وشە هەن : وشەی سەرەکی وەك ناو و کردار و ئاوەڵکردار و ئاوەڵناو بە زۆری فۆرمی بەهێزن هەرچی جۆری دووەمە وشەی لاوەکین ، پاشگر ، پریپۆزیشن و پەیوەندی...بوونی ئەو دوو جۆرە وشەیە پێدڤین ، چونکە بە هەبوونی ئەو دوو جۆرە وشەیە سکانی دێرە شیعرەکە دەکەن بۆ ئەوەی کێشی شیعرەکە بکات.کەواتە وشەی

Play+ed

هەردوو جۆری فۆرمەکە دەخەنە ڕوو .پاشگری ڕابردوو فۆڕمی لاوازە و خودی وشەکە فۆڕمی بەهێزە.

## Well-formed sentence

### ڕستەی دروست

ڕستەی دروست بەشێکە لە ئەدگاری ڕێزمانیبوون ، بەواتای ئەوکاتە ڕێزمانیبوون مەیسەر دەبێت کە ڕستەی دروست هەبوو.ڕستەی دروست و ساخلەم پابەندی یاسایی زمانی زمانەکە دەبێت ، بۆ نموونە :

_ لە زمانی عەرەبیدا دیاردەی ڕێککەوتن لە لای زۆربەی ڕەگەزەکانی ڕستە هەیە

-وردة جميلة
كانت امنة طالبة زكية
کەچی زمانی کوردی و ئینگلیزی کە لە زۆر بواردا دیاردەی سێکسی زمانەوانیان تێدا غائیبە ڕێککەوتن لە نێو زۆربەی ڕەگەزەکانی ڕستە نییە.

## Wernicke's aphasia
### ئەفاسیای وێرنیکا

ئەو جۆرە نەخۆشیە زمانەوانیە لە ئەنجامی وروشانی ناوچەی وێرنیکایە،کە دەکەوتە بەشی سەرەوەی مێشك .ئەو بەشە کار لە پرۆسەی بیستنی نەخۆش دەکات ، ئەمەش لە بیستنی بەرکەوتوو ڕەنگدەداتەوە.

## Whorf
### ۆرف

زانایەکی بواری زمانەوانی بوو هەروەها قوتابیەکی چالاکی ساپیری زانا بوو .گریمانی بنیامین لی ۆرف لە گریمانی ساپیر-ۆرف بە درێژی قسەی لە سەر دەکرێت.

## Word
### وشە

لە ڕێزمانی تەقلیدیدا وشە بچووکترین یەکە بوو لە ڕستەدا،بەڵام لە ڕێزمانی بنیاتگەریدا جەخت لە سەر ئەوە دەکرێت کە وشە بچووکترین یەکە نییە لە ڕستەدا ، بەڵکو مۆرفیم لە وشە بچووکترە.وشە بۆ وشەبوون چەند مەرجێکی زمانەوانی هەیە:

.هەر وشەیەك مانا و فۆرمی هەبێت وشەیە-

-. هەر وشەیەك لە نێوان زنجیرە وشەكانی دی وەستان قەبوڵ بكات وشەیە.

هەر وشەیەك گۆكردنی هەبێت ، وشەیە......

وشە جۆری هەیە:

وشەی سادە ،

وشەی دارێژراو ،

وشەی لێكدراو

وشەی ئیدیۆمی،

وشەی پێكهاتور لە لێكسیكەل سترەكچە.ئەوەی كۆتایی جیاوازی بنەڕەتی لەگەڵ وشەی لێكدراو هەیە ، بەوەی وشەی لێكددراو یەكەیەكی سەربەخۆیە و شرۆڤەكردن هەڵناگرێت وەك لێكسیكەلی سترەكچەر.

## Word blindness

### -كوێری وشە

كوێری وشە پەیوەندی بە نێوان مێشك و زمانەوە هەیە .ئەو دیاردەیە بە دیسلێكسیا. لە چەند حاڵەتێكەوە بوونی هەیە:

-تێرمی دیسلێكسیا بەكاردێت بۆ لە دەستدانی توانای خوێندنەوە پاش ورروشاندنی مێشك،

-دژواریەكانی بەردەم زارۆك بۆ فێربوونی خوێندنەوە، لە پاش ئامادەنەبوونی مێشك ،

-زەحەمەتی لە خوێندنەوە.

## Word class
### پۆڵە وشە

کۆمەڵە وشەیەکە کە هەمان ئەدگاری سینتاکسی و مۆرفۆلۆژیان هەیە.لە بواری سونەتکاریدا پێیاندەگوترا بەشەکانی ئاخاوتن.بە حوکمی ئەوەی ئەو پۆڵە وشەیە لە بواری فۆڕمەوە قسەیان لە سەر دەکرێت ، بۆیە پێیاندەوترێت چینە فۆڕم یان پۆڵە فۆڕم ، کە بریتین لە ناو ، کدار . ئاوەڵناو ، ئاوەڵکار،ئامرازی ناسین و نەناسین ، ئامازە..............

## Word formation
### ڕۆنانی وشە

وشە ڕۆنان پرۆسەیەکی مۆرفۆلۆجیە. ئەو ڕۆنانە چەمکێکی سیمانتیکیش دەبەخشێت بە واتای لەو داڕژتنە واتاش دەوری خۆی دەبێت .زۆر ڕێگا لە زۆر زمانان هەیە بۆ دروستکردنی وشە لە زماندا .ژمارەیەکی زۆر لەو وشانە جێی خۆیان دەگرن لە نێو کۆمەڵگادا وە هەندێکی تر کە لەو ڕێگایانە دروستدەکرێن یان هەر لە بەرابی بە مردوویی لە دایك دەبن یان لەگەڵ گۆڕانی کۆمەڵ و کەلتوری کۆمەڵگا ون دەبن.

## Word game
### گەمەی وشە

خودی پرۆسەکە بریتیە لە فۆڕمی هەر گەمەیەك، مەتەڵێك ، ڕکابەریەك کە تێیاندا لایەنێکی زمان بنەمایەك دەبەخشێت بۆ بەرەنگاری .گەمەی وشە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا بوونی هەیە . ئەو دیاردەیە بۆ ئەوەیە، کە

هەندێ واتای شاراوەی نێو زاکیرەی وەرگر زیندوو بکاتەوە.نالی گەورە شاعیری کورد لەو بارە دەستێکی بالآی هەبووە.

## Word order

### ڕیزبوونی وشە

پرۆسەکە قسە لە سەر ڕیزبوونی ڕەگەزەکانی ڕستەدا دەکات.ئەو ڕیزبوونە زیاتر لایەنی سینتاکسی زمانەکە دەردەخات .هەر بەو ڕێگایەش زمانێك لە زمانێکی تر جیادەکاتەوە.

ڕیزبوونی ئاوەڵناو کە بەشێکە لە ڕیزبوونی وشە .ئەو دیاردەیەیە پابەندی چەند یاسایەکی زمانەوانی و واتاسازی هەتا پراگماتیکیە.

## Writing system

### سیستەمی نووسین

پرۆسەی نووسین لە دوای ئاخاوتن دێت. ئاخاوتن لەوانەیە بوونێکی بایۆلۆژی بێت هەرچی سیستەمی نووسینە پرۆسەیەکی مرۆڤکردەیە.توانای مرۆڤ بۆ قسەکردن گریمان دەکرێت دەیان هەزار ساڵ بەر لە ئێستا بێت هەرچی سیستەمی نووسینە تەنها پێنج هەزار ساڵێك پێش ئێستایە.ئاخاوتن یان توانای قسەکردن لە سەر پێویستی مرۆڤ دامەزراوە و پەیوەندی بە هەبوونی قوتابخانە نییە ، هەرچی سیستەمی نووسینە لە کتێبە پیرۆزە ئاسمانیەکان و قوتابخانەکان سەرچاوەی گرتووە.وەك گوتمان سیستەمی نووسین بەرهەمی عەقڵی مرۆڤە هەرچی ئاخاوتنە بوونێکی بایۆلۆژی مێشکی مرۆڤە و زادەی ئامێری وەرگرتنی زمانە...

جۆرەکانی سیستەمی نووسین

سێ جۆری سەرەکی سیستەمی نووسین هەیە:

١. هێما.هەر مۆرفیمێکی زمان بە هێما گوزارشتی لێکراوە.

٢. ئایدیالۆجی . هەرچەندە ئەو سیستەمە بەکارهێنەری لە سیستەمی یەکەم کەمترە .

٣. ئەلفبێی.

پیتی X

## X-bar Theory

## تیۆری ئێکس بار

پاش بە دەستنەهێنانی ئامانجی موتڵەق و یەکلاکەرەوە لە پێکهاتەی سینتاکتیکی و تیۆری ستاندەر و دەسەلات ، چۆمسکی بیری لەوە کردەوە کە بە چاوی تیۆری ئێکس بار لە زمان بڕوانێت .

تیۆری ئێکس بار سیستەمێکە لە شرۆڤەکردنی زمانەوانیی بەرهەمهێنان . ئەو سیستەمە وەك ئەلتەرناتیڤێك بۆ شیکردنەوەی تەقلیدی پێکهاتەی فرێزی و کاتیگۆری لێکسیکی پەرەی پێدرا . لەو بۆچوونە یاساکانی ڕێزمانی پێکهاتەی فرێزی زۆر سنووردارە وە کاتیگۆری فرێزی دی دەناسێنێت .بە شێوەیەکی تایبەت لە نێو فرێزی ناویدا کاتیگۆری ناوەندی کە گەورەترن لە ناو و بچووکترن لە فرێز .هەر ئاستێك لە فراوانکردنی فرێزیی پێی دەگوترێت تیۆری ئێکس بار.ڕوونتر ، ناوی نێو فرێزی ناوی وەك ئاوەڵناوی ناو فرێزی ئاوەڵناوی و کرداری نێو فرێزی کاری وایە.

## x-interrogative

## پرسیاری ئێکس

ئەو جۆرە پرسیارکردنە وەك ئەلتەرناتیڤێك بۆ پرسیاری زانیاری پێشنیازکراوە.هەربۆیە بەم دوایە کەم و زۆر لە نووسینی زمانەوانی وەك پرسیاری ئێکس دەردەکەوێت

## پیتی Y

## Yeman

## یەمەن

یەمەن یەکێ لەو ولاَتانەی نیشتیمانی عەرەبیە ،کە خاوەن کۆمەلَگایەکی چەندزمانیە.دانیشتوانی یەمەن بە پێی سەرژمێری ۱۹۹۰ زیاتر لە یازدە ملیۆن و نیو کەسە.لە سەدا نۆوەدی خەلَکەکەی بە زمانی عەرەبی دەدوێت و لە سەدا دە کەی تر بە زمانی هیندی ، سۆمالی ، ئینگلیزی دەدوێن .ئینگلیزی زیاتر توێژەکانی دەسەلاَت و رۆشنبیرەکان لە مەبەست و پرسە نێودەولەتیەکاندا بەکاردێت .

## Yes no Question

## پرسیاری بەلَێ و نەخێر

لەم جۆرە پرسیارەدا ، وەلاَم هیچ زانیاریەك هەلَناگرێت ، تەنیا بە بەلَێ یان نەء وەلاَم دەدرێتەوە.

وەك تۆ ناوت ئازادە؟بەلَێ

یان تۆ مامۆستای ؟ نەخێر

لە هزر و ئەندێشە لەوانە وەلاَمەکە نێگەتیڤ یان پۆزەتیڤ نەبێت ، بەلاَم لە دەربڕیندا بە بەلَێ یان نەخێر وەلاَم دەدرێتەوە.

# Yiddish

##ییدیش

زمانی ییدی زمانێکە ، کە دوو سەد هەزارو بیست و سێ ساڵ ساڵ بەر لە ساڵی ٢٠١٣ کەسانی نێو سەنتەر و رۆژهەلاتی ئەورووپا و ئەمریکا و ئسرائیل وەك زمانی یەکەم بەکاریاندەهێنا وە زیاتر لە دوو ملیۆن کەس وەك زمانی دووەم بەکاریان دەهێنا.ئەو زمانە بە زمانی رۆژئاوای گێرمەنی بەناوبانگە.

# پیتی Z

## Zero anaphora
## زیرۆ ئەنافۆر

بوونی ڕاناوی دووەم وەك یەکەم ، هەندێ جار زیرۆ ئەنافۆر یان هەر لێڵی دروست دەکات .ئەگەر ڕاناوی دووەم لە ڕستەدا پەیوەندی جینیتیکی بە ڕاناوی یەکەم نەبوو ، ئەوا لەو حاڵەتە هیچ جۆرە پەیوەندیەکی دوو سەرە دروست نابێت ، وەك

-ئازاد وتی ئەو نایەت.

ئەو " ئەو"ە کەسێکی ترە ،کەواتە هیچ ئەنافۆرێك دروست نابێت.

## Zoosemantics
## واتاسازی ئاژەڵ

ئەو دیراسەیە بەشێکە لە هێماسازی .ئەو زاراوەیە لە شەستەکانی سەدەی بیستەم بە سەرەوە هاتە ناو زمانەوانی .ئەو دیراسەیە قسە لە سەر سیستەمی زمانی ئاژەڵان دەکات.ئەو بابەتە پەروی پێدرا بۆ ئەوەی وەك توێژینەوەیەکی بەراوردکاری خۆی بنوێنێت لە نێوان زمانی مرۆڤ و زمانی ئاژەڵ .

## ژێدەر

ئەم فەرهەنگە وشەی لە زۆر سەرچاوەی ئینگلیزی وەرگرتووە ، بە لاّم بە شێوەیەکی سەرەکی لە سەر ئەم سێ سەرچاوەی خوارەوە ، دامەزراوە :


1. David , C.1992. An Encyclopedic Dictionary of language & languages,Cambridge :Blackwell publishers

2. Horsey ,R.1975. 101 key Ideas, USA

3. Matthews,PH.2007.Oxford concise Dictionary of Linguistics.oxford



فەرهـەنگی زمانـەوانی نـاوخۆش فەرهەنگێکی بچووکە ، بەڵام بە پێی زانیـاری مـن، یەکـەم فەرهـەنگی زمانـەوانی ئینگلیـزی -کوردیـە لـە باشووری کوردستان نووسرا بێت، کە جەخت لە سەر هەندێ میتۆد و بۆچـوون و تیـۆر و زمانـەوانی و کەسـی زمانـەوانی دنیـای رۆژئـاوا دەکـات، کـە ئـەو زانیاریانـە لـە نووسینی کوردی تاڕادەیەك نوێن.

ئـەم فەرهەنگـە لەگـەڵ فەرهـەنگی یاسـایی ئۆکسـفۆرد لـە ڕووی مەعریفـەی زمانـەوانی و یاسـایی بەشـداری دەکـەن لـە بنیاتنـانی مـەعریفی وەرگـری کـوردی .ئـەو بنیاتنانـە مەعریفیـەی تـاکی کـورد دوا ئامانجی نووسەرە ، چونکە هـەر ئـەوە دەسـپێکی هەنگاوێکـە بـۆ دامەزرانـدنی دامودەزگـا و عـەقڵی مەعریفی لە دەوڵەتی کوردیدا

جمعه صدیق کاکە